


# تەفسیری زمناكۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناكۆیی












محمد یوسف رحمون

# تەفسیری زمناكۆیی

بەقەڵـەمی

مەلا سعیدی زمناكۆیی

جزمی ﴿٢٠،٢١،٢٢،٢٣﴾

بەرگی دەهــەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی بیستەم و بیستو یەکەم و  بیستو دوهەم و بیستو سێهەم .
بەرگی دەهەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیۆتەر و ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بسم الله الرحمن الرحیم

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان. سوپاسی بێ پایان بۆ پەروەردگاری هەمو بونەوەران. درودی خوای مەزن لەسەر پێشوای زانست و زانیاری پێغەمبەری خواو لەسەر یارو یاوەران پەیڕەوانی بێ.

قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی هەندێ لە پێغەمبەرەکان و شتێکی کرد پەی وەندی بەوانەوە هەبو لە نیشانە رونەکان و کارە پەك خەرەکان فەرمانی داوە بە پێغەمبەری بەرێزی خۆی.

﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَامٌ عَلَى عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَى ﴾ تۆ بلّـێ: هـەمو سـوپاس و سـتایش بـۆ خوایە لـەسەر ئەو هەمو شتانەی بەخشیویە بـە بونـەوەران لــە چـەندین شـتی جـۆراو جـۆر بـۆ رابوردنیان و لـەبەر ژیانیان لـە جیهانداو، تۆ بلّێ بەو بەندانــەی خـوا ئـەو کەسـانەی ئـەوتۆیان خوای مەزن هەڵیبژاردن بــۆ پێغەمبەرایـەتی و بـۆ دۆسـتایەتی خـۆی سـلاّوی خـوای مـەزن و ئاشتییتان لـەسەربێ، چونکە ئـەو کەسـانە تۆشـی ئـازاری زۆر بـوون لـەسـەر موسـلمانان ئـەو شتانەیان بەکار هێناوە.

بۆ زانین: ئەو ڕستەیە فێرمان ئەکا لـە سـەرەتای نوسـین و گفتوگـۆ و خوتبـەدا نـاوی خوای مەزن و سوپاس بۆ خواو درود لـەسەر پێغەمبەرو پیاو چاکان ببێژرێ. زۆر ئاشکرایە هەر لـە کاتی پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ هەتا ئێستا موسـڵمانان ئەو شتانەیان بەکارهێناوە.

﴿ آللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ بەبت پەرستانی قورەیش بلّێ: ئایا خوایە کە ئێوەی دروست کردوەو ئەم هەموە چاکانەتان ئەداتێ چاکترە یاشتێ ئەوان ئەیکەن بە هاوبەش بـۆ خـوای مەزن لـەو بتانە خاوەنی سودو زیان نـین بـۆ خۆیـان نـەبۆ جگـەی خۆیـان، ئیـتر چۆنیـان ئەپەرستن؟. مەبەسـت لـەم پرسـیارانەی دوایـی سەرزەنشـتی کردنـە بـۆ بـت پەرسـتان، وولاّمەکانیان جگە لـەسەر شۆڕکردن هیچ شتێ تر نابێ.

﴿ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاء مَاء ﴾ ئایا کەسێ چاکترە ئاسمانـەکان و زەوی دروست کردوە بەو پەیڕەو پرۆگرامـە سـەر سوڕێنەرانەوە و ناردویتیـە خـوارەوە لـە ئاسمانەوە ئاو بۆ سودی ئێوە یا ئەو بتانەی دروست کراوی دەستی خۆتانن و بێگیانن؟

﴿ فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا ﴾ دوایی ئێمە بەهۆی ئـەو ئـاوە ئەڕوێنن چەندین بێستان و چیمەنێ خاوەنی جوانی و دڵخۆشین و پڕن لــە درەخـت و گـوڵ و ڕووەکی جۆراو جۆر، شایستە نیە بۆ ئێوە کە بتوانن سەوز بکەن درختـی ئـەو بێسـتانانە و ئـەو گوڵ و وگوڵزارەی چیمەنانە. بێگومان ئەو ئـاوە بـەهۆی توانـای خـوای مەزنـەوە و گـەرمایی دروست ئەبێ هەڵم پەیدا ئەبێ لـە دەریا و زەریاکان و بەرزئەبێتەوە بۆ ئاسمان و ئەبێ بەهەورێکی چڕوپڕو ئەبێ بە باران و ئەڕژێنە سەر زەوی.

﴿ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴾ ئایا هەیە لـەگـەڵ خـوای مـەزندا خوایـە ترشیایستەی پەرستبێ بەڕاستی ئێوەی بت پەرست ڕێگەی راست وەرناگرن بەڵکو ئێوە تاقمێکن لاتـان داوە لـە ڕێگەی راست و هاوتاو هاوێنە دائەنێن بۆ خوای مەزن.

﴿ أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا ﴾ ئایا چ کەسێکە زەویی بـە خـڕی دروسـت کردوە و گەڕانویەتی‌بە جێگەی دانیشتنی ئێوە لـەسەری دروستی کردوە لـە نێو زەویدا چــەندین روبارێ ئێوە و خۆتان و ئاژەڵتان سودیان لێ وەرئەگرن و شار گوندەکانی خۆتــان بـەرەو پێـش کەوتن ئەبەن.

﴿ وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ﴾ وە خوای مەزن دروستی کردوە بۆ زەوی چەندین کێوبی وەستاو نایەڵن زەویی بسورێتەوە بجولێ و ئێوە نەمێنن یاتوشی ئـازاربن ودایناوە لە زەویدا چەندین کانگا بۆ ئەوەی ئێوە بەکاریان بهێنن لە سودی خۆتانا، دروستی کـردوە لـە نێوان ئەو دوو ڕووباردا پەردەیە هەتا بێکەڵاوی یەکتری نەبن و زیان بە ئێوە بگەیـەنن. بـەهۆی میهرەبانی خوای مەزنەوە ئاوی شیرینی لە جێگەی بەرزەکاندا دروست کردوە هــەتا بەتـەواوی سود لە سروشتی تایبەتی هەردوولایان وەربگرن.

﴿ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئایا هەیە لەگەڵ خوای مەزندا بەو هەموو توانایـیـەوە خوایێ تر شایستەی پەرستنێ؟ بەڕاستی ئەو بت پەرستانە بیر لە چاك وخــراپ و بـەتواناو لاواز ناکەنەوە.

بەڵکو زۆر تر لەوان بەدەسەڵات و یەکێتی خوای مەزن نازانن و خۆیانیان لە ســودی ئـەقڵ بەکارهێنان ڕوت کردوە تەوەو نازانن بە پوچی بت پەرستی خۆیان.

﴿ أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَـاهُ وَيَكْشِـفُ السُّـوءَ ﴾ ئایـا چ کەسێکەو وولامـی ستەم لێ کراوێکی بێچارە بداتەوە کاتی لــەو ئەپاڕابێتــەوە وە پێویستـەکەی جێبـەجێ کردبـێ خراپـە و ئازاری ئەو لابەرێ وترس و بیمەکەی؟ نەیەڵێ؟

﴿ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاء الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّـرُونَ ﴾ وەئێـوە بێگـرێ بـە جێگـەداری زەویی چین لە دوای چین و ئاوەدانی بکەنەوە ڕامی بکەن و بەکاری بهێنن بــۆ ســود و خۆشـی خۆتان، ئایا لەگەڵ خوای مەزندا هەیە لەگەڵ ئەو هەموو چاکەکردنـەدا لـەگـەڵ ئێـوە کـردوە خوایە تر شایانی پەرستنبێ؟ بەڵام ئێوە کەمێ بیر ئەکەنەوە، بەو جۆرە نیـە ئێـوە بـاوەڕ بـهێنن و ناگەنە ئەوەی باوەڕبهێنن.

﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَـدَيْ رَحْمَتِهِ ﴾ ئایـا چ کەسێکە شارەزایی ئێوە بکا بۆ لای ڕاستی لەناو تاریکیەکانی دەشت و دەریادا و بتـان گەیـەنێ بۆ لای مەبەستی خۆتان بە ئەستێرەکان و نیشانەی دیاری کراو منارەو ئامێری چاودێری کــردن و دەرزی موگناتیسەوە، هەتا بتوانن دەریای تـاریك و دەشـتی چـۆل بـبڕن ئەگەرنیشـانەدیاری کراویان نەبوو چ کەس با ڕەوانە ئەکا هەتا هەور کۆبکاتەوەو باران بباریێ موژدەدەر بێ ئەو بایە بەر لەبارینی باران کە میهرەبانی خوای مەزنە بۆ سودی ئادەمیزاد.

﴿ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ تَعَالَى اللَّهُ عَمَّا يُشْـرِكُونَ ﴾ ئایـا هەیـە لـەگــەڵ خــوای مـەزندا لـەگـەڵ ئـەو میهرەبانیەدا خوایێ تر شایانی پەرستنبێ، خوای مەزن باڵا تر و پاکترە لەشتێ بێ باوەڕان ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خوای مەزن.

﴿ أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالْأَرْضِ ﴾ ئایا چ کەسێکە یەکەم جـار ئادەمیزاد و بونەوەرانی دروست کــردوە لـەنەبونــەوە هێناونیـە بونـەوە لـەپاشـا ئـەیان مرێنـێ و

زیندویان ئەکاتەوە دوای مردن ئەیان گێڕتەوە بۆ پرسیارو پاداشت وە چ کەسێکە ئێوە بــە خێـو بکاو خواردەمەنیتان بداتێ لـە ئاسمانەوە بەهۆی بارینی بارانــەو یەکـەم جـارو لـەزەویدا بەهاتنـە دەرەوە رووەك و پەیدابونی دانەوێڵە دوو هەمجار.

﴿ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ ئایا هەیە لـەگــەڵ خـوای مـەزندا بـەو دەسەڵاتە گەورەیەوە هەیەتی خوایێ تر شایانی پەرستنبێ؟ بەڕاستی ئەو ئایەتانەی پێشو دەسەڵات و میهرەبانی خوای مەزنیان دەرخست کە توانای تایبەتی و میهرەبانی گشتی هەر بۆ ئەو خوایە پەو کەسی تر ناتوانێ ئەو کارانەی پێشو ساختە بهێنێ. ئەوانە هەمویان بەڵگەن لـەسـەر یـەکێتی خوای مەزن و کە هەر ئەویش بەتەنها شایانی پەرستنە، تـۆ بـەوان بڵـێ: ئەگـەر ئێـوە ڕاست ئەکەنخوا هاوبەش و منالی هەیە ئێوە بەڵێن و بەڵگەی خۆتان بهێنن لەسەر ڕاسـتی خۆتـان. بـە کورتی خوای مەزن ئەو هەمو بەڵگە بێگومانانەی هێنایەوە لـەسەر بونی خۆی و یەکێتی خۆی بە جۆرێکی ڕون و ئاشکرا، دوایی بابێ باوەڕان و بت پەرستان تاکە بەڵگـە بهێننـەوە لـەسـەر بێ باوەڕی و ڕاستی بت پەرستن.

قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ ۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا ۖ بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ

رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ ﴿٧٥﴾

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴾ تـۆ بڵـێ بەو بت پەرستانە کاتێ پرسیار لە تۆ ئەکەن چ کاتێ ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ: هیـچ کەسـێ لـە ئاسمانەکان و لەزەویدا لە ئادەمیزادو لە جنۆکە و لەفریشتە نازانێ بەشتێ دیـار نیـە و پەنهانـە مەگەر هەرخوای مەزن ئەیزانی، ڕۆژی دوایش لە نهێنیەکانەو ئەوان هەسـت ناکـەن چ کاتـێ زیندو ئەکرێنەوە بۆ وەرگرتنی پرسیار و پاداشت لە خزمەت کەسێکا دیاری و نادیاری ئەزانێ.

﴿ بَلِ ادَّارَكَ عِلْمُهُمْ فِي الْآخِرَةِ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴾ تـۆ بڵـێ بـەبێ باوەڕشان بەڕاستی هۆی زانینی ئەوان بەهاتنی ڕۆژی دوایی یـەك لـە دوای هـاتوە بـە بەڵگـەی تەواو لەسەر زیندوبونەوەو قورئانی پیرۆزو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باسی بەڵگـەی زۆریـان کـردوە بـۆ بیباوەڕان لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوان باوەڕیان نەهێنا. بەڵکو ئەوان لەبارەی هاتنی ڕۆژی دوایی لە گوماندان، ئیتر چۆن پرسیاری کاتی هاتنی ئەکەن و ئەوان باوەڕیان پێی‌نیـە. بەڕاسـتی ئەوان لەگەڵ تەواوی زانینیان بە ڕۆژی دوایی‌کوێرن و دڵیان قوفڵ دراوەو ڕێگەی ڕاستیان وون کردوە.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَئِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴾ وە کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێناوە ئەڵێن: ئایا کاتێ ئێمە مردین و بوین بە خاك و بـاوك و باپـیری ئێمـە مـردوون و بـون بەخاك ئایا ئێمە بە زیندویی لە گۆرەکانمان ئەهێنرێنەوە دەرەوە؟ ئەو شتە ناچێتە ئەقڵەوە.

﴿ لَقَدْ وُعِدْنَا هَذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴾ بەڕاستی ئـەو گفتوگۆیـە لەبارەی هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە لەمەوبەر بەڵێن بـە ئێمـەو باوباپیرمـان دراوە، ئـەو بەڵێنە هیچ شتێ نیە مەگەر پڕوپۆچی ڕابوردووانەو لە درۆکانی موحەمەد وراست نیە.

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴾ تۆبە بێ باوەڕان بڵێ بڕۆن و بگەڕێن بەزەویدا، نیشانەی لەناوبردن و سزای تاوانباران ببینن، دوایی تەماشا بکەن، دوا ڕۆژی کاری ئەوان چۆن بوە.

﴿ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴾ وە تۆ خەفەت مـەخۆ لەسـەر بـاوەڕ نەهێنانی تاوانباران بەردۆخستنەوەی تۆوە نۆ لەدڵ تەنگی و خەفەتا مەبە لەبارەی شـتێکەوە بـێ باوەڕان پیلانی بۆ ساختە ئەهێنن، ئەیانەوێ تۆ لە ناوبن. خوای مەزن تـۆ ئـەپارێزی لـە پیلانـی خراپی ئەوان.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ وەبت پەرستان ئەڵێن: چ کاتێ پـەیدا ئـەبێ ئەو بەڵێنەی ئێوە بۆ ڕۆژی دوایی ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لە هاتنی ئەو ڕۆژەدا.

﴿ قُلْ عَسَى أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ تۆ بڵێ بـەبێ بـاوەڕان: بەراسـتی شایستەیە بەم نزیکە کە توشی ئێوە بێ و بگا بە ئێوە لە جیهاندا هەندێ لەو سـزایانەی ئـەوتۆ باوەڕتان بەبونی نیە لە ڕۆژی دواییدا. دوایی ئەوە بو توشی ئەوا نیو لە ڕۆژی بەدردا کوشـتن و دیل کردن و هەڵهاتنیان لە جەنگدا، خوای مەزن تاقمێکی کەمی سەرخست بەسـەر تـاقمێکی زۆر لە بت پەرستان.

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴾ وە بەراستی پەروەردگاری تۆ خاوەنی بەزەیی و گەورەیی و میهرەبانیە بەسەر ئادەمیزادەوە، یەکێ لەوانە ئەوەیە سزادانیان دوا ئەخا لەسەر ئەو هەمو بێ فەرمانیەی خوای مەزن هەتا بیر بکەنـەوە و پەشیمان ببنـەوە بـەڵام زۆرتر لەوان سوپاسی پەروەدگاری خۆیان ناکەن.

﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ وەبەراسـتی پـەروەردگاری تـۆ بەشـتێ ئەزانێ بت پەرستان پەنهانیاندا وە لە دڵیانا لە پیلان گێڕان و خراپە کردن لەگەڵ تـۆو ئـەزانێ بەشتێ دەری ئەخەن لە ئازاردان بەدرۆخستنەوەی تۆ، خوای مەزن بـەبێ گومـان تـۆ لـەیان لێ ئەسێنێ.

﴿ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾ وە هیچ شتێ نیـە شـارابێتەوەو لـە ئێوەو دیار نەبێ.

لە ئاسمان و لەزەویدا مەگەر ئەو شتە تۆمار کراوە لەناو نامەیەکی ئاشکرای نامەی کرداری ئادەمیزاد، لە ڕۆژی دواییدا پیشانی ئێوە ئەدرێ هەتا بە گوێرەی کـرداری خۆیـان پاداشـت و تۆڵە وەرگرن.

إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا

وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَـٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾

﴿ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ بەراستی ئەو قورئانەی ئەوتۆ بت پەرستان بە درۆی ئەخەنەوە بەڵگە ونامەیەکی راستن لای خوای مەزن و هاتوەتە خوارەوەبۆ پیاوێکی نەخوێندەوارە ئەیخوێنێتەوە بەسەر بەنوئیسرائلیەکانا و ڕوی راستی بۆ ئەوان رون ئەکاتەوە لەبارەی شتێکەوە کە ئەوان و گاورەکان دژی یەکترین لە وشتەدا لەبارەی عیساوە گاورەکان لە سنوری خوای مەزن دەرچوون و عیسا ئەکەن بە کوڕی خوا، جوەکان لە ریزی عیسا کەم ئەکەنەوە، قورئانی پیرۆز رونی ئەکاتەوە وە زۆر شتی ئەوتۆ ئەوان ناکۆکیان هەیە بە کوری خوا، قورئان رانمویان ئەکا بۆ لای رێگەی بەختیاری و چاکە.

﴿ وَإِنَّهُ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە بەڕاستی قورئان شارەزایی کەرو بەخشش و چاکەی خوای مەزنە بۆ باوەڕداران هەر ئەوان سودی لێ وەرئەگرن و ڕێگەی راست وەرئەگرن، هەر ئەوان بە فەرمودەی قورئان کار ئەکەن.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴾ بەڕاستی ئەو پەروەردگاری ئەوتۆی بۆ تۆی رەوانەکردوە بۆ سەرتۆ، خوایەکی ئەوتۆیە بەفەرمان ئەدا بەراستی و بەداد پەروەری لە نێوان بەنوئیسرائیلیەکانا لەبارەی ئەو شتەی گۆڕیوانە لە تەوراتو ئینجلدا و لە شتێکا دژی یەکترین و، خوای مەزن بەدەستەلاتەو ڕێگە ناگیرێ لە فەرمانیدا، ئەزانی بەراستی ئەو شتەی فەرمانی پێئەدا.

﴿ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴾ دوایی تۆ پشت ببەستە لەسەر یاریدەی خوای مەزن بۆ گەیاندنی فەرمودەی خوای مەزن، پشت بەستن بە خوای مەزن قلایەکی پارێزراوە. بەراستی تۆ لەسەر راستی ئاشکرای کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، هەر کەسێ لەسەر راستی بێ نایەبێ گوێ بداتە شتێ ئەو ئەیێژرێ.

﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى ﴾ بەراستی تۆ ناتوانی گفتوگۆی راستی بەو کەسانەی مردوون، ئەو بێ باوەڕانە هەرچەندە بە ڕواڵەت زیندون. بەڵام دڵیان مردووە ئاورێ بۆ لای باوەڕهێنان

نادەنەوە، تۆ ئەو پەڕی هەوڵ بدەی لـەگەڵیان گفتوگۆی تۆ نابیسن ســودی لێ وەرنـاگرن، وەك مردووان.

﴿ وَلا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاء إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴾ وە تۆ ناتوانی ئاوازو دەنگــی خـۆت ببیسـێنی بەو کەسانەی کەڕن کاتێ پشــت بکەنـە تـۆو بـەرەودوا بـڕۆن و نەیانـەوێ راسـتی ببیسـن و باوەڕبهێنن. کەواتە تۆ پشت هەربەخوا ببەستە.

﴿ وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَن ضَلالَتِهِمْ ﴾ وە تــۆ نـاتوانی شـارەزایی کەسـێ بکـەی راسـتی وەرگرێ و لای دەی لـە گومڕایــی خۆیـان، چونکـە ئـەو کەسـانە هەرچـەندە خـاوەنی چـاوو گوێچکەو دڵبن، راستی نابیسن و نای بینن و بیری لێناکەنەوە، وەك کەرو کوێر نەزان وان.

﴿إِن تُسْمِعُ إِلا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾ تۆ راســتی بـەهیچ کەسـێ نابیسـێنی مەگـەر بەکەسێ باوەڕبهێنێ بە گفتوگۆی ئێمە لـە قورئانی پیرۆزدا، دوایی ئەوان موسـوڵمان بـبن و مـل کەچی فەرمودە خوای مەزن بن بە نیازی پاکەوە وەری بگرن.

﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّـنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُـهُمْ أَنَّ النَّـاسَ كَـانُوا بِآيَاتِنَـا لَـا يُوقِنُونَ﴾ وە هەر کاتێ نزیك بۆیە وە پیویست کرا لـەسەر بێ باوەڕان فەرمودەی خوای مـەزن بۆ سزادانیان ئێمە دەرئەهێنن هەمو ئادەمیزاد بە زیندویی لــەناو زەویـدا ئـەرۆن و ئـەجوڵێن بـە وێنەی شــتێ بـڕواو بجوڵــێ، دوایـی ئـادەمیزادە باوەڕدارەکـان گفتوگـۆ ئەکـەن لـەگـەڵ ئـەو بێباوەڕانەی ئەوتۆ بڕوا بەئایەتیکانی خوای مەزن ناهێنن کە گفتوگۆ بەهاتنی رۆژی دوا ئەکەن و ئاماژەی بۆ ئەکەن، دوایی خۆیان بە خۆیان ئەڵێن: بەراستی ئــەو نیشـانانەی ئـەوتۆی خـوای مەزن فەرموی ئێوە باوەڕتان پێ نەئەهێنان پەیدا بون، دوایی ئێمە لـە گۆڕەکانمـان هاتینـە دەرەوە ئەوەی بەڵێنمان پێ درابوو لـە زیندوبونەوە دەستان کەوت.

زۆربەی زۆری ئادەمیزاد مانای ئەو ئایەتەیان بەم جۆرە کردوە: (وەهەر کاتێ پێویســت بـوو سزای خوای مەزن لـەسەر بێ باوەڕان، ئەو شتەی بەڵێنی پێدرا بو بەوان لـە زیندوبونەوە، ئێمـە دەرئەهێنین بۆیان لـەزەویدا شتێ ئەڕوابەسەر زەویدا پێــی ئـەوترێ جەساسـە گفتوگـۆ ئـەکا لـە گەڵیان و ئەڵێ: بەراستی ئادەمیزاد باوەڕیان بە هاتنــە دەرەوەی مـن نەئـەهێنا کـە یـەکێکم لـە نیشانەکانی خوای مەزنی ئێمە).

بۆ درێژەدان بەمەبەست لە (دابـە) چ شـتێکە ئادەمیزادیانـە، لــە چ جێگـەیـە دێتـە دەرەوە: بەراستی هەندێ لە زانایان لـەمانا کردنی ئەو ئایەتــەدا بـیرو بـاوەڕی جیاوازیـان هەیـە: هەیانـە ئەڵێن: بەراستی زەوی شەق ئەباو شتێ دێتە دەرەوە نیشانەی ئەندامی زۆر گیــاندارانی تێدایـە: سەری وەك سەری گایە، چاوی وەك چاوی باراز وایە، گوێچکەی وەك گوێچکەی فیـل وایـە، شاخی وەك شاخی نێرەی بزنە کێوی وایە. ملی وەك ملی حوشتر وایە. سنگی وەك سنگی شـێر وایە. رەنگی وەك رەنگی پڵنگ وایە، کەلـەکـەی وەك کەلەکـەی پشـیلە وایـە، کلکـی وەك کلکی بەران وایە، چوار پێی وەك چوارپێی هوشتر وایە. نێوانی هەمو جومکەکانی لـە جمکەکانی

تریا دووازدەگەزە، ئەو بیرو بۆچونە بروای پێ ناگرێ نەبەهۆی ئەقڵەوە وە نەبەهۆی فەرمودەی خواو پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ هەر چەندە ئێمە بڕوامـان وایـە زیندوکردنـەوەی ئـادەمیزادی مـردو کەبوە بە خاك زۆر گەورەتر لـە دروست کردنی ئەو دابەیە.

بەراستی پرسیار کرا لـە عەلی کوڕی ئەبو تالیب: لـەمەبەست بەمانای (دابە) فەرموی بـەڵێ: سـوێندم بـە خـوای مـەزن ئـەودا بـە یـەکلکی نیـە؟ و بەڕاسـتی ڕیشـی هەیـە زانـای بـەناو بانگ(ماوەردی) ئەفەرموێ: ئەو فەرمودە عەلیە ئاماژەیە بۆ لای ئەوە کە ئەو دابەیە؟ ئادەمیزادە. خاوەنی نامەی (لسان العرب) ئەڵێ: دابە بۆ ئادەمیزادی خاوەن ئەقڵ بۆ گیـاندارانی بـێ ئـەقل بەکار ئەهێنرێ کەواتە مەبەست لـەوەدا بەهەر جگەی ئادەمیزاد بـێ ڕاسـت نیـە، هـەندێ لـە زانایان ئەڵێن: لـە کەعبەدا ئەو دابەیە دێتـە دەرەوە. ئەوانـە و زۆر شـتی تریـش لـەبارەی دابـە نوئەرزەوە؟ باسکراوە، بەڕاستی هەمو شتێ هەر لای خوای مەزنە.

﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّـةٍ فَوْجًـا مِّمَّـن يُكَـذِّبُ بِآيَاتِنَـا فَـهُمْ يُوزَعُـونَ ﴾ وە تـۆ بـیری ئـەو کاتەبکەرەوە باسی بکە بۆ دانیشتوان ئێمە کۆ ئەکەینەوە و زیندو ئەکەینەوە لـە هـەمو نەتەوەیـە کۆمەڵێکی زۆر لـەو کەسانەی باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە ناهێنن، دوایی ئەوان پاڵیان پێوە ئەنرێ و لێیان ئەخورێ هەتا هەمویان ئەگەن بە یەکتری لـە جێگـەی وەسـتانی پرسـیاردا بـۆ وەرگرتنـی پاداشت.

﴿ حَتَّى إِذَا جَاؤُوا قَالَ أَكَذَّبْتُم بِآيَاتِي ﴾ هەتا کاتی ئەو بێ باوەڕانە ئەچنە لای جێگەی پرسیار و وولاّم. خوای مەزن بەهەڕەشەوە ئەفەرموێ: ئایا ئێوە بۆ بە درۆتان خستەوە ئایەتەکانی نامەی من کە بۆتان رون کرابوەوۆ کـە ئێـوە توشـی ئـەم ڕۆژە ئـەبن؟ بـۆ ئێـوە وولاّمـی پێغەمبـەرتان نەدایەوە؟.

﴿ وَلَمْ تُحِيطُوا بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وە ئێوەی بێ باوەڕیەکەم جـار تەماشـای ئـەو ئایەتانەتان نەکردبو بەجۆرە تەماشا کردنێ نەگەڕان بە دوای مەبەست لـەناوەڕۆکی ئەو ئایەتانەو بیرتان لـە شتێ نەکردەوە ئێمە ناردبومانە خوارەوە؟.

وەك ئەوەوابون کە ئێوە بـۆ بێبـاوەری وبـێ فـەرمانی خـوای مـەزن دروسـت کرابـن، روتـان وەرنەگێرابۆ لای شارەزاییو باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی.

﴿ وَوَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴾ وە فەرمودەی خوای مەزن بەسزادانێ بـێ باوەڕان پێویستکرا بە هۆی شتێ ستەمیان کرد بو بەو شتەو هاوبەشیان بۆ خوای مـەزن دانـابو، دوایی بێ باوەڕان گفتو گۆ بۆ هیچ بیانو هێنانەوەیە ناکەن و بەئازاری خۆیانەوە خەریکن.

أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي

ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلۡجِبَالَ تَحۡسَبُهَا جَامِدَةٗ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

﴿ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾ ئایـا ئـادەمیزاد نـەیان زانیـوە ئێمـە شەومان دروست کردوە لـەبەر ئەوان پشوی تێدا بدەن و ماندوبونی ڕۆژیان لابچێ و، ڕۆژمـان دروست کردوە لـەبەر ئەوەی ئادەمیزاد ڕێگـەی تێـدا بدۆزنـەوەو هـاتو چـۆی تێـدا بکـەن بـۆ پەیداکردنی هۆی ژیانی خۆیان.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لـە دروست کردنـی شـەو ڕۆژ بـۆ ئـەو مەبەستانە چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ تاقمی باوەڕبهێنن بە تواناو یەکێتی خواو سود لـە دروست کردنی شەو ڕۆژ وەرگرن.

﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ وَكُـلٌّ أَتَـوْهُ دَاخِرِينَ﴾ وە تۆ باسی ئەو ڕۆژە بکە فو ئەکرێ بەسوردا بۆ ئەوەی ئادەمیزاد زینـدو ببنـەوە بـۆ پرسیارو بۆ جاری دووهەم گیان ئەگرێتەوە بەبەریانا، بەدەنگی ئەو کەڕنایـە ئـادەمیزاد بـا وریـا

ئەبنەوە و خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ فەرمانی خوای مەزن، دوای ئەوەی فوکرا بە سوردا کەسێ لە ئاسمانەکان و زەویدان لەسەختی ئەو رۆژە ئەترسن مەگەر کەسێ ناترسێ خوای مەزن ئارەزو بکا نەترسێ، وێنەی پێغەمبەران و راست وێژان و شەهیدان و پیاو چاکان، ئەوانە ناترسن و رویان گەشە، هەمو کەسێ لە ئادەمیزاد ئەچن بۆ خزمەت خوای مەزن بە مل کەچی و بچوکیەوە با بۆئەوەی پاشە رۆژیان دیاری بکرێ، یا بچن بۆ لای بەهەشت یا بۆ لای دۆزەخ.

زانایان لە هەندێ لەنامەکانی خۆیانا ئەلێن: سێ جار فو ئەکرێ بەسوردا: جارێ بۆ ترساندنی ئادەمیزاد، جارێ بۆ مردنی هەمو گیانداران. جارێ تر بۆ زیندوبوناوەیان. ئەوەی راستی بێ چونیەتی سور نەزانراوە. بەلام پێویستە ئێمە بڕوای تەواومان هەبێ ئەوسورە هەیە، ئیتر بە هەر شێوەیەبێ گرنگ نیە.

﴿ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ ﴾ وە تۆ کێوەکان ئەبینی گومان ئەبەیتە ئەو کێوانە وەستاون و ناجولێنن لە جێگەی خۆیاناو، لە راستیدا ئەو کێوانەی زەویی بە تیژی ئەڕۆن بە وێنە ڕۆیشتنی هەور لە ئاسمانا،ڕۆیشتنی ئەو کێوانە ئەگۆڕێ لەئاستی خۆرەوە. یانێ کێوەکان بەزەویەوە دوو جولەیان هەیە:

جولانێکی زەویی بە دەوری خۆیاو لەبەردەم خۆردا بە وبۆتەوە شەوو رۆژ پەیدا ئەبێ، جولانێکی تری زەوی بەدەوری خۆردا چوار وەرزەی سال پەیدا ئەکا. ئەو جۆرە زانیاریە قورئان باسی کردوە بەر لە (١٤٢١) سال لەمەوبەر. زۆربەی زۆری زانایان مانای ئەو رستانەیان بەم جۆر کردوە: یانێ(تۆ لە رۆژی دواییدا کێوەکان ئەبینی وەستاون، ئەوان ئەڕۆن بە ئاسمانا بە وێنەی ڕۆیشتنی هەور لە تیژی و خێرایدا خوای مەزن ئەو کێوانە لە جێگەی خۆیان هەڵئەکەنێ ئەڕۆن بەئاسمانا بەلام وا ئەکەوێتە مێشکی بینەرەکانیان وەستاون چونکە شتێکی گەورە هەرکاتێ لەیەك لاوە بە هێلێکی تەنها ڕۆیشت چاو جولەکەی نابینێ لەبەر گەورەیی و دوری لایەنەکەی، بەتایبەتی بینەرەکەی دوربێ لەو شتەوە) بەهەر جۆرێ مانای ئەو رستانە کرابێ.

﴿ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ ئێوەبە چاکی تەماشای کاری خوایەکی تەنها و خاوەن توانای ئەوتۆ بکەن هەمو شتێکی بە چاکی و زانستەوە دروست کردوە، توانای ئەو خوایە دەرکەوتوە لەوشتانە دروست کردوە ئێوە وا ئەزانن وەستاوە کەچی ئەروا وەستاو نیە، بەراستی خوای مەزن ئاگادارە بەشتێ ئێوە ئەیکەن بەئاشکرا و بەنهێنی، پاداشتی هەموشتێ ئەداتەوە بە گوێرەی خۆی.

﴿ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ ﴾ کاتێ زانرا خوای مەزن ئاگاداری کردەوەی بەندەکانی خۆیەتی، دوایی هەر کەسێ لە جیهاندا کاری چاکی کردبێ بەو کارە چاکە هاتبێ لە رۆژی دواییدا، دوایی بۆ ئەو کەسە یە چاکتر لەو چاکەیە بەدووچەندانە پاداشتی ئەدرێتەوە ئەوان لەو رۆژەدا ئاسودەن و ناترسن لە ترسی ئەو رۆژەو لە ئاگری دۆزەخ.

﴿ وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وە هەر کەسێ کاری خراپی کردبێ لە جیهاندا و بەوکارەوە هاتبێ بۆ لای رۆژی دوایی، سەربەرەو

خوار فڕە ئەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ، بەوان ئەبێژرێ: بەراستی پاداشـتی ئێـوە نادرێتـەوە وە بـە هیچ شتێ مەگەر بەشتێ ئێوە ئەیکەن لـە بـت پەرسـتی و بێبـاوەڕی سـتەمتان لێنـاکرێ ومـافی خۆتان وەرئەگرن.

﴿ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَذِهِ الْبَلْدَةِ الَّذِي حَرَّمَهَا ﴾ بەراستی مـن فـەرمانم پـێ دراوە کـە پەروەردگاری ئەم شارەی مەکە بپەرستم ئەو پەروەردگارەی ئەوتۆ ڕێزی ئـەم شـارەی گرتـوە بەوەی قەدەغەی گرتوە درەختەکانی نەبرێ نێچیرەکانی ڕاونەگرێن، خوێنی تێدا نـەڕژێ و بـت پەرستی تێدا نەکرێ و ستەمی تێدا نەکرێ سنور و فەرمانەکانی خوای مەزن و پێویستی سەرشان بە هەمو ئادەمیزاد رابگەیەنم.

﴿ وَلَهُ كُلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ وەبـۆ پـەروەردگار،سـەرەرای ئەوانـە باسکران هەمو شتێ لـە دروست کردنیان و بە خێو کردنیان و بەرێوەبردنیان بەبێ ئـەوەی هیـچ کەسێ هاوبەشی بکا، من فەرمانم پێ دراوە موسڵمان ومـل کـەچی خـوای مـەزنیم، بـە نیـازی پاکەوە باوەڕی پێ بهێنم هەر لـەبەر خۆی بە تەنها.

﴿ وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ﴾ وە مـن فـەرمانم بـێ دراوە کـە بـە بەردەوامی قورئان بخوێنم و ناوەڕۆکەکەی رابگەیەنم بە ئادەمیزاد و جنۆکە بە نیـازی پـاك و بـە ڕاستیەوە، دوایی هەر کەسێ ڕانموییی وەرگری و دوای ناوەڕۆکی قورئان بکەوێ و خوا بەیـەك دانێ و هەر ئەو بپەرستێ، دوایـی بەراسـتی ئـەو کەسـە ڕانمویـی هـەر بـۆ خـۆی وەرگرتـوەو سودەکەی هەر بۆ خۆیەتی نەك بۆ کەسی تر.

﴿ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴾وە هەر کەسێ لـە ڕێگـەی راسـت لابـدا بـی روی وەرگێرابێ لـە فەرموودەی خوای مەزن زیانەکەی هەر لـەسەر خۆیەتی، دوایی تۆ بڵێ: بەراسـتی من هەر لـەو کەسانەم ئادەمیزاد بترسێنن لـە سزای پاشە ڕۆژ، من هەر ئەوەم لـەسەرە پەیامی خـوا بە ئێوە ڕابگەیەنم.

﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا ﴾ وەتۆ بڵێ هەمو سوپاس وستایشی هەر بۆ خوای هەمو بونەوەرانە. لـەمەودوا خوای مەزن نیشانە رون و ئاشکراکانی خۆی نیشانی ئێوە ئـەدا لـە زیندوبونەوە و پرسیارو وولام و ڕۆژی دوایـی بەهەشـت و دۆزەخ. دوایـی ئێـوە ئـەو نیشـانانە ئەزانن کە لـەجیهاندا باوەڕتان پێ نەئەهێنان بەڵام لـە کاتێکا ناسینەکانیان هیچ سـودێ بـە ئێـوە نابەخشێ و باوەڕهێنان بەوان سودی لێ وەرناگیرێ.

﴿ومابك بغافل عما تعلمون﴾ وە پەروەردگاری تۆ بێ ئاگا نیـە لـەشـتێ ئێـوە ئەیکـەن لـە جیهاندا. کەواتە ئێوە گومان مەبەن مۆڵەتدانی ئێوە و سزای دوواخستوون لـەبەرئەوە بێ ئاگـای لـە ئێوە نیە.

**بە یاریدەی خوای مەزن کۆتایی پێ هات لە ڕۆژی دووشەمە (١١)ی مانگی سەفەر ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی بەرانبەر - (٢٠٠٠/٥/١٥)ی زایینی.**

# ﴿ سورەتی ئەلقەسەس ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٥٢-٥٣-٥٤-٥٥) لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە. هەندێ تریان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٨٥) لە (ئەلجوحفە) هاتووەتە خوارەوە کە جێگەیەکە لە نێوان مەکەو مەدینەدا. ژمارە ئایەتەکانی (٨٨) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿طسم﴾ بۆ مانای ئەم پیتانە تەماشای سەرەتای سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تربکە کە وێنەی ئەو پیتانەی تێدایە.

﴿ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴾ ئەو پیتانە ئەم سورەتەی لێ پێك هاتووە ئایەتەکانی نامەیەکن بۆ ئادەمیزادی ڕوون ئەکاتەوە چاك و خراپ لەیەکتری و پێویستی ڕۆژانەیان لە هەردوو جیهاندا و لە سنوور و دەستووری ئایینی ئیسلام.

﴿ نَتْلُوا عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَى وَفِرْعَوْنَ بِالْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ ئێمە ئەخوێنینەوە بەهۆی قورئانەوە هەندێ لەو هەواڵەی پەیوەندی بە موسا و فیرعەونەوە هەیە بەڕاستی بەسەر تۆدا بۆ تاقمی ئێمە دیاریمان کردووە لە زانیاری پێشووی خۆماندا کە بە ڕاستی باوەڕ ئەهێنن بەتۆ.

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ ﴾ بەڕاستی فیرعەون یاخی بوبو لەناو زەوی میسردا، لە ستەم کردن و خۆ بەگەورە دانان و دڵڕەقیدا لە سنوور دەرچووبو، دانیشتووانی میسری ئەڕووتانەوە و ئەیکردن بەبەندەی خۆی و، دانیشتووانی زەوی میسری گێڕابوو بە چەند تاقمێ لەگەڵ هەریەکەیاندا مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ ئەکردن، هەریەکەیانپیشەیەکی تایبەتی پێ سپاردبوون و هەریەکەیانی لە دژی یەکتری هان ئەدا هەتا یەك نەگرن بەخۆیانەوە خەریکبن و بیر لە ستەمی فیرعەون نەکەنەوە، وێنەی ستەمکارانی ئێستا کە یاسای (فرق تسد) بەکارئەهێنن ( یانی تۆ جیاوازی بخەرە ناو دانیشتووانەوە تۆ ئەبی بەگەورەیان).

﴿ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴾ فیرعەون تاقمێ لەو تاقمانەی لاواز و بێ دەسەڵات کردبوو کوڕەکانیانی سەرئەبڕی و ژنەکانیانی بە زیندوویی ئەهێشتەوە. بە ڕاستی فیرعەون لەو کەسانە بوو خراپەیان بڵاوئەکردەوە لە زەویدا، قیبتییەکانی لەخۆی نزیك ئەکردەوە، بەنو ئیسرائیلییەکانی ئازار ئەدا بەوان. بێژراوە هۆی ئەو ستەمکارییە ئەوە بوو: فیرعەون لە خەودا بینی کە ئاگرێ لە بەیتولموقەدەسەوە ڕووی کردە خانووەکانی میسر هەموو قبتییەکانی سوتاند، پۆشەو وێژەکانی بانگ کرد و پرسیاری مانای ئەو خەوەی لێ کردن، ووتیان: پیاوێك لە بنچینەدا دانیشتووی بەیتولموقەدەس بووە لەسەر دەستی ئەو گەلی میسر لەناو ئەچن، فیرعەون ترساو وای دانا ئەو پیاوە لە بەنو ئیسرائیلییەکانە؛ چونکە ئەوان لەوێوە هاتوون، دوایی فەرمانیدا هەموو کوڕێك کە لە دایك ئەبی لە هەر پیاوێکی بەنو ئیسرائیلی سەریبڕن و واز لە ژنەکانیان بهێنن بە ئومێدی ئەوە ئەو گەلە بنەبڕبن، فەرمانی دا بە قیبتییەکان کاری نارەوایان لەگەڵدا بکەن و بەکاریان بهێنن لە پیشەی بێنرخدا، ئەوانیش ئەوەی پێیان کرا کردیان، بێگومان ئەو کارانەش لە سنوور لادانن.

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴾ وە ئێمە ویستمان کە ئێمە ڕێزو چاکە برێژین بەسەر کەسانێکی ئەوتۆدا ئەچەوسێنرانەوە ئەیانکردن بەبەندە و لاوازیان ئەکردن لە زەوی میسردا و ڕزگاریان بکەین و بیانکەین بە پێشەوای ئادەمیزادی ئەو سەردەمە و چاولێکراویانبن و بیانگێڕین بە خاوەنی سامانی فیرعەون و میراتگری پاشایەتی و دەسەڵاتی فیرعەون.

﴿ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ ﴾ وە ئێمە ئەو کەسە لاوازکراوانە لە زەوی میسردا دائەنێن و زەوی میسر داگیربکەن و ببن بە خاوەنی

توانا لەو جێگەیەدا ئەچەوسێنرانەوە، پلەوپایەی وایان پێ ئەبەخشین زەوی میسر ئاوەدان بکەنەوە و ببیەن بەڕێوە و کەس نەتوانێ ئازاریان بدا و، ئێمە نیشانی فیرعەونی بدەین کە خۆی کردبوو بە خواو نیشانی هامانی بدەین کە شالیاری فیرعەون بوو یارمەتی ئەدا لە هەر شتێکا بیویستایە نیشانی یاریدەدەرانی ئەوان لە لەشکرەکانیان بدەین شتێ ئەوان لێی ئەترسان کە لە ناوچوونیان بوو بەگشتی لەسەردەستی منالێکی بچووك پەیدا ئەبێ لە ناوبەنو ئیسرائیلیەکاندا.

بۆ زانین: ئەبێ بزانین خوای گەورە جەنگ ناکا لەگەڵ کەسانی چەوساوە بۆ ڕزگارکردنیان. بەڵام لەگەڵیانە و یارمەتیان ئەدات هەر کاتێ جەنگ بکەن و خەبات بکەن بە ئومێدی ئەوەی ڕاستی و دادپەروەری پەرەبسێنێ. نیازیان وابێ ڕشزگاریان ببێ لە ستەم وچەسانەوە. بە ڕاستی خوای گەورە لەگەڵ هەموو مرۆڤێکدایە کە کار بکات لەبەر ژیانی خۆی، خوای مەزن تاقمی پێغەمبەرەکانی لەناوبردووە لەبەربێ باوەڕیی و بێفەرمانی خوا. نەك لەبەر ستەملێکراوان.

وەك لەمەوبەر باسمان کرد فیرعەون خەوێکی بینی زۆری لێ ترسا، هەندێ لە ماناکەرانی خەو وتیان: لەمەودا منالێك لە بەنوئیسرائیلیەکان پەیدا ئەبێ لەسەر دەست و هێزی ئەو منداڵە پاشایەتی و سامانی تۆ بنەبڕ ئەبێ، فیرعەون فەرمانی دا بۆ لەمەودوا هەر کوڕێ لەوان لەدایکبوو سەری ببڕن. ئەوەبوو کاتێ موسا لە دایك بوو باوك و دایکی ترسان و موسایان شاردەوە، دوایی خوای مەزن لەو بارەیەوە بە دایکی موسا ئەفەرموێ:

وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ

فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ ﴾ وه ئێمه خستمانه دڵی دایکی موسا که تۆ شیر بده به مووسا. زانایانی مێژوونووسی جووه‌کان ئه‌ڵێن: دایکی موسا ناوی (یوکاید)ه، دوایی تۆ هه‌رکاتێ ترسای له‌وه‌ی مووسا سه‌ربڕن، دوایی تۆ موسا فڕێ بده‌ره ناو ڕووباری نیله‌وه.

﴿ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾ وه تۆ مترسه موسا سه‌ر ببڕدرێ و خه‌فه‌ت مه‌خۆ له‌سه‌ر جیابوونه‌وه‌ی مووسا له تۆ، به ڕاستی ئێمه مووسا ده‌گه‌ڕێنینه‌وه بۆ لای تۆ و ئاگاداری ئه‌و ئه‌که‌ین و ئێمه مووسا ئه‌گێڕین له یه‌کێ له نێردراوه‌کانی ئێمه.. به گوێره‌ی فه‌رمانی خوای مه‌زن دایکی موسا سندوقێکی درووستکرد و قیرتاوی کرد و موسای خسته ناو سندووقه‌که‌وه و فڕه‌ی دایه ناو ڕووباری نیله‌وه، بڕوای ته‌واوی به خوای مه‌زن به‌ست.

﴿ فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ﴾ دوای فڕدانی‌یه ناو ڕووباری نیلا که سانێ له خێزانی فیرعه‌ون موسایان هه‌ڵگرت له‌به‌ر ئه‌وه‌ی موسا ببێ به دوژمنی ئه‌وان بێ باوه‌ڕان ترۆ ببێ به‌هۆی خه‌فه‌ت بۆیان له‌مه‌ویاش.

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ﴾ به‌ڕاستی فیرعه‌ون و هامانی سه‌رۆك شالیارانی فیرعه‌ون و له‌شکره‌کانیان له‌هه‌ڵه‌دا بوون له هه‌موو کاره‌کانیانا. به تایبه‌تی له کوشتنی هه‌زاران مناڵانی بێ تاوان بۆ ئه‌وه‌ی ڕزگاریان ببێ له مناڵێ له ناویان بیا، ئه‌وه‌ی لای به‌نده بێ لای خوا پوچه.

بۆ زانین: کاتێ یەعقوب و منداڵەکانی کۆچیان کرد بۆلای یوسف لە میسر دەستیان کرد بە لەوەڕداری و بەخێوکردنی ئاژەڵ و بەکردنی دانەوێڵە چاندن و کێڵانی زەوی، لە میسردا ئەژیان و کەمتر تێکەڵاوی دانیشتووانی میسریان ئەکرد، ژمارەیان زۆربوو، لە بەجێهێنانی کاروباری ئایینی خۆیانا سەربەستبوون هەتا کاتی پاشایەتی (رمیسی) دووهەم ویستی سنورێ بۆ زۆربوونی ژمارەی بەنو ئیسرائیلی‌یەکان دابنێ، بەوبۆنەیەوە دەستی‌کرد، بە چەوسانەوە یان وکوشتنیان. دوای مردنی (رمسیس) کوڕەکەی بوبە پادشا کە ناوی (منفتاح) بوو، لە کاتی ئەویشدا چەوسانەوە و کوشتنی بەنوئیسرائیلی‌یەکان بەردەوام بووە بەڵام (منفتاح) زۆرتر دەستی دایە ئازاردانیان، کوڕەکانی سەرئەبڕین و ژنەکانیانی ئەهێشتەوە بۆ کارەکەری، چونکە خەوێکی بینیبو، زاناکانیان وتیان لەناو بەنوئیسرائیلەکانا کوڕێك پەیدا ئەبێ لەسەر دەستی ئەو پاشایەتی تۆ لەناو ئەچێ، لەو کاتەدا عیمرانی کوڕی واهب کە یەکێ بوو لەبەنوئیسرائیلیەکان لە (یوکابد) ژنەکەی خۆی کوڕێکی بوو بەناوی موسا، بەر لە موسایش کچێکی بو بەناوی مەریەمە و کوڕێکیشی بەناوی هارون، (یوکابید) خوشکی باوکی موسا بوو، ئەو کاتە پور مارەکردن قەدەغە نەکرابوو، لەبەرترسی سەربڕین موسایان فڕە دایە نیلەوە.

کاتێ موسا فڕێدرایە ناو ڕوباری نیل و گەیشتە لای کۆشکی فیرعەون گەورە کارەکەرانی فیرعەون چاوی کەوت بە سندوقێك ئاو فڕێیداوە بۆ کەناری ڕووبارەکە، بەپەلە چوون و سندووقەکەیان هەڵگرت و بەپەلە بردیان بۆلای ئاسیيەی ژنی فیرعەون، کاتێ سندوقەکەی کردەوە تەماشای کرد منداڵێکی تێدایە دەری هێناو بردی بۆلای فیرعەون، فیرعەون ووتی: ئەم منداڵە چۆن ڕزگاری بووە لەسەربڕین و ڕقی هەستاو بە تووڕەیی‌یەوە ووتی: بۆچی و چۆن لەمنیان شاردووەتەوە؟ ویستی بیکوژێ.

﴿ وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ ئاسیيەی ژنی فیرعەون داوای لە فیرعەون کرد ئەو کوڕەی پێ‌ببەخشێ و ووتی: ئێوەئەم منداڵە مەکوژن، ئەو خۆشی من و تۆیە و ئەبێتە هۆی فێنکی چاومان، ئومێد وایە کەئەو منداڵە سوود بگەیەنێ بە ئێمە بابیکەین بەکوڕی خۆمان چونکە ئێمە منداڵمان نی‌یە، فیرعەون دڵی نەرمبوو و ووتی خۆشی و فێنکی چاوی تۆ بێ‌و من پێویستیم بە منداڵ نی‌یە و، فیرعەون وتاقمەکەی هەستیان بەوە نەدەکرد کە ئەو منداڵە ئەبێ بەچقڵی چاویان لە پاشەڕۆژدا ئەبێتە هۆی نەمانیان. کاتێ دایکی موسا موسای فڕێدایە ناو ڕووباری نیلەوە، چاوی بڕیبووە سندوقەی لە دوورەوە و سەیری ئەکرد شەپۆلی ئاوی ڕووباری نیل فڕێی ئەدا بەم لاوبەولادا، دایکی موسا لەوانە بوو قیڕەی لێ هەستێ و لە خەفەتا بڵێ: کوڕەکەم، کوڕەکەم. بە تایبەتی کاتێ بینی سندوقەکە کەوتووەتە ناو کۆشکی فیرعەون.

﴿ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە دڵی دایکی موسا گەڕا بە چۆڵی لە هەموو شتێ جگە لەبیرکردنەوە لەموسا و خەفەت دای گرتبو، بە ڕاستی نزیك بوو نهێنی کوڕەکەی ئاشکرا بکا و بەسەرهاتەکەی بڵاوبکاتەوە و بڵێ: موسا کوڕی منە ئەگەر ئێمە ئارام و خۆڕاگرتنمان نەخستایەتە سەردڵی دایکی موسا و دڵمان بەهێزنەکردایە لەبەر ئەوەی باوەڕی تەواوی هەبێ بەو بەڵێنەی ئێمە پێمان دابو کە بەڕاستی ئێمە موسا ئەگێڕینەوە بۆلای بە وێنەی باوەڕدارانی تر بە بەڵێنی ئێمە.

﴿ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ وە دایکی موسا بە خوشکەکەی موسای ووت: تۆ بڕۆ دوای هەواڵ و بەسەرهاتی موسای برات بکەوە، بزانە لە دواییدا چ شتێکی بەسەردێ، دوایی ڕۆیی و چاوی بە موسا کەوت کە لە لای خیزانی فیرعەونە، دوایی خوشکەکەی لە دوورەوە تەماشای موسای ئەکرد بەجۆرێ دانیشتووانی کۆشك هەستی پێنەکەن و وابزانن هیچ مەبەستێکی بەو منداڵە نیە، خێزانەکانی فیرعەون نەیان ئەزانی کە خوشکی موسایەو هەستیان نەئەکردە ئەو منداڵە برایەتی.

﴿ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ ﴾ وە ئێمە قەدەغەمانکردبو لەسەر موسا شیری هەموو ژنێ بخواتەوە لەوانە هێنابونیان شیری پێبدەن، هەموویان پێیان خۆشبوو مەمکەکەیان بگرێ هەتا توشی ڕێزبن لەلای فیرعەون. بەڵام موسا بێزی لە هەموویان ئەکردەوە، لە پێش هاتنی دایکی بۆلای. لەوکاتەدا مەریەمی خوشکی موسا توانی خۆی بگەیەنێتە کۆشکی فیرعەون و خۆی بخاتە نێو ئەو ژنانە هێنابونیان بۆ شیردان بە موسا.

﴿ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴾ دوایی مەریەمی خوشکی موسا ووتی بە خێزانی فیرعەون: ئایا من شارەزایی ئێوەبکەم بۆلای خێزانێ ماڵی ئەو کوڕە بەخێوبکەن بۆ ئێوە و، ئەو خێزانە نیازیان پاك بێ بۆ ئەو مناڵە و ئامۆژگاری چاکی بکەن و خۆشیان بوێ و کۆمەکە پێبکەن. فیرعەون دەستوری دا بەهاوردنی ئەو خێزانە، خوشکەکەی بەپەلە گەڕایەوە بۆلای دایکی و هێنای بۆلای فیرعەون، دایکی بەبێ گرنگی دان بەو مناڵە چوە پێشەوە بۆلایی و مەمکەکەی نایە دەمی موسا مەمەکەکەی گرت و تێری خوراد لە شیرەکەی، دایکی موسا لە کۆشکی فیرعەون مایەوە.

﴿ فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ﴾ دوایی ئێمە موسامان گێڕایەوە بۆلای دایکی و چونەوە بۆماڵی دایکی لەپاش ئەوەی ئاسییەی ژنی فیرعەون بۆی دەرکەوت ئەو ژنە بەباشی ئەیەوێ ئەو مناڵە بەخێو بکا، لەبەر ئەوەی دایکی موسا چاوی بەموسا فێنك ببێتەوە دڵخۆش بێ بەگەڕانەوەی موسا بۆ لایی و خەفەت نەخوا بۆ جیابوونەوەی موسا لەخۆی.

﴿ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وە بۆ ئەوەش دایکی موسا بزانێ: بەڕاستی بەڵێنی خوای مەزن بەگەڕانەوەی موسا بۆلای خۆی ڕاستە بەبێ گومان شدیشی کا بە پێغەمبەر، دایکی موسا جاربەجارێ موسای ئەوبردەوە بۆ کۆشکی فیرعەون هەتا ئاسییەی ژنی

فیرعەون چاوی پێی بکەوێ. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: (چاکترینی ژنانی بوونەوەر چوار ژنن: خەدیجەی کچی خوەیلید، فاتیمەی کچی موحەممەد، ئاسییەی کچی موزاحیم ژنی فیرعەون، مەریەمی کچی عیمران دایکی عیسا)، بەلاّم زۆر لەقیبتیەکان نازانن بەکاری خوای مەزن، نەیان ئەزانی بەسەرهاتی ئەوان و موسا چۆن ئەبێ.

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾

﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾ وەکاتێ موسا گەیشت بەپلەی تەواوبوونی ئەقڵ و لەشی وەگەشەی‌کرد بە جۆرێ بتوانێ بە رێك و پێکی کاری هەردوو جیهان بباڕێوە و تەمەنی گەیشتە چل ساڵی ئێمە بەموسامان بەخشی پێغەمبەرایەتی و زانینی بەڕێوەبردنی کاروباری هەردوو جیهان و زانینی ڕاستی. هەر بەوجۆرە ئێمە ئەو کارە چاکانەمان لەگەڵ موسا کرد، ئێمە پاداشتی پیاوچاکانمان ئەدەینەوە.

﴿ وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَذَا مِنْ عَدُوِّهِ ﴾ وە ڕۆژێ موسا چوە ناو هەندێ لە جادەکانی شاری میسردا لە کاتێکا بو هیچ کەسێ لە دانیشتوانی شاری هەستی پێ نەکەن و نەیبینین؛ چونکە ئەوکاتە کاتیپشودان و خەوتنی نیوەڕۆ بو. ئەیویست ئەویش لەجێگەیە پشوویدا، دوایی دووپیاوی بینی شەڕیان ئەکرد یەکێکیان بەنوئیسرائیلی بو لە تاقمی موسابو، ئەوی تریان قیبتی بو لەتاقمی فیرعەون پیاوێکی زۆردار و بەهێزبو نزیکبو پیاوە ئیسرائیلیەکە بکوژێ، بە شێوەیەکە گشتی قیبتیەکان ئەیانڕوتاندنەوە بە خزمەتکاری خۆیانیان ئەزانین. بەنوئیسرائیلیەکان نەیان ئەتوانی پەلاماریان بدەن و سەریان شۆڕ ئەکردن، موسا لای گرانبوو.

﴿ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ ﴾ دوایی ئەو کەسە لاوازەی ئەوتۆ لەتاقمی موسا بو داوای یارمەتیکرد بگاتە فریای لەدژی ئەو پیاوە بەهێز و زۆردارەی ئەوتۆ دوژمنی موسا بوو لە تاقمی فیرعەونبو، موسا زۆری پێ ناخۆشبو ئازاری دۆستەکەی بدرێ چوە پێشەوە ناو بۆ ژیان بکا و یەخەی میسریەکەی گرت، وتی: ئازاری ئەم هەژارە مەدە.

﴿ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ ﴾ دوایی موسا مستەکۆڵەیەکی خۆیدا لە دوژمنەکەی خۆی بەنیازی گەڕانەوەی لە ستەمکردن نەك بەنیازی کوشتن، موسا زۆر بەهێزبوو، دوایی ئەو پیاوە بەو مستەکۆڵەیە مرد، ئەو جۆرە کوشتنەش پێی ئەوترێ کوشتنی بە هەڵە. نەك کوشتنێ بەنیازی کوشتنبێ. دوای ئەوەی موسا چاوی کەوت بەو پیاوە مردووە خەفەتی خوارد.

﴿ قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي ﴾ موسا ووتی: ئەو کارەی من کە بوبەهۆی کوشتنی ئە وپیاوە لە کردەوەی شەیتانە بەڕاستی شەیتان ڕێگە لادەرێکی ئاشکرایە بۆ ئادەمیزاد، موسا ووتی: ئەی پەروەردگاری من: بە ڕاستی من ستەمم لە خۆم کردوە بەکوشتنی ئەو پیاوە بەبێ ئەوەی تۆ فەرمانم پێ بدەی، تۆ لەمن خۆشببە، چونکە من بەهەڵە ئەو پیاوەم کوشتووە.

﴿ فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ دوایی پەروەردگار خۆشبوو لە موسا، بە ڕاستی پەروەردگار لێی خۆش بونی زۆرە بۆ بەندەکانی خۆی، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ کەسانێ داوای لێبوردن بکەن.

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ ﴾ موسا ووتی: ئەی پەروردگاری من: بە ڕاستی تۆ چاکەی خۆتت بەسەرمندا ڕژاند بەهۆی وەرگرتنی پەشیمانبوونەوە و لە گوناهی من خۆشبوی، دوایی تۆ یارمەتی من بدە نەبم بە پشتیوانی تاوانباران و ئەو کەسانەی ستەم لە خۆیان ئەکەن، وێنەی فیرعەون و تاقمەکەی، پشتیوانی باوەڕداران بم.

﴿ فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا الَّذِي اسْتَنصَرَهُ بِالْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُ ﴾ دوای ئەوەی موسا ئەو پیاوەی کوشت ڕۆژی دوایی بەناوشاردا ئەگەڕاو ئەترسا بەبۆنەی کوشتنی ئەو پیاوەوە توشی ئازار بێ، چاوەڕوانی ئەکرد چ شتێ پەیدا بووە لە دوای کوشتنی ئەو پیاوەوە، ئایا

فیرعەون و تاقمەکەی هەڵوێستیان چۆن بووە دوای پەیدابوونی ئەو ڕووداوە. کاتێ موسا لەو چاوەڕوانی‌یەدا بوو، دوای کەوتبوو ئەو کەسەی کە دوێنێ داوای یارمەتی لێ‌کرد، جارێکی تر کەوتبووە شەڕ لەگەڵ پیاوێکی تری قیبتیدا و جارێکی تریش داوای یارمەتی ئەکرد لە موسا.

﴿ قَالَ لَهُ مُوسَى إِنَّكَ لَغَوِيٌّ مُّبِينٌ ﴾ موسا فەرمووی بەو پیاوە ئیسرائیلیە: بە ڕاستی تۆ پیاوێکی لە ڕێگە ڕاست دەری ئاشکرای، ڕێگەی ڕاست وەرناگری، چونکە تۆ بەو کارەی دوێنێ ئامۆژگاریت وەرنەگرت، جارێکی تریش ئەمڕۆ دەستت داوەتە جەنگ کردن.

﴿ فَلَمَّا أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِالَّذِي هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَا مُوسَى أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِي كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًا بِالْأَمْسِ ﴾ دوایی کاتێ موسا ویستی کە هەڵمەت بداتە کەسێکی ئەتۆ کە دوژمنی موسا و دۆستەکەیەتی و قیبتیەکە لابدا لە ئازاردانی ئیسرائیلیەکە، ئیسرائیلیەکە وای زانی ڕقی جولاوە و ئەیەوێت هەڵمەت بۆ ئەم بهێنێ، ووتی: ئەی موسا ئایا ئەتەوێ کە من بکوژی وەك دوێنێ تۆ پیاوێکی ترت کوشت؟

﴿ إِن تُرِيدُ إِلَّا أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِي الْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ الْمُصْلِحِينَ ﴾ تۆ ناتەوێ هیچ شتێ بکەی جگە لەوەی کە پیاوێ بی زۆردار و خراپەکار و خوێن ڕێژ لەزەوی میسردا و ناتەوێ لەو کەسانە بی چاکە بلاو بکەیتەوە لە نێو دانیشتواندا، تۆ بەپیاوچاك ناسراویت و پیاوکوشتن لە ڕەوشتی تۆوە دوورە.

لە دوایی‌دا ئەو دووپیاوە ڕۆیشتن، دانیشتوان گوێیان لە گفتوگۆیانبو کە ئەو پیاوە موسا کوشتویەتی، خاوەن کوژراوەکە بەو ڕووداوەی زانی، هەواڵەکە گەیشت بە فیرعەون و فەرمانی دا بیهێنن و بیکوژن، لەو کۆڕەدا پیاوێ دانیشتبوو گوێی لەگفتوگۆی فیرعەونبو، موسای خۆش ئەویست و چاکەی لەگەڵ کردبوو، ڕۆیشت و هەواڵەکەی بە موسا ڕاگەیاند.

وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾ فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ

ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾

﴿ وَجَاء رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ ﴾ وە بەو بۆنەوە پیاوێکی باوەڕدار لە بە خوارەوەی شاری میسرە ڕای کرد بۆ لای موسا کە ئامادەی جێگە فیرعەونبوو، ووتی: بە ڕاستی پیاوانی بەڕێزی شار کۆبوونەتەوەو ڕاوێژ ئەکەن لە نێوان خۆیانا لە بارەی ئەو کارەوە تۆ کردووتە، لەبەر ئەوەی بتکوژن لە تۆڵەی ئەو پیاوەدا کە تۆ کوشتووتە.

﴿ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ ﴾ دوایی تۆ لەم شارە بڕۆرە دەرەوە بۆ ئەوەی نەکوژرێی . بە ڕاستی من بۆ تۆ لەو کەسانەم بەنیازی پاکەوە ئامۆژگاری تۆ ئەکەم، هەتا زووە دەرچۆ لەم شارە.

﴿ فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾ دوایی موسا لەشاری میسر چووە دەرەوە بەترساوی بەبێ خواردن و بەبێ هاورێ و ناشارەزا، چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد تاقمی فیرعەون بیگرن و نەتوانێ ڕزگاری ببێ لە دەستیان، موسا ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ من ڕزگار بکە لە ستەمی ستەمکارانی تاقمی فیرعەون، موسا چووە دەرەوە، پیاوانی فیرعەون گەڕان بە شوێنیا دەستیان نەکەوت، مووسا بەرەو مەدەین ڕۆیشت.

﴿ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَاءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَى رَبِّي أَن يَهْدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴾ وە کاتێ موسا چووە دەرەوە و بە ناشارەزایی ڕوی کرد بۆ لای زەویی شاری مەدەیەن کە کەوتۆتە باکووری دەریای عەقەبە لە نێوان حیجاز و شامدا، موسا ووتی: ئومێدەوارم پەروەردگاری من شارەزایی من بکا بۆلای ڕێگەیەکی ئەوتۆ ڕزگارم ببێ لە فیرعەون و تاقمەکەی.

﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ ﴾ وە کاتێ موسا چووە لای ئاوی زەوی مەدەیەن ویستی خۆی فێنك بکاتەوە و ئاویش بخوا، لەلای ئەو ئاوە کۆمەڵێکی لە شوانەکانی دەستکەوت کە مەڕ و هوشترەکانیان ئاو ئەدا و نۆرە نۆرە ئەچوون بۆلای ئاوەکە.

﴿ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ امْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ ﴾ وە لەلای جێگەیەکی نزیك لەوان دووژنی تازەپێگەیشتووی دەست کەوت مەڕەکانی خۆیانیان تێ ئەخوڕی و نەیانئەهێشت نزیکی ئاوەکە بکەونەوە، موسا سەری سوڕما لەو پیاوانە لە پێشەوە ئاژەڵی خۆیان ئاوئەدەن و ئەو دوو ژنەیش دوائەخەن.

﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّى يُصْدِرَ الرِّعَاءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴾ مووسا بەو دوو ژنەی فەرموو: ئێوە چ ئیشێکتان هەیە و ئەتانەوێ چ شتێ بکەن؟، دوو ژنەکان ووتیان: ئێمە ناتوانین مەڕەکانی خۆمان ئاوبدەین، هەتا شوانەکان ئەگەڕێنەوە و لە ئاودانی ئاژەڵەکانیان ئەبنەوە، ئێمە چونکە توانای تێکەڵاوی ئەوانمان نی‌یە، دوای ئەوان مەڕەکانی خۆمان ئاوئەدەین، ئێمە بێکەسین و باوکیشمان پیاوێکی گەورەیە و تەمەنی زۆرە و چووە بەساڵا و خۆی ناتوانێ سەرپەرشتی ئێمە و مەڕەکانمان بکا.

﴿ فَسَقَى لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّى إِلَى الظِّلِّ ﴾ دوایی موسا پیاوەتی و جوڵا و بەزەیی بەو دززژنەدا هاتەوە، چووە پێشەوە بۆ ئاوی گۆلاوەکە، شوانەکانی دوورخستەوە و ئەوانیش ڕێگەیان بۆ چۆڵ کردو بە پیاوێکی سامدار هاتە پێش چاویان، مەڕەکانی بۆ ئاودان و ئەوانیش سوپاسیان کرد. لە پاش ئاودانی مەڕەکان موسا چوو بۆلای سێبەری شتێ پشوو پێ‌بدا و فێنکی ببێتەوە، ئیتر ئەو سێبەرە سێبەری هەرشتێ بێ گرنگ نی‌یە.

جێگەی سەرسوڕمانت نی‌یە کە موسا یارمەتی ژنانی بێهێز بدا، چونکە وا ئەبێ بێ‌باوەڕانیش یارمەتی ژنان و پیاوانی هەژار بدەن، ئەوەش جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە کە شوعەیب و کچەکانی بە ئارەقی ناوچەوانی خۆیان بژین، چونکە هەژاری و بێ‌سامانی پیشەی پێغەمبەران و

پیاوچاکانە. بەلاّم ئەوەی جێگەی سەرسورمان بێ ئەمەیە: کە ئەم فەرموودەی قورئانە کارناکاتە دڵی ئێمە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە ئەڵێن: ئێمە پیاوچاك و زانای ئایینین و باوەڕمان بە پێغەمبەران و نامەکانی خوا هەیە، خۆیان بە پەیڕەوی پێغەمبەران ئەژمێرن. لە هەمو شتێ سەرسوڕهێنەر تر ئەمەیە: کە ئەوانە خۆیان بەزانای ئایینی دائەنێن و خۆیان بە ئایین پەروەر و نیشتمان پەروەر ئەزانن. پێشبڕِ کێ ئەکەن بۆ پلەوپایەو کۆشکی نایاب و سامانی زۆر.

﴿ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾ موسا دوای دانیشتنی لەو سێبەرەدا ووتی: ئەی پەروەردگاری من، بەڕاستی من لە هەمووشتێ تۆ ناردبێتەخوارەوە بۆ من لە لایەن خۆتەوە لە چاکەکەمبێ یا زۆر پێویستیم پێی هەیە و هەژارم و برسیمە خواردەمەنیم بۆ ساختە بێنە بەهۆی بەخشندەیی خۆتەوە.

کچەکانی شوعەیب بە خێرایی و زووتر لە جاران چوونەوە بۆلای باوکیان، پرسیاری لێکردن چۆن وا بەزوویی هاتنەوە، بەسەرهاتی خۆیان و موسایان بۆ گێڕایەوە، فەرمانیدا ئەو کوڕە بێنن بۆلای من.

﴿ فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاء قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴾ دوایی یەکێك لەو کچانە چوون بۆلای موسا بەشەرمەوە ئەڕۆیشت بۆلای و ووتی بە موسا: بە ڕاستی باوکم بانگی تۆ ئەکا بچی بۆلای؛ لەبەر ئەوەی پاداشتی ئەو ئاودانەی تۆ بداتە بە مەڕەکانمان، موسا لەگەڵیدا ڕۆیشت و پێشی خۆی خست، لە کاتی ڕۆیشتندا باکراسەکەی لادا و قاچی کچەکەی شوعەیب دەرکەوت، موسا لای خۆش نەبوو بیبینێ، داوای لێکرد بکەوێتە دواییەوە، کچە زۆر سەری سوڕما لە خاوێنی داوێنپاکی موسا.

﴿ فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾ دوایی کاتێ موسا چووە خزمەت شوعەیب هەواڵی ڕابردووی فیرعەون و تاقمەکەی فیرعەونی بۆ گێڕایەوە، ڕووداو و بەسەرهاتی خۆی بەتەواوی بەسەر شوعەیبدا خوێندەوە، شوعەیب فەرموی تۆ مترسە ڕزگارت بووە لە ستەمی ئەو تاقمە ستەمکارانەی فیرعەونە.

﴿ قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ ﴾ یەکێ لەو دوو کچانەی شوعەیب ووتی: ئەی باوکی من: تۆ موسا بەکرێ بگرە بۆ بەخێوکردن و لەوەڕاندنی مەڕەکانمان. بە ڕاستی چاکترین کەسە تۆ بەکرێی ئەگری زۆر بەهێزووتوانایە ، دەست پاك و داوێن پاکە، شوعەیب بە کچەی ووت: چۆن ئەزانی بەهێزو داوێن پاکە؟ کچەکە ووتی: کاتێ ئاوی بە دۆڵچە دەرئەهێنا بەهێزی ئەوم بۆ دەرکەوت، کاتێ هێنام بۆلای تۆ بە منی ووت لە پاشمەوە وەرە هەتا چاوی بە ڕانی ڕووتی من نەکەوێ، شوعەیب فەرمووی ڕاست ئەکەی.

﴿ قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ ﴾ شوعەیب بە مووسای فەرموو: بە ڕاستی من ئەمەوێ کە یەکێ لەم دوو کچانەی خۆم ئائەمەیان مارە ببڕم لە تۆو بیکەم بە هاوسەری تۆ لەسەر ئەو مەرجەی کە تۆ بەکرێگیراوی منبی هەشت ساڵ کارم بۆ بکەی و ئەم مەڕانەم بۆ بلەوەڕێنی.

﴿ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ ﴾ دوایی ئەگەر تۆ ئەو هەشت ساڵە بکەی بە دەساڵی تەواو و کاربکەی لای من، دوایی ئـەو چاکەیـە لـە لایـەن خۆتەوەیـەو مـن نامەوێ کە ئازار و ڕەنج بدەم بەسـەر تۆدا، خـۆت سەربەسـتی موسـا مەرجەکـەی شـوعەیبی وەرگرت و یەکێ لـە کچەکانی شوعەیبی مارەکرد. مەڕەکانی شوعەیبی لەوەڕان.

﴿ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ شوعەیب فەرمووی بە موسا: ئەگەر خـوای مـەزن ئارەزوو بکا تۆ منت دەست ئەکەوێ بەوەی لە ڕیزی پیاوچاکانبم، ئـەو بەڵێنـەی ئـەیدەم بـەتۆ جێبەجێی ئەکەم.

﴿ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾ موسا فەرمووی: ئەوەی تۆ بە منت ووت لە مارەکردنی یـەکێ لـە کچـەکان و لـە لـەوەڕاندنی مەڕەکان ڕێکەوتنێکە لە نێوان من و تۆدا و من پێی ڕازیم بەڵام هەرکات لـەو دوو ماوەیـە مـن بەجێم هێنا و ئارەزووی خۆمەوە من سەربەستم، دوایـی دەسـتدرێژی نەکرێتـە سـەرمن ئەگـەر نەمتوانی (١٠) ساڵ تەواو بکەم و، خوای مەزن ئاگاداری لەسەر شتێ ئێمە ئەیڵێین.

بۆ زانین: زانایان لە بارەی ماناکردنی ئەو ئایەتەوە فەرموودەی زۆریان کردووە: خەزوورەی چ کەسێ بووە و ناوی چ شتێ بووە؟. موسا هەشت ساڵ ئاژاڵی لەوەڕاند یان (١٠ ساڵ)؟. ئەو کچەی مارەکرد نـاوی چیبـو؟ کچـە گەورەکـەیانبوو یـا بچووکەکـەیان؟. مـارەیی ئـەو ژنـە لەوەڕاندنی مەڕەکانبوو لەو دوو ماوەیەدا یاشتێ تر بوو جگەی لەوەڕاندن؟. بـەڵێندانی بـاوکی ئەو کچە مارەکردن بە لای دەستووری ئەوان یا دواتر لێی مارەکرد؟ ووڵامی ئەو پرسیارانە یەك بەیەك بەم جۆرەی خوارەوە ووڵام ئەدرێتەوە:

١- زانایان بیربۆچوونیان جیاوازە بۆ دیاریکردنی نـاوی خـەزوورەی مویـا و بەشـەش جـۆر باسیان کردووە، هیچ لایەکیان بەڵگەی بێگوومانیان بە دەستەوە نییە، بە ڕاستی لـە هـەموویان بەناوبانگتر خەزوورەی موسا ناوی شوعەیب بوە. هەندێکیان لەبەر ئەوەی خـوای مـەزن نـاوی خەزوورەکەی موسای ڕوون نەکردووەتەوە چاك وایە ئێمە بێدەنگبین.

٢- زانایان بۆ دیاریکردنی ئەو دوو ماوەیە بیروبۆچوونیان جیاوازە. لە هـەموویان چاکـتر و ڕەواتر ئەوەیە بۆ موسا و بۆ خەزوری لە هەردوو جیهاندا ئەوەیە: (١٠) ساڵبێ بـە تایبـەتی بـۆ پاشەڕۆژ پاداشتی زۆرترە.

٣- ئەو کچەی موسا مارەی کرد کچە بچووکەکەیان بو، ئەوەیان بوو موسای بانگکرد بـۆ لای باوکی، ناوەکەی (صفراو) بو، هەندێ لە زانایان ناوی (صفراء)ئەبەن.

٤- هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مارەیی ئەو ژنە بریتی بووە لە لەوەڕاندنی مەڕەکانی شـوعەیب بۆ ماوەی هەشت ساڵ یا (١٠) ساڵ. بەڵام زۆر لـە زانایان لایان وایە مارەیی ئەو ژنە شتێ تربوە جگەی لەوەڕاندنی مەڕەکان، موسا بەکرێی تر مـەڕەکانی لـەوەڕاند، لـەوەڕاندنی ئـەو مەڕانـە

نەمارەیی تەواوی ئەو ژنە بو نە بەشێکیشی، هەرچۆنێ بێ یاسای پێغەمبەرانی پێشوو نابێ بە یاسای ئیسلام.

٥- ئەو بەڵێنەی شوعەیب بە ووشەی (ارید) هەتا دووایی مارەبڕینەکە تەواو ئەبێ و دروستە بەلای یاسای ئەو کاتەوە، ڕانواندنی ژن بۆ مارەکردن لە لایەن کاربەدەستانەوە هەرچەندە درووستە. بەڵام لای یاسای ئیسلام نابێ بە مارەبڕین، بەلای شافیعی‌یەکانەوە مارەبڕین دروست نی‌یە بەجگەی ووشەی ئینکاح و تەزویج. بەلای مالیکەکان و حەنبەلی‌یەکانەوە مارەبڕین بە ووشەی (هیبە) دروستە، بەلای حەنەفیەکانەوە، مارەبڕینی ژنان بە ووشە (هیبە) دائەبەسترێ ئەگەر نیازی مارەبڕینی پێ بکرێ ... ماوەی لەوەڕاندنی مەڕەکان کۆتایی پێهات، موسا ماوەیەتر لای شوعەیب مایەوە. لە پاشا ئارەزۆی چاوپێکەوتنی کەس و کاری خۆی هەبوو لە میسر، داوای لە خەزووری کرد دەستووری پێ بدا بە خۆی و ژنەکەی و دوو منالییەوە بڕواتەوە بۆ میسرلەبەر بینینی باوك و دایکی و براو خوشکەکانی، خەزووری دەستووری پێدا و، ئەندازەیەکی زۆری لە مەڕەکانی پێ بەخشی، لەو بارەیەوە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ مِن شَـٰطِئِ ٱلْوَادِ ٱلْأَيْمَنِ فِى ٱلْبُقْعَةِ ٱلْمُبَـٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْـَٔامِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ وَٱضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهْبِ ۖ فَذَٰنِكَ

بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾

﴿ فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ ﴾ دوایی کاتێ موسا ماوەی لەوەڕاندنی مەڕەکانی شوعەیبی کۆتایی پێهانا ماوەیە لای خەزووری مایەوە داوای چوونەوەی بۆلای میسر کرد لە خەزووری، ئەویش دەستووری پێدا، دوایی خۆی و خێزانەکەی ڕۆیشتن بەرەولای میسر لە شەوێکی زۆر سادەو تاریکا و ڕێگەیان لێ وونبو، بارو شتومەکەکەی خست بۆ پشوودان. تەماشای ئەولا و لای خۆی ئەکرد بزانێ شتێ بەدی ناکا.

﴿ آنَسَ مِن جَانِبِ الطُّور نَارًا قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَارًا لَّعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴾ موسا لەو کاتە سەرگەردانیەدا لەلای کێوی تورەوە ئاگرێکی بینی زۆری پێخۆشبوو، موسا بە خێزانەکەی خۆی ووت: ئێوە لێرە دانیشن. بە ڕاستی من ئاگرێ ئەبینم و ئەچم بۆلای ئومێدم وایە لای دانیشتووانی ئەو ئاگرە هەواڵی بۆ لای ئێوە بهێنم و شارەزاییمان بکەن بەرە و جێگەیەك بڕۆیین، یا پارچە پشکۆێ لەو ئاگرە بهێنم و ئاگرێکی پێ بکەینەوە بەو ئومێدەی ئێوە خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە و ڕزگارتان بێ لەم سەرمایە.

﴿ فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِي مِن شَاطِئِ الْوَادِي الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ ﴾ دوایی کاتێ موسا چووە لای ئەو ئاگرە، ئاگری بۆ پەیدا نەبوو، ڕووناکی‌یەکی بینی نەیزانی سەرچاوەی ئەو ڕووناکی‌یە جێگەکەی لە چ شوێنێکە، هەوڵی ئەدا بگاتە ئەو ڕووناکی‌یە، موسا لەلای ڕاستی خۆیەوە لە تەرەفی شیوێکەوە لە جێگەیەکی پیرۆز لە لای درەختێکەوە بانگی لێ کرا.

﴿ أَن يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ بە ڕاستی ئەی موسا من خوایەکم پەروەردگاری هەموو بوونەوەرانم، دڵی مووسا تووشی خۆشی بوو، هەر بە ڕاستی ڕووناکی‌یەکی خوایی لە هەموو لایەکەوە دای ئەپۆشێ، ترسی نەماو دڵی دوای ناخۆشی هێدی بوویەوە، دوای ڕێگەونبوون شارەزایی وەرگرت، پیرۆزی ئەو جێگەیە لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەری زۆری تێدا ڕەوانەکراوە و، خوای مەزن گفت وگۆی لەگەڵ موسادا کردووە، ئەو درەختە هەر درەختێ بێ گرنگ نی‌یە. موسا هەستی کرد بە ڕاستی جیهان ئەو جیهانە نی‌یە موسا و تاقمەکەی ئەیانزانێ. بەڵکو جیهان ڕێگەیەکە بۆلای بەهەشت یان دۆزەخ، خوای پەروەردگار ڕووی ڕێزی خۆی ئاراستەی لای موساکرد و کردی بە پێغەمبەر و فەرمانی پێدا بڕوا بۆلای فیرعەون و تاقمەکەی و لەو داوایە ترسا، خوای مەزن ترسەکەی نەهێشت و فەرمووی:

﴿ وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ﴾ وە تۆ داردەستەکەی خۆت فڕە بدە، موسا فڕەی دا بوو بە مارێك، دوایی چاوی کەوت بەو مارە بەوێنەی مارێکی زۆر گەورە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە تیژی ئەهات و ئەڕۆیشت وەك تیرە مارێکی بچووکبێ.

﴿ يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ ﴾ موسا پشتی کردە مارە و ڕای کرد و ترسا و نەئەگەڕایەوە بۆلای شیوەکە و بەرەو لای خێزانەکەی کەوتە ڕێ، بانگی لێکرا ئەی موسا: تۆ ڕوو بۆلای مارەکە بکە و تۆ مەترسە، ئەو مارە ئازاری تۆ نادا، بە ڕاستی تۆ دڵنیابەو تووشی ئازار نابیلەو مارەوە، جارێکی تر خوای مەزن بە مووسای فەرموو:

﴿ اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ ﴾ تۆ دەستی خۆت بکە پەخەی کراسەکەی خۆتا، موسا دەستیکردە یەخەی کراسەکەی و دەری هێنایەوە، دەستی هاتە دەرەوە بە ڕووناکی و سپیەتی‌یە زۆرە وە بەبێ ئەوەی توشی نەخۆشی بوبێ وەك بەڵەکی و شتی تر. خوای مەزن فەرمانی دا بە موسا و فەرمووی:

﴿ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ ﴾ تۆ دەستی خۆت دانێ لەسەر سنگی خۆت هەتا ئەو ترسەی تۆ بەهۆی مارەکەوە تووشت بووە نەمێنێ و ئارام بگری. ئیبن و عەباس ئەفەرموێ هەموو کەسێ هەرکاتێ ترسا دەستی خۆی دانێ لەسەر سنگی ترسەکەی نامێنێ، بێژراوە باڵندە کاتێ ترسا باڵەکانی خۆی ڕائەکێشێ کە ترسەکەی نەما ئەیانگێڕێتەوە بۆلای سنگی.

﴿ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴾ دوایی ئەو دووشتانە داردەستکەت کە ئەبێ مارێك و ئەو دەستەیشت کە ڕووناك و سپی ئەبێ دووکاری پەك خەرن و دراوە بە تۆ لە لایەن پەروەردگاری خۆتەوە کە بڕۆی بۆلای فیرعەون و تاقمە گەورەکانی خۆی و داوایان لێ بکە واز لەستەم کردن بهێنن . بە ڕاستی ئەو تاقمە کۆمەڵێکن لایانداوە لە سنوری خوای مەزن.

قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَى بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلَّا سِحْرٌ

مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْسًا فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴾ موسا ووتی: ئەی پەروەردگاری مەزن: بە ڕاستی من پیاوێکم لە تاقمی فیرعەون کوشتووە، دوایی من ئەترسم کە لە تۆڵەی ئەو پیاوەدا من بکوژن. ئەوە بوو لەووەوبەر پیاوێکی لەوان کوشتبوو بەو بۆنەیەوە لەمیسر چووبووە دەرەوە، هەرچەندە کوشتنی موسا بۆ ئەو پیاوە بە نیازی کوشتن نەبوو. بەڵام لەناوبژیدا مستەکۆڵێکی پیا کێشا بوبو بە هۆی کوشتنی ئەو پیاوە. مووسا ووتی ئەی پەروەردگاری من:

﴿ وَأَخِي هَارُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِي إِنِّي أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾ وە هارونی برای من، ئەو زمانی لەمن پاراوتر و ڕەوانترە، دوایی من داوا لە تۆ ئەکەم لەگەڵ مندا ڕەوانەی بکەی بە یارمەتی دەرم و بیکەی بە پێغەمبەر، ڕاستی گفت و گۆی من دەربڕێ و گومانی ئەو پوچ بکاتەوە. بە ڕاستی من ئەترسم بە درۆم بخەنەوە و نەتوانم مەبەستی خۆم ئاشکرا بکەم بۆیان. بێژراوە هارون سێ‌ساڵ لە موسا گەورەتر بوە. بە ڕاستی بۆ ئێمە ڕون نەکراوەتەوە چۆن لەسەر برین ڕزگاری بووە؟ هەواڵەی زانیاری خوابێ.

ئەو ئایەتە ئێمە فێری ئەوە ئەکات کە هەموو کار و ڕووداوێك پێویستی بە یاریدان و کۆمەڵ هەیە، زانین و زانیاری بەتەنا نابێتە هۆی ڕوونکردنەوەی ڕاستی بۆ دانیشتووان ئەگەر زمان پاراو نەبێ و نەتوانرێ مەبەست بۆ دانیشتووان ڕوون بکرێتەوە، بەتەنها زانیاری بەرگری لە زمانی دوژمن ناکا. بۆیشمان ڕوون ئەکاتەوە پڕوپاگەندە شتێکی پێویستە بۆ سەرکەوتنی مەبەست بەهەر جۆرێ بێ، بەوێنەی ئێستا بەهۆی ڕۆژنامە و گۆڤار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە شتی مەبەست ڕێوشوێنی بۆ دیاری ئەکەن.

﴿ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَانًا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا ﴾ خوای مەزن فەرمووی: ئێمە بازووی تۆ بەهێز ئەکەم بەهۆی یارمەتی دانی هاروونی براتەوە و، ئێمە هێز و توانا ئەبەخشین بە ئێوە و فیرعەون و تاقمەکەی بێ هێز ئەکەین، دوایی فیرعەون و تاقمەکەی ناتوانن هیچ ئازارێ بە ئێوەبگەیەنن بەهۆی ئەو کارە پەك خەرانەی ئێمەوە کە بریتین لەدارە دەستەکەی تۆ و دەستی سپی بێ نەخۆشی و چەندین کاری پەك خەری تر.

﴿ أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ ﴾ تۆو هاروونی برات و کەسی پەیرەوی ئێوە بکا لە باوەڕداران سەرئەکەون بەسەر فیرعەون و تاقمەکانیا، ئیتر ئێوە لە ڕاگەیاندنی فەرمانی ئێمە مەوەستن.

﴿ فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَى بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى ﴾ دوایی کاتێ موسا چوبـۆڵای فیرعەون و تاقمەکەی بەوکارە پەك خەرە ئاشکرانەی ئێمەوە ووتیان" ئەو شـتەی موسا هێناویـەتی هیچ شتێ نی‌یە مەگەر جادوێکی دەستکرد و هەڵبەستراوە لە لایەن خۆیەوە و ئەیداتـە پـاڵ خـوای مەزن.

﴿ وَمَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ ﴾ ئەو شتەی مووسا داوای لـە ئێمە ئەکا ئێمە نەمان بیستووە و باوباپیرەکانی پێشوومان نەیانزانیوە.

﴿ وَقَالَ مُوسَى رَبِّي أَعْلَمُ بِمَن جَاء بِالْهُدَى مِنْ عِندِهِ ﴾ وە مووسـا لـە وولاّمـی ئـەواندا ووتـی: پەروەردگاری من زاناترە بەکاری ئێمە و بەکاری ئێوە و ئـەزانێ بـە کەسـێ ئـەیکا بـە پێغەمبـەر و داوای ڕانموبی ئەکا بۆ لای ڕێگەی ڕاسـت لـە لایـەن ئێمـەوە فـەرمانی پـێ درابـێ و مـوژدە بـدا بەبەهشت.

﴿ وَمَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴾ وە زانـاترە بەکەسـێ کـە ئـەنجام و کۆتاییەکەی چۆن ئەبێ لەم جیهاندا و چاکەی کردبێ دوارۆژی لە ڕۆژی دواییدا چوونی‌یەتی بـۆ بەهەشت. بە ڕاستی ستەمکاران ڕزگاریان نابێ لە دووارۆژدا و بە تۆڵەی خۆیان ئەگەن.

وَقَالَ فِرْعَوْنُ
يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ
لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ
إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَاسْتَكْبَرَ
هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا
لَا يُرْجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي
الْيَمِّ ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴿٤٠﴾
وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ
لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً ۖ
وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا
مُوسَى الْكِتَابَ مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَىٰ
بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي ﴾ فیرعەون ووتی: ئەی پیاوانی بەرێز و گەورە: من نەمزانیوە بۆ ئێوە هەبێ هیچ خوایەك لە جگەی من. فیرعەون كاتێ هیچ شتێكی بەدەستەوە نەما بەرامبەر بە موسا بیكا، ئەیزانێ كۆمەڵێ هەن باوەڕی پێ بكەین ئەو گفت و گۆیەی ئاراستە كردن.

بە فیرعەون بێژراوە: چ كەسێ تۆی كردووە بە فیرعەون؟ فیرعەون ووتی: من هیچ كەسێكم نەدیوە بەرگری لەمن كا، بەو گفتوگۆیەی فیرعەون ئەوەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە زۆر كەس خۆی ئەكات بە فیرعەون ئەگەر هێزێ نەبێ بەرامبەری بكاو بچێ بەگژیا. ووشەی فیرعەون بە زمانی میسری بە مانا(خانەدانی گەورەیە)، نازناوی پاشایانی میسرە.

﴿ فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴾ دوای ئەوەی غیرعەون ئەو گفتوگۆیەی ئاراستەی پیاوەگەورەكانی خۆی كرد، هیچ كەسێ بەرگری نەكرد و ووتی: ئەی هامان: تۆ خشتی كاڵ درووست بكە بۆ من و دوایی ئاگر بكەرەوە بە سەریا، هەتا سوور ئەبێتەوەو ڕەق ئەبێ و ئەبێ بە خشتی سووركراوە. دوایی تۆ بەوخشتە ڕەقە كۆشكێكی بەرز و قایم بۆ من درووست بكە و من بچمەسەری بە ئومێدی ئەوەی من ئاگاداری پەیدا بكەم بۆلای خوای موسا، بە ڕاستی من گومانئەكەمە موسا لەو كەسانەیە درۆئەكەن و موسایش درۆ ئەكا ئەڵێ جگەی من خوایە ترهەیە، كاتێ من چوومە سەر ئەو كۆشكە بۆم دەرئەكەوێ موسا ڕاست ئەكا یا درۆ ئەكا. ئایا هامان ئەو كۆشكەی دروست كرد یا بۆی دروست نەكرد؛ وا دەرئەكەوێ بۆی دروست نەكرد، چونكە هامان بە فێڵی فیرعەونی ئەزانی، چ كەسێ ژیر بێ هەوڵی ئەوە ئەدا كۆشكێكی بێ كۆتایی دروست بكا و گومانی وابێ بە درخت و خشت ئەگاتە لای ئاسمانەكان و بزانێ چ كەسێ بەسەریانەوەیە.

﴿ وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ﴾ وە فیرعەون و لەشكرەكەی داوای گەورەییان ئەكرد لە زەوی میسردا بە جۆرێكی نارەوا ناپەسەند و ڕایكێشان بۆ لەناوبردنیان، یاخی بوبون، دوای كارێكی پووچ كەوتبوون و، گومانیان وابوو كە بەڕاستی ناگەرێنەوە بۆلای ئێمە لە ڕۆژی دواییدا و پرسیاریان لێ ناكرێ لەسەر شتێ ئەیكەن لەو كردەوە خراپانە.

﴿ فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴾ دوایی ئێمە فیرعەون و لەشكرەكەی فیرعەونمان بەسەختی گرت، دوایی ئەوانمان فڕەدا بە ناو ڕووباری نیلەوە و هەموویان خنكان و مردن، دوایی تۆ تەماشا بكە، پاشەڕۆژی ستەمكاران و تاوانباران بە چ جۆرە بەهۆی بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران.

﴿ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ﴾ وەئێمە فیرعەون و لەشكرەیكەمان گێرا بە پێشەوا و گەورەی جیهان بانگی دانیشتوانیان ئەكرد بۆلای كارێ ڕایانبكێشێ بۆلای ئاگری دۆزەخ و لایاندەن لە ڕێگەی ڕاست.

﴿ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴾ وە ئەوان یارمەتییان نادرێ لە ڕۆژی دواییدا، هیچ کەسیان نابێ سزایان لەسەر لابا و ڕسوا و دەرکراوی میهرەبانی خوای مەزنن.

﴿ وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ ﴾ وە ئێمە بەدوای فیرعەون و تاقمی فیرعەوندا ئەهێنین لەم جیهانەدا ڕسوایی و ئابڕوچوون و بێبەشبوون لە میهرەبانی خوای مەزن و، ئەوان لە ڕۆژی دواییدا ڕوگرژ و دورخراوی میهرەبانی خوای مەزن. یانێ خوای مەزن دووجار دووری خستوونەتەوە لە میهرەبانی و بەزەیی خۆی: جارێ لە جیهاندا ڕسوای کردن و لەسەر بێباوەڕی مانەوە هەتا مردن، جارێ تر لە ڕۆژی دواییدا لە میهرەبانی خوای مەزن بێبەشن و ئەخرێنە دۆزەخەوە بەبەردەوامی.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَى بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ وە ئێمە لە دوای ئەوەی دانیشتووانی بێ باوەڕی خولەکانی پێشوومان لەناوبردن و وەك تاقمی هود و سالّح و لوت بە خشیمان بە موسا نامەیەکە تەوراتە بۆ ڕووناکی دڵی ئادەمیزاد ڕاستی لێبینن و چاك و خراپی پێ جوێ بکەنەوە وەئێمە لەدوای ئەوەی شارەزای یاسای خوای مەزنیان بکا و خۆشبێ بۆ کەسێ باوەڕی پێ بهێنێ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی لە دوای ئەوانەوە دێن ئامۆژگاری وەربگرن و بەسەرهاتی ئەوان تەمێ خواربن و واز لە بێ باوەڕی بهێنن و کاربەناوەڕۆکی تەورات بکەن. نەك بە تەوراتی ئێستا کە لە (الأصحاح)ی ژمارە ٠٣٢)ی سفری (العدد)دا ئەڵێ: ( ئێوە پیاوەکان و ژنەکان و منالّەکانیان بکوژن و جگە لە کچەکانیان بیانهێڵنەوە و بەوان ڕابوێرن بۆ ئارەزوی خۆتان، ئاژاڵ و سامانیان داگیربکەن، شار و مالّیان بسوتێنن).

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَىٰ مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّا أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَا أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا

رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (٤٧) فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ لَوۡلَآ أُوتِيَ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ مُوسَىٰٓۚ أَوَلَمۡ يَكۡفُرُواْ بِمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۖ قَالُواْ سِحۡرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓاْ إِنَّا بِكُلّٖ كَٰفِرُونَ (٤٨) قُلۡ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبٖ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمَآ أَتَّبِعۡهُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٤٩) فَإِن لَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكَ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيۡرِ هُدٗى مِّنَ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥٠) ۞ وَلَقَدۡ وَصَّلۡنَا لَهُمُ ٱلۡقَوۡلَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ (٥١)

﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ ﴾ وە تۆ لەلای تەرەفی خۆرئاوای کێوی تورا نەبوی کاتێ ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای موسا سروش و شتێ موسا داوای کردبوو ڕای بگەیەنێ بە تاقمەکەی خۆی و لەوێش ئامادە نەبووی کاتێ ئێمە لەو جێگەیەدا گفت و گۆمان لەگەڵ موسا کرد، کەواتە کە تۆ ئەو هەواڵانە ئەدەی بە دانیشتوانبەسەرهاتی موسا بەڵگەی ڕاستە لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ و بە سروشی خوای مەزن تۆ ئەو هەواڵانەت زانیوە.

﴿ وَلَكِنَّا أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ ﴾ وە بەلاَم ئێمە دروستمان کردبو دانیشتوانی چەند کاتێ دوای موسا، هەندێك ئەهاتن بەدوای هەندێ تریان نا، دوای درێژەی کێشا بەسەر ئەواندا چەند کاتێکی زۆر، دەستور و فەرمانی ئاینیان گۆڕی، دوایی ئێمە تۆمان ڕەوانە کرد بۆ تازەکردنەوەی ئایینی ڕاست و بانگی ئادەمیزاد بکەی بۆلای ئەو ئایینە ڕاستە.

﴿ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَلَكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾: تۆ ئامادەی دانیشتوی ناو شاری مەدەیەن نەبووی کە شوعەیبی تێدابوو هەتا تۆ نیشانە ڕوونەکانی ئێمە بخوێنیتەوە بەسەریانا و تۆ پێغەمبەری ئەوان نەبویی و بەلاَم ئێمە وەك شوعەیبمان نارد بۆلای

دانیشتوانی مەدەیەن تۆمان ڕەوانە کردوە بۆ لای دانیشتوانی مەکە و بۆلای هەموو ئادەمیزاد، قورئانێکمان بە تۆ بەخشیوە هەواڵ و بەسەرهاتی گەلانی پێشووی تێدایە، ئەگەر تۆ پێغەمبەر نەبوویتایە ئەو هەواڵانەت نەئەزانی.

﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ وە تۆ ئامادەی لای تەرەفی کێوی تور نەبویی کاتێ ئێمە گفت و گۆمان لەگەڵ کرد و پێمان ووت: بەهەموو توانای خۆی تەورات وەرگرێ و ڕاییگەیەنێ بە تاقمەکەی خۆی. کەواتە تۆ پێغەمبەری کە ئەو هەواڵە بە دانیشتووان ئەگەیانی و، بەلام ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە خۆشی و چاکەبی لە لایەن پەروەردگاری خۆتەوە بۆ هەموو بۆنەوەران لەبەرئەوەی ئەو تاقمەی خۆت بترسێنی لە بێفەرمانی ئێمە بەر لە هاتنی تۆ بۆلای ئەوان پێغەمبەرێ تر نەهاتووە بیان ترسێنێ، بۆ ئەوەی ئامۆژگاری وەرگرن و بەختیاری هەردوو جیهانیان دەست کەوێ.

پرسیار: جیاوازی لە نێوان ڕستەی (وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ) و رستەی (وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ) چ شتێکە؟

وەلام: خوای مەزن زۆرتر لەیەکجار لەتەرەفی کێوی تورەوە گفتوگۆی لەگەڵ موساکردووە.

﴿ وَلَوْلَا أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە ئەگەر تووشی قورەیشی‌یەکان ببێ سزایەك لە لایەن ئێمەوە لە جیهاندا بەبۆنەی بێفەرمانی خوای مەزنەوە بەر لەوەی ئێمە تۆ ڕەوانە بکەین بۆلای ئەوان، دوایی ئەوان ئەڵێن : ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ بۆ ڕەوانەت نەکرد بۆلای ئێمە پێغەمبەرێ بانگی ئێمە بکا بۆلای ئایینی تۆ، دوایی ئێمە ئەو کاتە پەیڕەویی ناوەرۆکی ئایەتەکانی نامەی تۆمان ئەکرد و ئێمە باوەڕمان ئەهێنا بە تۆ و بە پێغەمبەری تۆ و لە بێ باوەڕی وازمان ئەهێنا.

﴿ فَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا لَوْلَا أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ مُوسَى ﴾ دوایی کاتێ چوو بۆلای ئەوان ئایینی ڕاست لە لایەن ئێمەوە ووتیان: بۆچی نەبەخشراوە بە موحەمەد وێنەی شتێ بەخشراوە بە موسا وەك داردەستێ ببێ مار و دەستی سپی کە ڕووناکی بلاوبکاتەوە.

﴿ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَى مِن قَبْلُ ﴾ ئایا ئەوان بۆ باوەڕیان بە شتێ نەبوو بەخشرا بە موسا لە پێش تۆ و قورئان. کەواتە دانیشتووانی مەکە و ئەو کەسانەیش لە کاتی موسادا بوون وێنەی یەکن، هەردوولایان پێغەمبەرەکانی خۆیان بەدرۆخستەوە.

﴿ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ ﴾ ئەیان ووت: موحەمەد و موسا خاوەنی دوو جادون وەك قورئان و تەورات یارمەتی یەکتری ئەدەن لەسەر گۆڕانی ئادەمیزاد لە ئایینێکەوە بۆلای ئایینێ ترو ئەیان ووت بە ڕاستی ئێمە باوەڕمان بەهەردوو لەو خاوەن جادووانەو و بەهەردوو جادووەکانیان نییە. بەکورتی قورەیشیەکان ئەیان ووت: قورئان جادووە و موحەمەد جادوگەرە و موسا جادوگەرە و تەورات جادوە، بڕوایان بە هیچ ئایینێ نییە.

﴿ قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ تۆ بلێ بەوان: دوایی ئێوە نامەیە بێنن لە لایەن خوای مەزنەوە ئەو نامەیە، ئەو نامەیە شارەزاکەرتر بێت بۆ ئادەمیزاد لە قورئان هەتا من پەیڕەوی ئەو نامەیە بکەم ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کە تەورات و قورئان جادون.

﴿ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان وولامی تۆیان نەدایەوە بۆ هاروردنی ئەو نامەیە، دوایی تۆ بزانە بە ڕاستی ئەوان دوای هەوەس و ئارەزووی پڕوپوچی خۆیان کەوتوون کە ڕایان ئەکێشێ بۆلای هەموو خراپەیە.

﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ وە چ کەسێ گومڕاترە لە کەسێ دووی ئارەزۆی خۆی کەوتبێ بە جگەی ڕانومایی کردن و بەڵگە لە لایەن خوای مەزنەوە و باسی قورئان بکەن بە جۆرێکی ناشایستە. بە ڕاستی خوای مەزن شارەزای تاقمی ستەمکاران لە خۆیان ناکا. دوای ئەوەی ئێمە ئەقڵمان داونەتێ.

﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە قورئانمان بۆ ئەوان ڕوونکردووەتەوە بە ئایەت و بەواتمان گەیاندووە یەك لە دوای یەك لە هەریەکەیان بەهۆێکی تایبەتی و مەبەستێکی تایبەتەوە، بۆ ئەوەی ئەوان ئامۆژگاری وەرگرن و کار بە فەرموودەکانی

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾

﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئێمە بەخشیومانە بەوان نامەکانی ئێمە وەك تەورات ئینجیل کە لە پێش قورئان هاتنە خوارەوەی کە باسی شێوازی پێغەمبەریان تێداکرابو ئەو کەسانە باوەڕ بە قورئان ئەهێنن، چونکە لەو قورئانەدا ئەوەی لە تەوراتا باسی کراوە دەستیان کەوت بەبێ گومان.

﴿ وَإِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ﴾ وە هەرکاتێ قورئان بخوێنرێتەوە بەسەریانا ئەڵێن ئێمە باوەڕمان بەو قورئانە هێنا. بەبێ گومان ئەو قورئانە ڕاستەو لە لایەن پەروەردگاری ئێمەوە هاتووە. بەڕاستی ئێمە لە پێش هاتنی قورئان باوەڕمان بە موحەمەد هێناوە و ملمان بۆ ناوەڕۆکی قورئان دانەواندووە.

﴿ أُوْلَئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا ﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە قورئان و بە محەمەد بەر لەهاتنی قورئان هێناوە، پاداشت ئەبەخشرێ بەوان دووجار بەهۆی شتێ ئارامیان لەسەر گرتووە و بەردەوامبوون لەسەری: جارێ لەسەر ئەو بەردەوامییەیان، جارێ تر لەسەر پەیڕەویی کردنی موحەمەد ﴿ﷺ﴾.

﴿ وَيَدْرَؤُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ وە ئەو کەسانە بەرگری لە خراپە ئەکەن بەهۆی چاکەکانیانەوە و هەندێ لەو شتەی ئێمە بەخشیومانە بەوان ئەیدەن بە هەژاران لە ڕێگەی ڕەزامەندی خودا.

﴿ وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ ﴾ وە هەرکاتێ باوەڕداران گفتوگۆی بێسود و ناڕەوایان بیستایە لە جنێو و توانج ڕوویان وەرئەگێڕا لەو گفت و گۆ ناپەسەندانە و دەنگیان نە ئەکرد. موسڵمانانی پێشو توشی ئازاری زۆر ئەبورن بە دەست بێ باوەڕانەوە. بە جۆرێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بڕۆیشتایە بەڕێگەدا بێ باوەڕان بە دەنگی بەرز ئەیان ووت بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەی شێت، درۆزن، جادوگەر. ئەوانیش بێ دەنگبون.

﴿ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ﴾ باوەڕداران ئەیان ووت: کردەوەکانی خۆمان بۆ ئێمە لە خواپەرستی و کردەوکانی ئێوەیش بۆخۆتانە لەبت پەرستی، ئێمە ئارام ئەگرین لەسەر کردەوەکانی خۆمان. ئاشتی و وازهێنان لەسەر ئێوە بێ و بەرامبەر بە جنێودانی ئێوە ئێمە جنێو بە ئێمە نادەین، ئێمە داوای هاوڕێتی و تێکەڵاوی نەزانان ناکەین و ئایینی ئەوانمان لا ناخۆشە و ئایینی پیرۆزی خۆمانمان لاچاکە.

إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَى مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ

إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ (٥٨) وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ (٥٩) وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (٦٠) أَفَمَن وَعَدْنَاهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَاقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْمُحْضَرِينَ (٦١)

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاء وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ بە ڕاستی تۆ توانای ئەوەت نی‌یە هەرکەسێ خۆشبوێ بیخەیتە ناو ئایینی ئیسلام و ڕانومایی و باوەڕپـهێنێ و، بەلاّم خوای مەزن ڕێگە نیشان ئەدا بە هەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ و ئەیخاتە ناو ڕیزی باوەڕداران و، خوای مەزن زاناترە بەو کەسانە شارەزایی وەرئەگرن بۆلای ئایینی ئیسلام و ئەزانێ چ کەسێ ئامادەیە بۆ باوەڕهێنان و وەرگرتنی ڕێگەی ڕاست. پێغەمبەر فەرمووی: من ڕەش و سپی بانگ ئەکەم بۆلای ئایینی ئیسلام، هەموو کەسێ بانگ ئەکەم لەسەر کێوەکانین با لە ناودەریادابن. بەو بۆنەوە:

﴿ وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَى مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا ﴾ وە بێ باوەڕان ووتیان لە وولاّمی پێغەمبەردا: ئەگەر ئێمە دوای ئەو ڕانوموی کردنەی تۆ بکەوین و باوەڕبهێنین بە ئایینی ئیسلام هەموو هۆزەکانی عەرەب ئەبن بە دوژمنی ئێمە لەم زەوی و نیشتمانەی خۆمانە هەڵئەگیرێنی و دەرەبەدەرمان ئەکەن، ئێمە توانای ئەوەمان نیە جەنگ لەگەڵ عەرەب و فارس و ڕۆم و جگەی ئەوان بکەین. خوای مەزن وولاّمی دانەوە و فەرمووی بەو کەسانە ئەترسان:

﴿ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَى إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِزْقًا مِن لَّدُنَّا وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ ئایا ئێمە نیشتمان و جێگەیەکی ڕێزدارمان ئامادە نەکردووە بۆ ئەوان کە بەبێ ترس دانیشن لە ناویا و کەس نەتوانێ پەلاماریان بدا و ئەهێنرێ بۆلای ئەو جێگە بەرێزە بەروبوومی هەمووشتێ بۆ خواردەمەنی لە لایەن ئێمەوە، ئەبێ بۆ ئەوان بترسن و، بەلاّم زۆرتر لەوان بەو چاکەیەی کە خوای مەزنە نازانن و سوپاسی خوا ناکەن. ئەو جێگەیە ئەوندە بەرێزە دانیشتووانی بە باڵندە و گیانداری تری نابێ ئازاریان بدرێ و درەختەکانیشی نابێ ببڕێن.

زۆربەی زانایان جگە لە شیعەکان ئەڵێن هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥٦)ی ئەم سورەتە ئەوەبوە: کاتێ ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە گیانەڵاوی سەرەمەرگدا بووە چووە بۆلای مامی و زۆری پێخۆش بووە باوەڕبهێنێ. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئەی مامی خۆم بڵێ: (لا اله الی الله) بەهۆی ئەو ووشەیەوە لە ڕۆژی دواییدا و لە خزمەت خوای مەزندا شایەتیت بۆ ئەدەم. ئەبو تالیب ووتی: ئەگەر لەبەر لۆمەی قورەیشییەکان نەبووایە کە ئەڵێن ترس پاڵی پێوە ناوە ئەم ووت و دڵی تۆم خۆش ئەکرد. بەڵام لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیب و عەبدول مەنافم.

﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ﴾ وە ئێمە دانیشتوانی زۆر گوندمان لەناوبردوون لە ژیان و ڕابواردنی خۆیان لە سنوور دەرچوبون و سوپاسی خوای مەزنیان نەدەکرد، ئەچون بەگژی پێغەمبەرەکانیان و باوەڕیان نەئەهێنا بەوێنەی دانیشتوانی مەکە.

﴿ فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴾ دوایی ئەوانەن و کاولبوون و دوای ئەوان جێگەکانیان ئاوەدان نەکراوەتەوە و کەسێ لەواندا دانەنیشتون مەگەر کەمێ لە کاروانیەکان بچنە ناویان بۆ پشوودان و ئێمە خاوەنیانین و بەکاریان ئەهێنین و بەڕێوەیان ئەبەین دوای ئەوان.

﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ﴾ وە پەروەردگاری تۆ دانیشتوانی هیچ گوندێ لەناو نابا و سزایان نادا هەتا ڕەوانەکا لە پای تەخت و شاری ئەو گوندانەدا پێغەمبەرێ بخوێنێتەوە بەسەریانا نیشانە ڕوونەکانی ئێمە و هەواڵیان بداتێ ئەگەر باوەڕنەهێنن توشی سزادەبن.

﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَى إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴾ وە ئێمە دانیشتوانی هیچ گوندێ لەناونابەین مەگەر کاتێ دانیشتوانی ئەو گوندانە ستەمیان لەخۆیان کردبێ بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان و باوەڕنەهێنان.

﴿ وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ﴾ وە هەرشتی ببەخشرێ بە ئێوە لە دارایی و سامان، دوایی ئەو شتانە ڕابواردنێکی کەمی جیهانە و کۆتاییان پێبدرێ بەمردنی خۆتان و وایش ئەبێ بەر لە مردنتان.

﴿ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ وە شتێ لەلای خوای مەزنە لە پاداشت چاکترە و بەردەوامترە لە خۆشی و گوزەرانی جیهان. ئایا ئێوە نازانن و ئەقڵی خۆتان ناخەنەکار کە جیهان ئەبڕێتەوە و ڕۆژی دوایی بەردەوامە؟

﴿ أَفَمَن وَعَدْنَاهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَاقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ ئایا دوایی کەسێ ئێمە بەڵێنمان پێداوە بە بەڵێندانێکی چاك کە چونیەتی بۆ بەهەشت، دوایی توشی ئەو بەڵێنە ببێ بەوێنەی کەسێکە ئێمە پێمان بەخشبێ ڕابواردنی جیهانی پڕ لە ئازار و بڕاوە. بێگومان ئەو دووکەسە و ئەو جیاوازییەی نێوانیان وەك یەك نین.

﴿ ثُمَّ هُوَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴾ لەپاشا ئەو کەسەی ئێمە خۆشی جیهانمان پێبەخشیوە لەو کەسانەی ئەوتۆیێ ئامادە ئەکرێت بڕۆن بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُواْ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾

﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە خوای مەزن بانگی بێباوەڕان ئەکا. دوایی ئەفەرموێ: لە چ جێگەیەکن کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە گومان ئەبەن هاوبەشی منن لەپەرستندا؟

﴿ قَالَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ رَبَّنَا هَؤُلَاء الَّذِينَ أغْوَيْنَا أغْوَيْنَاهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ لە پێشەواکانی بێباوەڕان پێویست کرابو لەسەریان سزادانی خوای مەزن بۆیان ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمەك کەسانێکی ئەوتۆ ئێمە لاماندا‌ون لە ڕێگەی ڕاست، ئێمە ئەوانمان لادا لە ڕێگەی ڕاست وەك خۆمان لاماندا بو لە ڕێگەی ڕاست.

﴿ تَبَرَّأْنَا إِلَيْكَ مَا كَانُوا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴾ ئێمە ئێستا بێزارین لەو کەسانە و لە کردەوەکانیان ئەوان ئێمەیان نەپەرستوە و دوای ئێمە نەکەوتوون. بەڵکو هەواو هەوەسی پوچی خۆیانیان پەرستوەوخۆیان بەرپرسیارن، تۆیش ئەقڵت بێداربون و چاك و خراپیان جویَ نەکردەوە.

﴿ وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَاءكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ وَرَأَوُا الْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا يَهْتَدُونَ ﴾ وە ئەبێژریَ بەبیَ باوەڕان: ئێوە بانگی ئەو هاوبەشانی خۆتان بکەن نەیان ئەهێشت باوەڕبهێنن، دوایی ئەوان لەبەر زۆری سەرگەردانی خۆیان بانگیان ئەکەن، دوایی ئەوان وولامیان نادەنەوە لە کاتی بانگکردنیان و گەورە و بچوکیان سزای خوای مەزن ئەبینن و، ئاوات ئەخوازن کە ئامۆژگاری قورئانیان بگرتایە و باوەڕیان بهێنایە هەتا لەم کاتەدا ڕزگاریان ببوایە.

﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ ﴾ وەتۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە کە خوای مەزن بانگی ئەو کەسانە ئەکا پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستۆتەوە، دوایی ئەفەرمویَ بە چ شتیَ ئێوە وولامی پێغەمبەرە ڕەوانەکراوەکانی خواتان داوەتەوە، ئایا ئێوە باوەڕتان بەوان هێنا یا بیَ فەرمانی ئەوانتان کردووە.

﴿ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الْأَنبَاء يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَاءلُونَ ﴾ دوایی ڕێگەی وولامدانەوە و هەوڵدانیان لەسەر فرامۆش ئەکریَلەو ڕۆژەدا وەك کوێر و لاڵیان لێدیَ و توانای بیانوهێنانەوەیان نامێنیَ، چونکە ئەزانن تاوانبارن، دوایی ئەوان ناتوانن پرسیار لە یەکتری بکەن چۆن وولام بدەنەوە. هەرکەسیَ لە بیَ باوەڕان بەردەوامبی لەسەر بیَباوەڕی جێگەی دۆزەخە.

﴿ فَأَمَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَعَسَى أَن يَكُونَ مِنَ الْمُفْلِحِينَ ﴾ دوایی هەرکەسیَ لەو بێباوەڕانە پەشیمان بوبێتەوە و باوڕی هێنابیَ و کردەوەی چاکی کردبیَ، دوایی ئومێد وایە کە ئەو کەسە لەو کەسانە بیَ ڕزگاریانبیَ لەو ڕۆژەدا بتپەرستان ئەیان وت: بۆچی ئەو قورئانە هاتوەتە بۆلای یەکیَتر لەدانیشتوانی ئەم دووگوندە: مەکە و تایف. خوای مەزن وولامیان ئەداتەوە و ئەفەرمویَ:

﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ وە پەروەردگاری تۆ دروست ئەکا هەر شتیَ ئارەزۆی بکا بۆ هەرکەسیَ شایستەیَ بۆ ئەو کارە و خۆی خاوەنی بونەوەرانە و، هەڵئەبژێریَ بۆ گەیاندنی پەیامی خۆی بە ئادەمیزاد هەرکەسیَ ئارەزۆی هەبیَ، هەڵبژاردن و دیاریکردنی پێغەمبەران بەدەستی ئەوان نیە، پاکی و خاوێنی بۆ خوایە و شایستەی ئەوە نیە کەسیَ ڕێگەبگریَ لە ویستی ئەو و بەرز و دورە لە شتیَ بت پەرستان ئەیکەن بە هاوبەشی خوای مەزن و کەسیَ تر مافی ئەوەی بیَ پێغەمبەر دیاری بکا.

﴿ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ وە پەروەردگاری تۆ ئەزانیَ بە شتیَ دڵی بیَباوەڕا ئەیشارێتەوە و بەشتیَ ئەوان ئاشکرای ئەکەن لە تاوانج و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾.

﴿ وَهُوَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْحَمْدُ فِي الْأُولَى وَالْآخِرَةِ ﴾ وە پەروەردەکەری تۆ خوای مەزنــە هیچ خوا نیە شایانی پەرستنبێ مەگەر هەر خوای مەزن و بۆ خوایە هەمو سوپاس لـە جیهان و لـە دوارۆژدا.

﴿ وَلَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ وەهەر بۆ خــوای مەزنــە فــەرماندان و بــەڕێوەبردنی هــەموو بونەوەران و هەر بۆ لای خوای مەزن ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆ وەرگرتنی پاداشت و سزا.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَــأْتِيكُم بِضِيَــاء أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴾ تۆ بڵێ بە دانیشتوانی مەکە: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بە من ئەگەر خــوای مــەزن شەوی بگێڕا بەسەر ئێوەدا بەبــەردەوامی ڕۆژ بــەدوای شــەودا نەهاتایــە هــەتا ڕۆژی دوایــی چ خوایەکە جگەی خوای مەزن ڕووناکی بهێنی بۆ ئێوە. ئایا دوایــی بــۆ ئێــوە ئامۆژگــاری نابیســن بەجۆرێ سودی لێ وەربگرێ و تەمێ خواربن.

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّــهِ يَــأْتِيكُم بِلَيْــلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ تۆ بڵێ بە دانیشتوانی مەکە: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بــە مــن ئەگــەر

خوای مەزن ڕۆژبگێڕێ بەسەر ئێوەدا و شەو بە دوایا نەهاتایە هەتا ڕۆژی دوایــی؟ چ خوایەکـە جگەی خوای مەزن شەو بۆ ئێوە بهێنێ ئێوە لـەشەودا ئارام بگرن و پشوبدەن، ئایا دوایی بۆ ئێوە توانا و میهرەبانی خوا نابینن؟

خوای مەزن شەووڕۆژی دروست کردوە دێن و ئەڕۆن بەدوای یەکا، ئەگۆڕێن بـەدرێژی و کورتی ماوەیان بەهۆی گۆڕانی وەرزەکانەوە، شەووڕۆژ لـە هێڵـی ناوەڕاسـتی زەویـدا یەکسـان ئەبن. لـە پاشا ئەگۆڕێن بە گۆڕانی وەرزەکـان هـەتا جێگەیـە دوورتربێ لــە هێڵـی ناوەڕاسـت گۆڕانەکەیان زۆرتر ئەبێ: بۆ نموونە لـە عێراقدا ڕۆژ درێژ ئەبێ هەتا ئەبێ بـە چـوارده کـاتژمێر، شەو ئەبێ بە (١٠) کات ژمێر، هەر بەو جۆرە شەویش درێژ ئەبێ و کورت ئەبێتەوە. هەتا خۆر لـە ئێمە و نزیکبێ گەرما زۆرتر ئەبێ، هەتا لێمان دووربێ سەرما زۆرتر ئەبێ. ئەگەر ئەو پەیڕەوە تێك بچێ ژیان بۆ گیانداران لـە ڕووی زەوی‌دا نامێنێ.

بۆ زانین: خوای مەزن لـە کاتی باسکردنی شەودا فەرمووی: (أَفَلَا تَسْمَعُونَ)، لـە کاتی باسـی ڕۆژدا فەرموی: (أَفَلَا تُبْصِرُونَ) لەبەر ئەوەیە شەو بۆ گوێ‌گرتن باشترە، ڕۆژیش بۆ بینین باشترە.

﴿ وَمِن رَّحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ وە هەندێکە لـەبەزەیی و بەخشندەیی خوای مەزن شەو وڕۆژی گـێڕاوە بـۆ سـوودی ئێـوە، لـەبـەر ئەوەی ئێوە ئارام بگرن لـە شەودا و پشوبدەن و ماندوویی ڕۆژتان نەمێنێ و لـەبەر ئـەوەی ئێـوە پەیدابکەن خواردەمەنی لـە ڕۆزی‌یەکانی خوای مەزن لــە ڕۆژدا بـۆ مانـەوەی خۆتـان و لـەبـەر ئەوەیش ئێوە سوپاسی خوای مەزن بکەن لـەسەر هاتوچۆ و گۆڕانی شەووڕۆژ کە هۆی مانەوەی ئادەمیزاد و گیاندارانی ترە.

﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾ وە تۆ بـیری ئـەو ڕۆژە بکـەرەوە خوای مەزن بانگی بێ‌باوەڕان ئەکا بۆ پرسیار و وەڵام، دوای خـوای مـەزن ئەفـەرموێ: لــە چ جێگەیەکن هاوبەشەکانی ئەو تۆی من ئێوە گومان ئەبەن هاوبەشی منن لـە پەرستندا؟

﴿ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ ﴾ وە ئێمە ئامادە ئەکەین لـە هەموو تاقمـێ لـە ئادەمیزاد شایەتێ وەك پێغەمبەران شایەتی بدا لـەسەر گفتوگۆو کارەکانیان، دوایی ئێمـە بـەو تاقمانە ئەڵێین: ئێوە بەڵگەی خۆتان بهێنن لـەسەر ئەوەی پێغەمبـەرەکانتان بـە درۆ خسـتۆتەوە و باوەڕتان پێ‌نەئەهێنان دوای فەرمانەکانیان نەئەکەوتن و بەردەوامبوون لـەسەر بێ‌باوەڕی.

﴿ فَعَلِمُوا أَنَّ الْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ دوای ئـەوەی بەڵگـەیان دەست ناکەوێ ئەزانن هەمو بەڵگەیەکی ڕاست هەر بۆ خوای مەزنـەو کـەس توانـای بەڵگـەی نیـە و لـەوان وونبووە شتێ بەدرۆ ئەیان پەرستن لـە جگەی خوای مەزن و لـە خوا دەستکردەکانیان.

پیاوێکی ساماندار و دارایی زۆر هەبوو ناوی (قارون) بو، لـە هۆزی بەنوئیسرائیلی و ئامۆزای موسابو، ئەو پیاوە هەر خۆی خۆش ئەویست و بیری لـە خۆشی کەسی تر نەئـەکردەوە، دارایـی

زۆری هەڵئەگرت و ئەیشاردەوە، لە جگەی هەواو هەوەسی خۆیا نەبوایە نەیئەبەخشی، ئازاری فیرعەونی بۆ خزمەتکارانی لاگرنگ ننەبوو، وای ئەزانی ئەو سامانە بەردەوام ئەبێ. خوای مەزن بەسەرهاتو دوارۆژ ئەو پیاوە ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ

وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾

﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ ﴾ بە ڕاستی قارون لە تاقمی موسا بو، ئامۆزایشی بو، دوایی قارون ستەمی کرد لە تاقمەکەی موسا و سەرۆکایەتی خۆی بەسەریانا سەپاندبو بە جۆرێکی ناڕەوا و لە سنوور دەرچو بو، شایستەی ئەو نەبو ببێ بە سەرۆکیان، هەمو بەنوئیسرائیلیەکان بکا بەژێردەستەی خۆی و یەکەمین کەسێ بو دانەری بنچینەی سەرمایەداری ناڕەوا، وەك خوای فەرمویەتی:

﴿ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ ﴾ وە ئێمە بە قارونمان بەخشیوە لە دارایی شاراوە و سامان ئەندازەیە. بە ڕاستی کلیلەکانی کردنەوەی دەرگای ژوری خانوی گەنج ودارایيەکەی لە کاتی هەڵگرتنیانا کۆمەڵێ لە پیاوانی خاوەن هێزی ماندو ئەکرد.

﴿ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە تاقمەکەی قارون لە بەنوئیسرائیلیەکان بە قارونیان وت: تۆ دڵخۆش و شادمان مەبە بە سامان و دارایی جیهان. بە ڕاستی خوای مەزن کەسانێکی خۆشناوێ شادمان و دڵخۆش بن بە سامانێ ببێ هۆی یاخیبوون لە خوای مەزن و دەستدرێژیکردنە سەر دانیشتوان و بەشی هەژارانی لێبدرێ.

﴿ وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا ﴾ وە تۆ لەو شتەی خوای مەزن بەخشیوە بەتۆ داوای پاداشتی ڕۆژی دوایی پێبکەو ببیەخشە بە هەژاران و لەبیری خۆتی مەبەرەوە بەشی خۆت و ڕابواردنی لە جیهاندا بە گوێرەی سنوری دیاریکراو و بەجۆرێ ڕەوانی.

﴿ وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ ﴾ وە تۆ چاکە بکە بە سوپاس کردنی خوای مەزن و بەبەخشینی دارایی خۆت بە هەژاران بەو جۆرە خوای مەزن چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە. ئەو سامان و پلەوپایە خوا لای تۆ داناوە و بەکاری بهێنە بۆ چاکەی خۆت.

﴿ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ ﴾ وە تۆ داوای بڵاوکردنەوەی خراپە لە زەویدا مەکە و خۆت هەڵمەکێشەو بێ دادی بەکار مەیەرە. بە ڕاستی خوای مەزن ئەو کەسانەی خۆش ناوێ خراپە بڵاو بکەنەوە لە زەویدا.

﴿ قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾ قارون لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە ئامۆژگاری چاکەیان ئەکرد ووتی: بە ڕاستی ئەو شتەی بەخشراوە بە من لەسەر ڕێز و زانستی خۆم دراوە پێم و بەزیرەکی خۆمە، جگەی من شایستە ئەو جۆرە سامانەی من نین، بۆم دروستە هەمو شتێ بە ئارەزۆی خۆم بکەم.

﴿ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ﴾ ئایا قارون نەیزانیوە کە بە ڕاستی ئێمە لە پێش ئەوەۆ لە ناومان بردوە دانیشتوانی چەندین خولەکی

ڕابردوو کە زۆرتر لە قارون بە هێزبتربوە و دارایی زۆرتری لەو کۆکردبوەوە. کاتێ دەستی کردبو بەستەم خوای مەزن ڕسوای کرد لە جیهاندا.

﴿ وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ ﴾ وە پرسیار لە تاوانباران ناکرێ بۆچی گوناهتان کردوە لە ڕۆژی دواییدا. بەلاّم بێ پرسیار سزایان ئەدرێ، چونکە خۆیان گوناهەکانی خۆیان ڕون ئەکەنەوە، هەرچەندە خوای مەزن پرسیار لە هەموو کەس ئەکا ئەگەر وەك ئەوان گوناهی خۆیان ڕون نەکەنەوە و باسی تاوانی خۆیان نەکەن.

کاتێ موسا هاتەوە بۆ میسر ویستی بە گوێرەی فەرمانی خوای مەزن بەنوئیسرائیلیەکان ڕزگاربکا لە ستەمی فیرعەون و هامان و پیاوە ساماندارە زۆرەکەی بەنوئیسرائیلیەکان کە قارونبو کە پشتگیری لە فیرعەون ئەکرد، قارون مرۆڤێکی درۆزن و دووڕو بو، ئەو شتەی دەری ئەبڕی دژی ئەو شتە بوو لە دلّیدا پەنهانی دابو ئەترسا ئەگەر موسا سەرکەدی سەرۆکایەتی نەمێنێ و سامانی کەم ببێتەوە، بۆ مەبەستی خۆی لەگەلّ فیرعەوندا لە دژی موسا کاریان ئەکرد، بەوبۆنەوە خۆپیشاندانێکی ساختە هێنا، بە هەموو شوێنەکانی میسردا گەڕا بە هەمو شکۆ و خزمەتکارەکانییەوە، لە ژێرەوە بەنوئیسرائیلییەکانی لە دژی موسا هان ئەدا، زۆر جاران بیری لە پیلانداناندا ئەکردەوە لە دژی موسا، هەر بۆیەیش ئەو خۆپیشاندانەی سازکرد، هەتا دانیشتوان هێز و توانای ببینن. خوای مەزن باسی ئەو خۆپیشاندانە و پاشەڕۆژی قارون ڕوون ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿ فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ ﴾ دوایی ڕۆژێ قارون بە هەمو خشلّ و بەنرخترین بەرگ و بەگەورەترین کۆمەلّیەوە چوە دەرەوە وخۆی ڕانواند بەسەر تاقمەکەی خۆیا و ئەو کەسانەی ئامۆژگاریان ئەکرد، زۆرترین کۆلاّن و شەقامەکانی میسر گەڕا بۆ ئەوە دانیشتوان بترسێنێ. کاتێ ئەو کارەی قارونیان بینی:

﴿ قَالَ الَّذِينَ يُرِيدُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا يَا لَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَا أُوتِيَ قَارُونُ إِنَّهُ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئارەزۆیان لە ژیان و خۆشی جهانبو ووتیان: ئەی کاشکایە بۆ ئێمەیش هەبوایە بەوێنەی شتێ بەخشراوە بە قارون. قارون خاوەنی بەشێکی گەورەیە لە جیهاندا و زۆر بەختیارە.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەو تۆ بەخشرابو بەوان زانینێ چاك و خراپ جوێ بکەنەوە وتیان: هاوار و نەمان بۆ ئێوە کە ئاواتی وا ئەخوازن پاداشتی خوای مەزن چاکترە بۆ کەسێ باوەڕی هێنابێ بەخوای مەزن و کردەوەی چاکی کردبێ و ناگا بەو پاداشتەی خوای مەزن مەگەر کەسانێ ئارامیان گرتبێ لەسەر پەرستنی خوای مەزن و لەسەر ئازاری فیرعەون و قارون و تاقمەکانیان.

بۆ ئاگاداری: خوای مەزن زەکاتی پێویست کرد لەسەر موسا و بەنوئیسرائیلییەکان، بەو بۆنەوە ڕۆژێ موسا چو بۆلای قارون و داوای لێکرد زەکاتی دارایی خۆی دەربکا و بدرێ بە

هەژاران. قارون وتی: من ئامادەم بۆ دەرکردنی زەکات. بەلآم لە دەرونی خۆیا رِقی زۆرتر لە موسا پەیداکرد، بەو کەسانەی وت: دوای موسا کەوتبون: ئایا من بە ئێوەم نەووت: موسا داوای پلەوپایەی بەرز و رابواردن ئەکا. ئەوەتە ئێستا هاتووە بۆلای من و هەندێ لە مەبەستی خۆی ئاشکرا کرد، داوای سەرانەمان لێ ئەکا، دەستەو بەستەی قارون ووتیان: هەتاکەی بێدەنگبین لەم کارانەی موسا؟ قارون و تاقمەکەی پیلانێکی زۆر بێشەرمانەیان بۆ موسا ساختە هێنا، بۆ ئەو مەبەستە ژنێکی بەناوبانگی رەوشت نزم هەبو بانگیان کرد لە کاتی پێویستا فەرمانیان پێدا بلێ: موسا داوێنپیسی لەگەڵ مندا کردوە. قارون بۆ ئەو مەبەستە خراپەی خۆی بەبێ ئاگاداری فیرعەون و تاقمەکەی خۆی لە جێگەیەکا کۆکردەوە، موسا و باوەڕداران ئامادەی ئەو کۆڕەبوون بە ئامادەبوونی قارون و تاقمەکەی؛ بۆ ئەوەی ئەو پیلانە نیشانی دانیشتووان بدا، موسا دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنیان و باسی ئەو شتانەی خوای مەزن قەدەغە کردوون، قارون پرسیاری لە موساکرد، تۆڵەی مرۆڤێ داوێن پیسی لەگەڵ ژنێکا بکا چ شتێکە؟ موسا وتی: پێویستە بەردەباران بکرێ هەتا ئەمرێ. قارون ووتی: با ئەو کەسەیش تۆ بی؟ موسا فەرموی: بامنیشبم، فەرمانی خوای مەزن ناگۆڕێ بۆ هیچ کەسێ. قارون بەڕوی گەشەوە ووتی: بلآوبوەتەوە بەناو دانیشتوانا کە تۆ لەگەڵ فلآن ژنی رەوشت خراپا داوێن پیسیت کردوە، موسا فەرمووی: ئەو ژنە بهێنین، هێنایان ووتی: ئەمە ئەو ژنەیە، موسا بۆی دەرکەوت ئەو کارە پیلانە بۆ ئەو دروستکراوە، موسا لە خوای مەزن پاڕایەوە گفتوگۆی راست بخاتە دەروونی ئەو ژنە، ژنەکە هاتە پێشەوە و لەش و دەستی هاتە لەرزین و وتی: موسا کاری وا خراپی لەگەڵ مندا نەکردوە. بەلآم قارون دارایی زۆری بەمنداوە بوختان بکەم بە موسادا و موسا پاکەو راستی بۆ دانیشتووان دەرکەوت. قارون و تاقمەکەی بەشەرمەزارییەوە چونە دەرەوە، موسا داوای لە خوای مەزن کرد تۆڵە لە قارون بسێنێ، خوا نزاکەی وەرگرت. ئەفەرموێ:

﴿ فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ ﴾ دوایی ئێمە قارونمان بەخۆی و بەکۆشکیەوە بردە خوارەوە بە زەویدا و هەموویان مردن و لەناوچون.

﴿ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُنتَصِرِينَ ﴾ دوایی هیچ تاقمێ نەبو یارمەتی قارون بدا و رزگاری بکا لە جگەی خوای مەزن و قارون لەوکەسانە نەبو بتوانێ تۆڵەی خۆی لە موسا بکاتەوە.

﴿ وَأَصْبَحَ الَّذِينَ تَمَنَّوْا مَكَانَهُ بِالْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ دوێنێ ئاواتیان ئەخواست لە جێگەی قارون بونایە و وێنەی ئەوەی درایو بۆ ئەویش ببوایە گەڕان بەوەی پەشیمان بنەوە و ئەیان ووت ئەی هاوار ئێوە پەشیمانبینەوە، من بڕوام وایە کە خوای مەزن دارایی و سامان زۆر ئەکا بۆ کەسێ ئارەزۆی هەبێ لە بەندەکانی خۆی و کەم ئەدا بە کەسێ ئارەزۆی هەبێ.

﴿ لَوْلَا أَن مَّنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾ مەگەر خوای مەزن چاکەی خۆی نەدایە بەسەر ئێمەدا و ئێمەیش وەك قارون بوینایە لە ساماندا ریدا بە راستی خوا ئێمەی

بەخۆمان بەدارایمانەوە ئەبرد بەزەویدا بە وێنەی قارون لە ناو ئەچوین، ئەی هاوار ئێوە پەشیمان بنەوە، من بڕوام هەیە. بەڕاستی بێباوەڕان ڕزگاریان تابێ لە سزای ڕۆژی دوایی سزای جیهان.

تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ مَن جَاءَ بِالْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَىٰ إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَافِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ آيَاتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَادْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ ۘ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ۚ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾

﴿ تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ ئەو جێگە و کۆشکەی ڕۆژی دوایی و ئەو بەهەشتە ئێمە دروستمان کردوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە، خۆیان بەگەورە دانانێن و خراپە بڵاونەکردنەوە لە زەوی‌دا ناکەن و خۆیان نابەنە پێشەوە بۆلای کاربەدەستانی ستەمکار و، دوارۆژی چاك بۆ ئەو کەسانەیە لە خوای مەزن ئەترسن و خۆیان بێ فەرمانی خوا ئەپارێزن.

﴿ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا ﴾ هەرکەسێ بڕوا بۆ خزمەت خوای مەزن لە ڕۆژیدواییدا بەکردەوەی چاکەوە دوایی جگە لەو چاکەیە بۆ ئەو کەسە هەیە پاداشتی چاکتری هەتا ئەگاتە حەوت سەد چەندانەو ئەچێتە بەهەشت.

﴿ وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە هەرکەسێ بچێ بۆلای خوای مەزن و دادپەروەر لە ڕۆژی دواییدا بەکردەوەیەکی خراپەوە، دوایی ئەو کەسە پاداشتی نادرێتەوە مەگەر هەر بە شتێ ئەیکەن.

﴿ إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ ﴾ بە ڕاستی کەسێ پێویستی کردوە لەسەر تۆ خوێندنی قورئان و کارکردن بە قورئان و ڕاگەیاندنی بە ئادەمیزاد تۆ ئەگێڕێتەوە بۆلای ئەو مەکەیە تۆ لێی دەرچووی و کۆچت کردووە. زانایان ئەڵێن: کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە مەکەوە دەرچو لە ڕێگەدا بیری لە نیشتمانی خۆی ئەکردەوە، خوای مەزن مژدەی دایە بەو ئایەتە پیرۆزە.

﴿ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ مَن جَاء بِالْهُدَى وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ تۆ بلێ پەروەردگاری من زاناترە بەکەسێ بەشتێکەوە هاتبێ ئادەمیزاد ڕانومایی بکا بۆلای کاری چاك و بەکەسێ لە گومڕایی ئاشکرادا بێ و بەردەوامبێ لەسەر بتپەرستی و بێفەرمانی خوای مەزن.

هەندێ لە ئادەمیزادی دانیشتوانی مەك بە پێغەمبەریان ووت: تۆ پێغەمبەرنیت. بەڵکە بوختان بەخوادا ئەکەی خوای مەزن وولامی دانەوە و فەرمووی:

﴿ وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَى إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَافِرِينَ ﴾ وەتۆ بەتۆ بە ئومێدی ئەوە نەبوبێ بەنێرێنە خوارەوە و بۆلای تۆ نامەی خوا و بە دڵپشتانە هاتوە بەڵام ناردنە خوارەوەی ئەو نامەیە بۆلای تۆ چاکە و ڕێزگرتنێکی گەورە بو بۆ تۆ لە لایەن پەروەردگاری تۆو، دووایی تۆ مەبە بەر پشتیوان و یاریدەدەر بۆ بێباوەڕان، لە تانە و توانجیان مەترسە، لە هەمو کار و گوفتار تا نیازت پاکبێ لەگەڵ خوای مەزندا.

﴿ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ آيَاتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ﴾ وە بێباوەڕان ڕێگە لەتۆ ئەگرن کە کار بە ئایەتەکانی خوای مەزن بکەی لە دوای ئەوەی ئەو ئایەتانە نێرراون بۆلای تۆ.

﴿ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ ﴾ وە تۆ بانگی ئادەمیزاد بۆلای پەرستن و یەکێتی خوای مەزن وە تۆ لەگەڵ بیروباوەڕی بت پەرستانا مەبە و هیچ خوایەکی تر مەپەرستە لەگەڵ خوای مەزندا.

﴿ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ هیچ خوایە نی‌یە شایەنی پەرستنبێ مەگەر هەر خوای مەزن شایانی پەرستنە، هەمو شتێ لە بونەوەران لەناو ئەچێ مەگەر هەر خوای مەزن ئەمێنێ. هەر بۆ خوایە فەرماندان و بەڕێوەبردنی هەموو بونەوەرا بەهەر جۆرێ ئارەزۆی بنەرمۆی و هەر بۆلای خوایش ئێوە ئەگێڕێنەوە و لە پاشەڕۆژدا.

بۆ ئاگاداری: ئەو سێ ئایەتانەی پێشوو هەرچەندە ڕویان پێ‌کراوە بۆلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾. بەڵام لە ناوەڕۆکدا مەبەستەکەیان هەمو موسوڵمانانە. بە تایبەتی زانایانی ئایینی و کاربەدەستان. بێگومان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ یاریدەی بێ باوەڕان نادا و کەمتەرخەمی ناکا بۆ گەیاندنی فەرمانەکانی خوای مەزن.

# ﴿ سورەتی ئەلعەنكەبوت ﴾

لەمەكە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایاتی (١) هەتا ئایەتی (١١) لە مەدینە هاتوەنە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەكانی (٦٩) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾

## ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿الم﴾ مانای ئەو پیتانە لـە لـە سەرەتای سورەتی ئەلبەقەرە و ئالی عیمران و سورەتەكانی تردا باسیان كراوە.

بۆ زانین: خوای گەورە لـەم ئایەتانەی دواییدا بۆمان ڕوون ئەكاتەوە كە باوەڕهێنـــان ووشـە نیە بە تەنها بیێژرێ. بـــەڵكو پێویستە خـاوەن باوەڕەكـان تـاقی بكرێنـەوە: لـەكاتی خۆشـی و ناخۆشیدا. لەكاتی گرانی و هەرزانیدا. لە كاتی ئاشتی و جەنگدا، دوایی ئەگەر ئارامیان گرت و لـە ئایین دەرنەچون و سوپاسی خوایان كرد لـە هەمو ئەو كاتانەدا و پلەوپایە و سامان سـەری لێ تێك نەدات. بە ڕاستی ئەو كاتە باوەڕداری ڕاستەقینەن. ئەگەر بەو جۆرە لـە تاقی كردنـەوەدا دەرنەچون باوەڕهێنان بە تەنها سودیان پـێ نابەخشـێ، ئێمـەی موسـڵمان پێویسـتە پێغەمبـەر و هاوڕێكانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بكـەین بـە چـاولێكراوی خۆمـان. ئـەوەبو لـە مەكـە دەركـران و هەندێكیان كوژران و بەبێ سامانی كۆچیان كرد بۆ مەدینە وازیان لـە باوەڕهێنان بە خوای مەزن نەهێنا. خوای مەزن لەو بارەوە فەرموی:

﴿ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴾ ئایـا ئـادەمیزاد گومـان ئەبـەن وازیان لێئەهێنرێ كە ئەوان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە و ئەوان تاقی نەكرێنەوە بەهەرشتێ: لـە ئازاردانیان و وازهێنانیـــان لــە ئـارەزووی دەروونیـان. بـە هـەژاری و سـامانداری، بـەگرانی و هەرزانی، ئەگەر تاقیكرانەوە و بەهەمو جۆرێ ئارامیان گرت و بێفەرمانی خوای مەزنیان نەكرد و سوپاسی خوایان كرد بە ڕاستی باوەڕدارن. تاقیكردنەوە تایبەت نیيە بۆ موسـڵمانان. بـەڵكو یاسای خوای مەزنە بۆ نەتەوەكانی پێغەمبەرەكانی تر. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ و بەڕاستی ئێمە تاقیمان كردەوە نەتەوەكانی ئـەوتۆ لــە پێش ئەو كەسانە باوەڕیان بە موحەمەد هێناوە، ئەوان خاوەنی ئارامبوون لە كاتی خۆشی و ناخۆشی و لە كاتی ئازاردان، بە نیازی چاكەوە فەرمانی خوایان بەجێ ئەهێنا و باوەڕیان بە پێغەمبەر ئەهێنا.

﴿ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴾ دوایی بە ڕاستی خوای مـەزن ئـەزانێ بـە كەسانێكی ئەوتۆ ڕاستیان كردووە لـە باوەڕهێنانیان ئەزانێ بە كەسانێكی ئەوتۆ درۆیان كـردووە لە باوەڕهێناندا، تاقیكراونەتەوە لـە كاتێكا خاوەنی سامان و پلەوپایە بوون، هەیان بـوە ڕاست وێژ و كردەوە چاك بوون، هەیشیان بوە درۆزن و خراپەكارو بـێ فـەرمانی خوایـان كردبـو لـە جیهاندا.

﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ ئایـا كەسـانێكی ئـەوتۆ خراپەكان ئەكەن لـە بت پەرستی و گوناهانی تر گومان ئەبەن كە ڕزگاریان ببێ لـە سزای ئێمەو توانامان نیە تۆڵەیان لێبكەینەوە، ئەو گومانەی ئەوان خـراپ شـتێكە فـەرمانی پـێ ئـەدەن كـە ڕزگاریان ئەبێ لـە سزای ئێمە. ئێمە توانامان بەسەر هەموو شتێكا هەیە و تۆڵەیان لێ ئەسنرێ.

﴿ مَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ هەرکەسێ بە ئومێدی پاداشتی خوای مەزنبێ لە ڕۆژی دواییدا، دوایی بە ڕاستی ئەو کاتەی خوای مەزن دیاری‌کردوە بۆ پرسیار و پاداشت پێویستە ئەبێ بێت وە خوای مەزن گوفتاری ئادەمیزاد ئەبیستێ، ئەزانێ بەشتێ لە دڵیایەتی.

﴿ وَمَن جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴾ وە هەرکەسێ تێبکۆشێ بۆ کردنی چاکە و دژی خراپەکردنێ، دوایی بەڕاستی ئەو هەر بۆ سودی خۆی تێئەکۆشێ. بە ڕاستی خوای مەزن پێویستی بە پەرستنی هەموو بونەوەران نی‌یە و سودی بۆ خوای مەزن نی‌یە، گوناهیان زیان بە خوا ناگەیەنێ.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانی کردوە بە ڕاستی ئێمە خراپەکانی ئەشۆرینەوە و لە گوناهەکانی خۆش ئەبین.

﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە پاداشتی ئەو کەسانە ئەدەینەوە بە چاکتر و زۆرتر لە پاداشتی شتێکی ئەوتۆ ئەیکەن، هەتا حەوت سەد چەنانە و بگرە زۆرتریش ئەڕوا.

﴿ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ وە ئێمە فەرمان ئەدەین بە ئادەمیزاد کە هەمو چاکەیە بەکاربهێنن لەگەڵ باوك و دایکیان و، ئەگەر باوك و دایکی تۆ هەوڵیان ئەدا بۆ ئەوەی کە بکەی هاوبەش بۆ من لە پەرستندا شتێ تۆ بزانی ئەو شتە شایستەی خوایەتی و پەرستن نیە، دوایی پەیڕەوی دایك و باوکت مەکە لەو شتەدا و بێ فەرمانی ئەوان بکە.

﴿ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ هەر بۆلای منە گەڕانەوەی ئێوە هەمووتان، دوایی من هەواڵ ئەدەم بە ئێوە بە شتێ ئێوە ئەیکەن لە چاك و لە خراپ و پاداشتان ئەدەمەوە.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانێن کردووە بە ڕاستی ئێمە ئەوان ئەخەینە بەهەشت لەگەڵ پیاوچاکان.

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِى صُدُورِ ٱلْعَٰلَمِينَ

وَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبِعُوا۟ سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ ۖ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٣﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤﴾ ﴿١٥﴾

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّـهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّـهِ ﴾ وە هەندێ لـە ئادەمیزاد هەن كەسێ ئەڵێ: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە خوای مەزن، بەڵام كاتێ ئازاری درا لـە لایەن بێباوەڕانەوە بەهۆی باوەڕهێنانیەوە توشی ئازاربو، ئەو خەفەت و ئازارە توشی ئەو كەسە ئەبێ بە وێنەی سزایە دای ئەنێ توشی ببێ لـە سزای خوای مەزن كاتێ سزابدرێ، سزادانی ئەوان ئەگێڕێ بە وێنەی سزای خوای مەزن. سەرگەردان ئەبێ و ئەڵێ : ئەگەر باوەڕ ئەهێنم توشی سزای بێباوەڕان ئەبم، ئەگەر باوەڕ ناهێنم توشی سزای خوا ئەبم.

﴿ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ ﴾ وە ئەگەر یاریدان و سەركەوتن بهاتایـە لـەلای پەروەردگاری تۆ و بۆ موسڵمانان بە ڕاستی ئەو كەسانە ئەڵێن: ئێمە لـەگەڵ ئێوەدابوین و باوەڕمان هێناوە لـەبەر ئەوەی ببین بە هاوبەشی دەستكەوت لـەگەڵ موسڵماناندا.

﴿ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ ﴾ ئایا خوای مەزن زاناتر نیە بە شتێ لە دڵی هەمو بونەوەراندایە لە دوورِوی و فێڵ باوەڕهێنان بە خوا و بە ئایینی ئیسلام؟

﴿ وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ ﴾ و بەڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بە کەسانێکی ئەوتۆ بە ڕاستی باوەڕیان هێناوە و ئەزانێ بەو کەسانە دووڕون و بە زمان باوەڕیان هێناوە نەك بە دڵ.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ئەڵێن بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە: ئێوە دوای ڕێگەی ئایینی ئێمە بکەون واز لە ئایینی موحەممەد بهێنن و ئێمە لە جیاتی ئێوە سزای گوناهەکانی ئێوە هەڵئەگرین ئەگەر ئەو سزایە ڕاستبێ.

﴿ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾ وە ئەو بێباوەڕانە هیچ شتێ لە سزای گوناهی باوەڕدان هەڵناگرن. بە ڕاستی بێباوەڕان درۆ ئەکەن لە گوفتاری خۆیانا و بە گوناهی خۆیانەوە خەریك ئەبن و ئاگایان لەکەسی تر نابێ لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾ وە بەڕاستی بێباوەڕان هەڵئەگرن باری گرانی سزای خۆیان و بەرپرسیارن لەسەر گوناهی خۆیان و هەڵئەگرن چەند بارێ تری گرانی سزای ئەو کەسانە ئەمان لە ڕێگە لایانداون و لەگەڵ بارەگرانەکەی سزای گوناهی خۆیان، بێ ئەوەی لە سزای گوناهی ئەو کەسانە کەم بێتەوەئەمان لە ڕێگەی ڕاست لایانداون و دوای ئەمان کەوتوون.

﴿ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ وە بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا پرسیار لە بێ باوەڕیان ئەکرێ بەسەرۆك کۆمار ژێردەستەکانیانەوە لە شتێ خۆیان دروستیان کردوە لە بوختان و درۆ.

خوای مەزن دڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوە و ئەفەرموێ: زۆر ڕاستە تۆ و باوەڕداران توشی ئازاربوون. بەڵام گەلانی ڕابردوویش ئازاری پێغەمبەرەکانی خۆیان و باوەڕدارانیانداوە و ئەوان ئارامیان گرتوە. کەواتە ئێوەیش ئارامبگرن وەك ئەوان، ئێمە تاقمی بێباوەڕانی ئەو پێغەمبەرانەمان بە تۆڵەی خۆیان گەیاند، قوڕەیشیەکانیش بەتۆڵەی خۆیان ئەگەن، وەك خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾ وە بەڕاستی ئێمە نوحمان ڕەوانەکرد بۆلای تاقمەکەی خۆی، دوایی نوح لە نێو تاقمەکەی خۆیا مایەوە هەزار ساڵ جگە لە پەنجا ساڵ، داوای لێکردن واز لەبت پەرستی بهێنن و خوای مەزن بەتەنها بپەرستن.

پ ـــ لەبەر چ شتێ خوای مەزن نەیفەرمووە ﴿ تسعماة وخَمْسِينَ عَامًا ﴾ لەگەڵ ئەویشدا کەمترە ﴿ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾ بە دوو وشە؟

و ـــ لەبەر دوو سودی زۆر گەورە خوای مەزن بەو جۆرەی فەرمووە:

١- ئەگەر ببێژرایە ﴿ تسعمأة و خَمْسِينَ ﴾ لەوانە بو گومان ببرێ بۆ مانەوەی نوح نزیکەی نۆسەدو یەنجا سالْێ بە کەمتر یا بە زۆرتر. بەلاّم ﴿ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا ﴾ ئەوەمان نیشـان ئەدا بەهۆی ووشەی ﴿ إلا ﴾ نۆسەد و پەنجا سالْ ماوەتەوە بەبێ زۆر و بەبێ کەم.

٢- خوای مەزن بۆ یەکەم جار ژمارەی هەزار کە گەورەترین برِگەی ژمارەکانـە ئاراسـتەی کۆپچکەی پێغەمبەری ئەکا، هەتا سەرنجی پێغەمبەر راکێشێ بۆلای ئەوە کە نوح ئەو مـاوە زۆرە ماوەتەوە لەناو تاقمەکەیا بۆ ئامۆژگاری کردنیان. کەواتە تۆیش دلْگران مەبە ئەم ماوەکەمە لـە ناو قورِیشییەاکاندا ماویتەوە.

بۆ زانین: خوای مەزن تەمەنی نوحی دیاری نەکردوە چەند سـالْ ژیـاوە. بـەلاّم ئـەو شـتەی گومانی نەبێ نوح کەمتر لە (٩٥٠) سالْ تەمەنی کەمتر نەبوە بە دەقی فەرمودەی خوای مـەزن. زانایان بیروبۆچونی زۆر جیاوازیان هەیە لەبارەی تەمەنی نوحەوە و لەکاتی کردنی بە پێغەمبەر و لەکاتی پەیدابوونی لافاودا . هەندێ لە زانایان ئەلْێن: نـوح (١٠٥٠) سـالْ ژیـاوە، لەتەمـەنی (٤٠) سالْی‌دا کراوە بە پێغەمبەر و (٦٠) سالْ دووای لافاو ژیاوە. هەندێ لایان وایــە تەمـەنی نوح (١٤٠٠) سالْ بوە، هەندێ تر فەرمویانـە: تەمـەنی نـوح (٩٥٠) سـالْ بـوە، لـە تەمـەنی (٦٠٠) سالْیدا لافاوەکە پەیدابووە، لەدوای لافاو (٣٥٠) سالْ ژیـاوە. ئـەم بۆچونـەی دوایـی بەگوێرەی فەرمودەی خوای مەزن گومانی تێدا نی‌یـە. نـوح کـورِی (لمك) کـورِی (متوشلـغ) کورِی (أضوخ) کورِی (إليارد) کورِی (مهلائيل) کورِی (قينان) کورِی (أنوش) کورِی (شـيت) کورِی (ادم). نوح سێ کوری هەبوە، ناویان : (سام، حام ، یافث) نوح بەمانا خۆشیە. (الراحة).

﴿ فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ ﴾ دوایی ناوی زۆر ئەو تاقمەی نوحـی لـە نـاوبرد و ئـەو تاقمە ستەمیان لە خۆیان کرد و باوەریان نەهێنا و وازیان لەبت پەرستی نەهێنا.

﴿ فَأَنجَيْنَاهُ وَأَصْحَـابَ السَّفِينَةِ وَجَعَلْنَاهَـا آيَـةً لِّلْعَـالَمِينَ ﴾ دوایـی ئێمـە نـوح و دانیشـتوانی کەشتیەکەمان رزگارکرد و ئێمە ئەو کەشتیەمان گێرا بە نیشانەیەکی ئاشکرای زۆر گــەورە بـۆ هەمو بونەوەران بۆ تەمێ و پەندوەرگرتن.

وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ

وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾

﴿ وإبْرَاهِيمَ إذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ وە تۆ بیری ئیبراهیم بکەرەوە کاتێ بەتاقمەکەی خۆی ووت: پێویستە خوای مەزن بپەرستن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوای مەزن، پەرستن و لەخواترسان و خۆپاراستن لەبێ فەرمانی بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر ئێوە بزانن و چاك و خراپ جوێ بکەنەوە لە یەکتری.

﴿ إنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا وَتَخْلُقُونَ إفْكًا﴾ بە ڕاستی ئێوە ئەو بتانە ئەپەرستن لە جگەی خوای مەزن ئەو بتانەی ئەوتۆن خۆتان لە درەخت و لەبەرد دروستیان ئەکەن و بەدرۆ و بوختان ئێوە ئەیان پەرستن و گوناهەکەی و سزاکەی بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە، بە جۆرێکی نارەوا خۆتان ناوتان ناون خوا.

﴿ إنَّ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا ﴾ بە ڕاستی ئەو شتانەی ئەوتۆ ئەیان پەرستن لە جگەی خوای مەزن خاونیئەونین خواردەمەنی بدەن بە ئێوە و ئێوە بەخێوبکەن ، توانای ئەوەیان نیيە سود بە ئێوە و بەخۆیان ببەخشن و ئازار لە خۆیان و لە ئێوە دووربخەنەوە، ئیتر ئێوە چۆنیان ئەپەرستن.

﴿ فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ إلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ دوایی ئێوە پێویستە ئێوە داوای خواردەمەنی هەر لەلای خوای مەزن داوا بکەن و هەر خواپەرستن و سوپاسی خوای مەزن بکەن، ئێوە هەر بۆلای خوای مەزن ئەگەڕێنەوە بۆ پاداشت وەرگرتن لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَإن تُكَذِّبُوا فَقَدْ كَذَّبَ أمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾ وە ئەگەر ئێوەی دانیشتوانی مەکە موحەمەد بەدرۆبخەنەوە و باوەڕی پێ نەکەن، دوایی بە ڕاستی چەندین نەتەوە لە پێش ئێوەوە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستۆتەوە و، هیچ شتێ لە نێرراوی خوا نیە مەگەر ڕاگەیاندنی ئاشکرای پەیامی خوای مەزن بە ئادەمیزاد بە تایبەتی ئێوەی دانیشتوانی بابول لە نێوان ڕووبارەکانی دیجلە و فورات.

بۆ زانین: ئیبراهیم کوڕی تاریخ کوڕی سام کوڕی نوح، دانیشتوانی یەکێك بوە لە شارەکانی نێوان دیجلە و فورات، دوای (٧٥) ساڵ لە تەمەنی لەگەڵ سارا خاتوونی ژنی و لوتی برازای کۆچیان کردوەبۆلای نیشتمانی کەنعانیەکان. بە پێی مێژووی (أثر) بەر لە (١٩٩٦) ساڵ بەر لە دایکبوونی عیسا ژیاوە.

أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ
يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١٩﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ
مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ
وَلَا نَصِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ
أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٣﴾
فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقۡتُلُوهُ أَوۡ حَرِّقُوهُ
فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ
﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ
فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم
بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٞۘ وَقَالَ
إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبۡنَا

لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَجۡرَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ ئایا ئادەمیزاد بە گشتی و دانیشتوانی مەکە بە تایبەتی نەیان زانیوە خوای مەزن بە چ جۆرێ بۆ یەکەم جار ئاشکرای کردووە هەمو بونەوەران لە ئاسمانەکان و زەوی و ئادەمیزاد و فریشتە و جنۆکە و گیاندارانی جۆراوجۆر و ڕووەکەکان لە نەبونەوە هێناونی‌یە بونەوە، لەپاشا خوا دوای نەمانیان ئەیانگێڕێتەوە بۆلای خۆی بە ژیانێکی تازەو گیان ئەکاتەوە بەبەری هەمویانا و زیندویان ئەکاتەوە. کەواتە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بۆ کەسانێ گومانیان بێ بە زیندوبونەوە: دوایی ئەوەی بە چاوی خۆیان ئەو دروست کراوانەی پێشوو ببینێ . بە ڕاستی گەڕانەوەی دروستکراوان بۆلای ژیانێکی تازەتر و گیان بکاتەوە بە بەریانا لەسەر خوای مەزن ئاسانترە؛ چونکە کەسێ بتوانێ بەبێ شتێکی دیاریکراو بوونەوەران لە نەبوونەوە دروست بکا زۆر ئاسانە بۆی لەسەر ئەندامە ڕزیوەکانی جارێ تر دروستیان بکاتەوە.

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ﴾ تۆ بڵێ بەبێباوەڕان: ئێوە بڕۆن و بگەڕێن بە زەویدا، دوایی تەماشا بکەن چۆن خوای مەزن یەکەم جار بونەوەرانی دروستکرد وە هێناونیەتە بوونەوە.

﴿ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ لە پاشا خوای مەزن دوای دروستکردنی یەکەم جارێ تر پەیدا ئەکا دروستکردنێکی تر، هەموو بونەوەران زیندوو ئەکاتەوەلە ڕۆژی دواییدا، بە ڕاستی خوای مەزن توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە، بە تایبەتی ئاسانترە لای مردووەکان زیندوو بکاتەوە بە وێنەی ژیانی جیهان.

﴿ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَاءُ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴾ خوای مەزن سزای کەسێ ئەدا ئارەزۆی بکا و ئەبەخشێ بە میهرەبانی خۆی هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ و شایستە لێبوردنبێ و بۆلای خوای مەزن ئێوە ئەگەڕێنەوە لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ وە ئێوە و هەموو کەسێ ناتوانن ڕێگە بگرن لە خوای مەزن بۆ هەرشتێ بیەوێ نە لە زەویدا و نە لە ئاسمانا و بۆ ئێوە نییە هیچ بەڕێوەبەرێ و هیچ کەسێ یارمەتیتان بدا و سزاتان لێ دوربخاتەوە ئەگەر خوای مەزن بییەوێ سزاتان بدا.

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَلِقَائِهِ أُولَئِكَ يَئِسُوا مِن رَّحْمَتِي وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەکارە پەك خەرەکانی خوای مەزن و باوەڕی بە زیندووبونەوە و پاداشت و سزا نییە لە دوارۆژدا، ئەو کەسانە بێ ئومێدبوون لە بەزەیی و میهرەبانی من و ناچنە بەهەشت و بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی ئازاردارە.

خوای مەزن بۆ جارێ تر دەست ئەکاتەوە و باسی باسی ئیبراهیم و بەباسی کۆتایی و بەسەرهاتی خۆی و گەلەکەیی و ئەفەرموێ:

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا اقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ ﴾ دوایی کاتێ تاقمی ئیبراهیم ئەو ئامۆژگارییەی ئیبراهیمیان بیست وولامی ئیبراهیمیان نەدایەوە بە هیچ جۆرێ مەگەر وتیان ئیبراهیم بکوژن یا بیسوتێنن، لەپاش ڕاوێژکردنیان بیریان هاتە سەر ئەوە کە ئیبراهیم بسوتێنن، بۆ ئەو مەبەستە چاڵێکی قوڵیان دروستکرد و پڕیان کرد لە سوتەمەنی و ئاگریان تێبەردا و ئیبراهیمیان تێفڕەدا.

﴿ فَأَنجَاهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ دوایی خوای مەزن ئیبراهیمی ڕزگارکرد لە ئازار و سوتانی ئەو ئاگرە. بە ڕاستی لە ڕزگارکردنی ئیبراهیما چەندین نیشانەی ڕوون و کاری پەك خەر هەیە بۆ تاقمێ باوەڕ بەتوانای خوای مەزن و ڕزگارکردنی ئیبراهیم بهێنن.

بێگومان ئەگەر ستەم لێکراوان لە دژی ستەمکاران ڕاپەڕن بۆ ڕزگارکردنی خۆیان، ستەمکاران ترسیان پەیداکرد لەسەر نەمانی پلەوپایە و سامانی خۆیان هیچ شتێکیان بەدەستەوە نەما، دوایی فەرمان ئەدەن بەکرێگیراوانی خۆیان ئەو کەسانەی لە دژیان ڕاپەڕیون بەندیان بکەن و سزایان بدەن و سامانیان داگیربکەن، خانوویان بڕوخێنن، بیان کوژن، کیمیابارانیان بکەن، شتی تری خراپتر.

﴿ وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾ وە ئیبراهیم فەرموی: بە ڕاستی ئێوە ئەو بتانەتان وەرگرتووە بە خوای خۆتان لە جگەی خوای مەزن و ڕێزی پەرستنی ئەوان ئەدەن بەسەر پەرستنی خوادا، پەرستنی ئەوانتان کردوە بەهۆی ڕاوەستانی خۆشەویستی نێوان خۆتانا لە ژیانی جیهاندا و بەردەوامبونی پلەوپایە و سامانی خۆتان.

﴿ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا ﴾ لە پاشا لە ڕۆژی دواییدا هەندێکتان بێزارن لە هەندێ ترتان: بتەکان بێزارن لە ئێوە، سەرۆکەکان بێزارن لە ژێردەستەکان و، هەندێکتان نەفرەت لە هەندێ ترتان ئەکەن. بە تایبەتی ژێردەستەکان نەفرەت لە پێشەواکانی خۆیان ئەکەن. بچوکی و خزمایەتی و دۆستایەتی نامێنێ لە نێوانتانا، هەریەکەتان ئەوانی ترتان تاوانبار ئەکەن.

﴿ وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ وە جێگەی گەڕانەوەی هەمووتان ئاگری دۆزەخە، لەو ڕۆژەدا بۆ ئێوە نیە هیچ کەسێ، یارمەتیتان بدا و ڕزگارتان بکا لە ئاگری دۆزەخ.

ئیبراهیم بەردەوام بو لەسەر گەیاندنی پەیامی خـوای مـەزن، لوتـی بـرازای ئیـبراهیم کاتـێ ئیبراهیمیان خستە ناو ئاگر چاوی بە ئیبراهیم کەوت هیچ جێگەیە لە لەشی نەسووتابوو جگـەی ئاسنی پیونەکەی نەبێ کە سوتابو، لوت باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم هێننا، کاتـێ ئیـبراهیم ئومێدی بە باوەڕهێنانی تاقمەکەی نەما، بڕیاریدا خۆی و خاتون سـارای ژنـی و لوتـی بـرازای بەفەرمانی خوای مەزن کۆچ بکەن بۆ (حەران) لە باکوری خۆرهەلاتی حەلّەب لەسەر ڕێگـەی موسڵ و شام، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ دوایی لـوت بـاوەڕی بـە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم هێنا، فەرموی: بەڕاستی من کۆچ ئەکەم بۆ جێگەیە پەروەردگار فـەرمانی پێداوم بۆلایە بتوانم خواپەرستی تێدابکەم، بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر بەدەسـتەلاتە، هـەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆی دائەنێ، فەرماندان بۆ کۆچکردنـی مـن چاکـترە بـۆ ڕاگـەیاندنی فەرمانی خوای مەزن.

﴿ وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ﴾ وە ئێمـە بـە ئیبراهیمـان بەخشی ئیسحاقی کوڕی و یەعقوبی کوڕەزای و، ئێمە ئەو پێغەمبەرانەی لـە دوای ئیبراهیمـەوە دێن گێڕاندمان بەوەی لە ناو منالان و نەوەی ئەودابن و نامە پیرۆزەکانی خۆمانیـان بـۆ ڕەوانـە ئەکەین، زۆر ئاشکرایە لە پاش ئیبراهیم هەموو پێغەمبەرەکان لە پشتی ئیبراهیمن و نامـەیش بـۆ جگەی نەوەی ئیبراهیم نەنێرراوە پاش ئیبراهیم.

﴿ وَآتَيْنَاهُ أَجْرَهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴾ وە ئێمە بەخشـیمان بـە ئیـبراهیم پاداشتی کۆچ کردنەکەی و هەڵگرتنی باری قورسـی پێغەمبەرایەتییەکـەی لـە جیـهاندا بـەوەی باسی بەچاکە بکرێ و پێغەمبەرانیش هەر لە بنەماڵەی ئەوبن و بـە ڕاسـتی ئیـبراهیم لـە ڕیـزی پیاوچاکانە لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی چاکەکانی ئەدرێنێ.

وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ ﴾ وە تۆ بیری بەسەرهاتی لوت بکەرەوە کاتیێ بە تاقمەکەی خۆی ووت: بە ڕاستی ئێوەی دانیشتوی: (ئەلمۆئتەفیکات) کارێکی زۆر خراپ و بێزلێکراوە ئەکەن هیچ کەسێ لە بوونەوەرانی پێشی ئێوە نەکەوتوە بۆ ئەو کارە خراپە.

﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ ﴾ ئایا بە ڕاستی بۆ ئێوە ئەچنە لای پیاوان و کاری خراپیان لەگەڵدا ئەکەن و ڕێگە لە هاتوچۆکەران ئەگرن و بەفێڵ دارایی ئەوان داگیر ئەکەن و کاری خراپیشیان لەگەڵدا ئەکەن و لە جێگەی دانیشتن و ڕابواردنی خۆتانا کاری زۆر خراپ و بێزلێکراوە ئەکەن؟ . ئێوە خۆتان بپارێزن لەو کارە خراپانە و لە سزای خوای مەزن بترسن.

﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ دوایی تاقمەكەی لوت وولامی لوتیان نەدایەوە گوێیان نەدا بە ئامۆژگارییەكانی مەگەر بەوە نەبێ ووتیان: تۆ ئەو سزایەی خوای مەزن بهێنە بۆ سەر ئێمە ئەگەر تۆ لەو كەسانەی ڕاست بكەن لە گفتوگۆی خۆیانا.

﴿ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي عَلَى الْقَوْمِ الْمُفْسِدِينَ ﴾ لوت فەرموی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ من سەربخە بەسەر ئەم تاقمەدا خراپە بڵاو ئەكەن بە زەوی‌دا و ئەو كارە زۆر خراپانە ئەكەن.

﴿ وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى ﴾ وە كاتێ نێرراوەكانی ئێمە لە فریشتەكان چون بۆلای ئیبراهیم بەوەی موژدە بدەن بە ئیبراهیم خوای مەزن كوڕێكی پێ‌ئەبەخشێ بەناوی ئیسحاق و دوای ئەویش كوڕەزایە بە ناوی یەعقوب و ئەكرێن بە پێغەمبەر.

﴿ قَالُوا إِنَّا مُهْلِكُو أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا ظَالِمِينَ ﴾ نێراوەكانی خوای مەزن بە ئیبراهیمیان ووت: بە ڕاستی لەناوئەبەین بە دەستوری خوای مەزن دانیشتووانی ئەو گوندە كە پێی ئەوترێ سەدوم. بە ڕاستی دانیشتووانی ئەو گوندە تاقمێكی ستەمكارن و خراپترین شتێ ئەكەن لەگەڵ پیاوان.

﴿ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا قَالُوا نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ﴾ ئیبراهیم ئەو هەواڵەی زۆر لاكرانبو، بۆیە فەرموی: بەڕاستی لوت لە ناو ئەو گوندەدایە، فریشتەكان ووتیانك ئێمە زاناترین بەكەسێ لەو گوندەدایە و لەناویان ئەبەین ئەو لەناوبراوانە ئەبێ بێ‌باوەڕبن و لەو ستەمكارانە نەبن.

﴿ لَنُنَجِّيَنَّهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴾ بەڕاستی لوت و خێزانەكانی لوت ڕزگار ئەكەین و ئەوانەی لەگەڵ لوتن و باوەڕیان هێناوە جگەی ژنەكەی لوت لەو كەسانەیە ئەمێنێتەوە لەو گوندەدا و توشی سزائەبێ، چونكە یارمەتی ئەو تاقمە ستەمكارانەی داوە بۆ كردنی كاری خراپ.

﴿ وَلَمَّا أَن جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا ﴾ وە كاتێ كە فریشتە نێراوەكانی ئێمە بە دڵێكی گەش و ڕوێكی جوانەوە چون بۆلای لوت، چونیان لوتی خەفەتبار كردو بەچونی ئەوان توانای نەما و نەی ئەزانی چۆنیان ڕزگار بكا لە دەستی ئەو تاقمە ستەمكارانە و كاری خراپیان لەگەڵ نەكەن.

﴿ وَقَالُوا لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا امْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ ﴾ نێراوەكانی خوای مەزن بە لوتیان ووت: تۆ مەترسە و خەفەت مەخۆ: بەڕاستی ئێمە تۆ و خێزانی تۆ ڕزگار ئەكەین و ئەو تاقمە توانای خراپەیان لەگەڵ تۆ نابێ، جگە لە ژنەكەی تۆ و ئەوانە لەناوگوندەدا ئەمێننەوە لەگەڵ ئەو ستەمكارانە و شایستەی سزایە.

﴿ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾ بە ڕاستی ئێمە ئەهێنینە خوارەوە بە دەستوری خوای مەزن سزایەكی زۆر سەخت و خاوەن ئازار بەسەر دانیشتوانی ئەو گوندەدا لە ئاسمانەوە بەهۆی شتێكەوە ئەوان لە سنوور پێی دەرچوون و كاری خراپ لەگەڵ پیاوان ئەكەن و بەردەوامیشن لەسەری.

﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَا آيَةً بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە شوێنەواری ئاشكرا لە و گوندەدا بەجێ ئەهێڵین بۆ تاقمی خاوەنی ئەقڵبن و بیر لە بەسەرهاتی گەلانی ڕابوردو بكەنەوە و جگەی ئەوانیش تەمێ خواربن.

زۆر جێگەی داخە لەوانەیە ئەوە كارە بێزلێكراوە بكرێ. دوای هەزاران ساڵ ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا ئەو كارە خراپەی ڕەوا كردووە بە گوێرەی دەستوری دانراوی خۆیان، ئێمە بڕوای بێ گومانمان هەیە زوبێ یادرەنگ سزای خوای مەزن ئەڕژێ بەسەریانا و بەسەر جێگەكانی تریشدا ئەو كارە خراپەی تێدا ئەكرێ بە ئاشكرای و بەڕەوای دائەنێن.

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾

﴿ وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَارْجُوا الْيَوْمَ الْآخِرَ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ و ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای دانیشتووانی مەدەیەن برای ڕەگەزی خۆیان، دوایی شوعەیب بەوانی فەرموو: ئەی تاقمی من: پێویستە ئێوە پەرستن بۆ خوای مەزن بکەن و ئێوە پێویستە بە ئومێدی پاداشتی ڕۆژی دوایی بن، وە ئێوە خراپەکردنی زۆر لە زەویدا بلاوەکەنەوە و بەردەوام مەبن لەسەر بێفەرمانی خوای مەزن.

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ ﴾ دوایی دانیشتوانی مەدیەن شوعەیبیان بەدرۆ خستەوە دوایی شەوێ بومەلەرزەیەکی زۆر سەخت توشیانبوو بو بەهۆی لەناوبردنیان، دوایی ئەوان گەران بە مردوو لەناو خانووەکانی خۆیانا و لەسەر چۆك کەوتبون.

﴿ وَعَادًا وَثَمُودَ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَاكِنِهِمْ ﴾ وە تۆ بیری تاقمی عادی گەلی هود و سەمودی تاقمی صالح بکەرەوە کە پێغەمبەرەکانیان چون بۆلایان داوایان لێکردن باوەڕ بە خوا و بەرۆژی دوایی و بەزیندوبونەوە و پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ بهێنن، ئەو تاقمانە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بە درۆخستەوە و بەڕاستی ئاشکرایە بۆ ئێوە جێگەکانیان و ئێوە لە کاروانیدا ئەیان بینن کە لەناوچوون و بەهۆی بێفەرمانی خوای مەزنەوە.

﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَكَانُوا مُسْتَبْصِرِينَ ﴾ و شەیتان کردەوەی خۆیانیان بۆ ئەوان ڕازاندبووەوە بەردەوامبوون لەسەر بێباوەڕی و بێفەرمانی خوای مەزن، دوایی شەیتان ئەو تاقمانەی لە ڕێگەی ئایینی خوای مەزن لادا، وە ئەو تاقمانە ئەیانتوانی ورد ببنەوە و چاك وخراپیان بۆ دەربکەوێ. بەلام ئەوان بیریان نەئەکردەوە و بەدڵ تەماشای ڕاستیان نەئەکرد.

﴿ وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَلَقَدْ جَاءَهُم مُّوسَى بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ وە تۆ بیری قارون و فیرعەون و هامان بکەرەوە ئێمە لەناومان بردن، بەڕاستی موسا چو بۆلایان بە چەندین بەلگەی ئاشکرا و پەکخەر و بانگی کردن بۆلای ڕێگەی ڕاست.

﴿ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ ﴾ دوایی ئەوان داوای گەورەیی نارەوایان ئەکرد لە زەویدا و باوەڕیان نەهێنا و ئەوان ڕزگاریان نەبو لە سزای خوای مەزن.

﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ الْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ﴾ دوایی ئێمە ئەوانمان توشی سزاکرد بەهۆی ئەو گوناهەی خۆیانەوە، دوایی هەندێ لەوان کەسێ بوون ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان ڕەشەبایەکی زۆر بەهێز ئەیخستە سەریان بەرد و زیخ و ئەیکوشتن، وەك تاقمی هود و هەیانبو کەسێ سزامان بە دەنگێکی گەورە و مردن، وەك تاقمی سالح ، وە هەندێ تر لەوان کەسێ بو خۆی و کۆشکەکەمان بردنە خوارەوە بە زەویدا، وەك قارون و، هەندێ لەو کەسانەمان خنکاند بە ئاوی دەریا، وەك فیرعەون و هامان و تاقمی نوح.

﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ وە خوای مەزن ستەمی لەوان نەکردوە کە سزای ئەو تاقمانەی داوە بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە؛ چونکە باوەڕیان نەهێناوە و کاری خراپەیان کردووە.

مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ ۖ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾

﴿ مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا ﴾ وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ لە جگەی خوای مەزن چەندین خوایە وەرئەگرن بۆ خۆیان و ئەیانپەرستن و پشتیان پێ ئەبەستن یارمەتیان بدەن بە وێنەی جۆلایی کەرن خانویەك بۆ خۆی دروست ئەکا، زۆر تەنك و لاوازە و گەرما و سەرما ناگێڕێتەوە، هەروا ئەو بتانە سود و زیان بەوانە نابەخشن ئەیان پەرستن، ئەو بتانە وەك شتێك وان هەرنەبن، ئەو کەسانەی ئەیان پەرستن زۆر بێ‌ئەقڵن، لەهەردوو جیهان زیان لە خۆیان ئەدەن.

﴿ وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ وە بەڕاستی لاوازترین و بێنرخترینی هەمو خانویێ خانوی جولاییکەرەیە ئەگەر بت پەرستان بزانن پلەوپایەی جیهان نرخی بۆ دانانرێ ئەگەر نەکرێن بە بنچینەی خواپەرستی. کەواتە ئەگەر ئەو شتانە بکرێن بە پشتیوانی ڕاستی و دادپەروەری و مرۆڤایەتی و خواپەرستی ئەبنە هۆی گەشەکردن و زیندەگانی و ژیانی خۆش. لە لایە ترەوە ئەگەر زانستی ئەو شتانە بکرێن بەهۆی بێباوەڕی و بێ دادی و نامرۆڤایەتی و ستەم و دوژمنایەتی و جیاوازی وێنەی زانستن لەبەکارهێناندا ئەبنە هۆی ئازادی و چاکەیا ئەبنە هۆی کۆیلەیی و خراپە.

بە ڕاستی ئەو کەسانەی ئەوتۆ جگە خوای مەزن بکەن بە دۆست و بەڕێوەبەری خۆیان لە بت و جگەی بتەکان ئەوان و ئەو کەسانەیش دارایی و سامان و زانستی و پلەوپایەی خۆیان بەکاربهێنن بۆ خراپە و داگیرکردن و زەوتکردنی سەربەستی دانیشتوان و دەست بڕینیان هیچ جیاوازیان لەگەڵ بت پەرستانا نییە. وێنەی هەردوولایان وێنەی جۆلاییکەرەن کە خانوەکەی بەردەوامە ئەگەر باو شتێکی تری لێ پەیدا نەبێ لە کاتی پەیدابونی ئەواندا کەس نازانێ خانوەکەی چی بەسەر دێ. بەڕاستی بت پەرستان و دارایی پەرستان لە کاتی تەنگانەدا بت و دارایی ناگەنە فریایان، بگرە جاڵ جاڵۆکەرە زۆر ژیرترە لە بت پەرستان و جیهان پەرستان.چونکە بێچوی جاڵ جاڵۆکەرە لەیەکەم جاری بونیدا دەست ئەکا بە چنینی خانوەکەی خۆی و هەست ئەکا بەکەم هێزی خۆی و بێتوانایی بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی، پیلان ئەسازێنێ بۆ گرتنی مێش و مەگەز بۆ خواردەمەنی خۆی. بەڵام بتپەرستان ئەو هەستەیان نییە کارێ بکەن بۆ پەیداکردنی سودی خۆیان وێنەی ئەوان و وێنەی جاڵ جاڵۆکەرە، بتەکانیشیان لە خانوی جۆلاییکەرە لاوازترن و نە سودیان بۆ خۆیان هەیە و نە بۆبت پەرستان و نە زیانیان هەیە، وەك نەبون وان لە گەیاندنی سود و زیاندا، هەرکەسێ ئەو جۆرە شتانە بپەرستێ زۆر بێ ئەقڵ و نەفامە.

﴿ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ مِن شَيْءٍ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ بە ڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بە شتێ بت پەرستان ئەیپەرستن لە جگەی خوا لەهەر شتێ بێ بت بن یا دارابێ و پلەوپایە، ئەو شتانە لە کاتی تەنگانەدا ناگەنە فریایان و خوای مەزن زۆر بەدەستەڵاتە و خاوەن توانایە،هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لە پاداشت و تۆڵە.

﴿ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ ﴾ وە ئەو وێنانە لە قورئاندا هاتوون لە بارەی کردەوەی بێ باوەڕانەوە ئێمە ڕوونیان ئەکەینەوە بۆ ئادەمیزاد ئاگاداریان ئەکەنەوە بۆلای گەورەیی خوای مەزن و نازانن بەسودی ڕون کردنەوەی ئەو وێنانە مەگەر ئەو کەسانەی زانان و سودی هەمو شتێ تێئەگەن و سوودی لێ وەرئەگرن بۆ خۆیان و جگەی خۆیان.

﴿ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ﴾ خوای مەزن ئاسمانەکان و زەوی درستکردوە بە ڕاستی و خاوەن سود بەسەرسوڕهێنەرترین پەیرەو هەتا ئادەمیزادانی ژێر سودی لێ وەرگرن و تەمێ خواربین.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ بە ڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا بەو جۆرە سەرسوڕهێنەرانە هەیە بەڵگەی ئاشکرا و زۆر گەورە لەسەر توانای خوای مەزن بۆ باوەڕداران و تەمێ خواربن و سودی لێوەرگرن.

﴿ اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ ﴾ تۆ شتێ خوای مەزن ڕەوانەی کردوە بۆ سەرتۆ بەسروش لە نامەی خۆیا کە قورئانە بخوێنە بە جۆرێ بیزانی بیری لێ بکەیتەوە ڕای گەیەنە بە ئادەمیزاد.

﴿ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ﴾ وە تۆ نوێژەکان بەجێ بهێنە لە کاتی دیاریکراوی خۆیانا بەوجۆرەی فەرمانت پێدراوە بە کردنیان. بە ڕاستی نوێژ ڕێگە ئەگرێت لە کاری بێز لێکراوەی زۆرشتی ناڕەوا و لە هەموو گوناهو بێ فەرمانی خوای مەزن، یانێ کاتێ مرۆڤ نوێژ ئەکا و بیر لە کردنی نوێژ و مانای وشەکانی قورئان ئەکاتەوە ڕێگەی لێئەگیرێ بۆ کردنی کاری خراپ، نوێژکردن نابێ هەر هەڵسان و دانیشتن بێ بەڵکو ئەبێ ترسی تێدا بێ بەرانبەر بە خوای مەزن و خاوەنەکەی لەماوەی پەرستن دورئەبێ لە کاری خراپ، نوێژ بەوجۆرە دەروونی نوێژکەر هێز و توانا پەیدا ئەکا و لەکاری خراپی شەیتان دور ئەکەوێتەوە، وەستان لە خزمەت خوادا بەبیرکردنەوە لە جگەی خوا وای لێی ئەکا بیر لە خراپە نەکاتەوە.

نوێژ بەشێکە لەو یاسایانەی قورئان کراوە بە دەستور بۆ ئادەمیزاد، فەرماندانی خوای مەزنە بەکردنی و بەجێهێنانی ئەو دەستورەیە. نەك مانای وایە ڕاستەوخۆ ڕێگە ئەگرێ لە ئادەمیزاد بەنەکردنی هەموو گوناهێ و بەرگریان لێ بکا لە بێ فەرمانی خوای مەزن.

﴿ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾ وە بەڕاستی بیرکردنەوە لە توانای خوای مەزن و یادی خوای مەزن گەورەترین پەرستنی خوای مەزنە ، چونکە هەرکەسێ بەردەوام بێ لەسەر یادی خوا بێ فەرمانی خوای مەزن ناکا و خوا ئەزانێ بە شتێ ئێوە ئەیکەن لە یادی خوا و پەرستنی خوا و چاکترین پاداشتان ئەداتەوە

**بە یاریدەی خوای مەزن کۆتایی بەماناکردنی ئەم جزمە هات**

**لە ڕۆژی پێنج شەممە**

**(٢١)ی مانگی سەفەر ساڵی (١٤٢٤)ی کۆچی بەرانبەر بە (٢٠٠٠/٥/٢٥)ی زایینی**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوپاسی زۆر بۆ خوای هەموو بونەوەران . درودی بێ پایان لەسەر پێغەمەری خوا و خێزان و یارویاوەران و پەیڕەوانی بە گشتی.

وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾

﴿ وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ ﴾ وە ئێوەی موسڵمان گفتوگۆی زۆشت و زبر مەکەن لەگەڵ خاوەن نامەکان و ڕقیان مەجوڵێنن مەگەر بە شتێکی ئەوتۆ گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن شیرین بێ و دڵخۆشیان بکەن مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ لەوان ستەمیان کردبێ بە شکاندنی پەیمان و دەستدرێژی‌کردن و واز نەهێنان لە بتپەرستی و و دانانی کوڕ و کچ بۆ خوای مەزن، یابڵێن: خوا سێهەمی سێ خوایە، یا عیسا کوڕی خوایە، یا دەستکاریی نامەکانی خۆیانیان کردبێ.. ئێوە بەم جۆرەی خوارەوە لەگەڵیان بدوێن، خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴾ وە ئێوە بە خاوەن نامەکان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە شتێکی ئەوتۆ نێرراوەتە خوارەوە بۆلای

ئێمە كە قورئانە و بەشتێ نێرراوەتە خوارەوە بۆلای ئێوە لە تەورات و ئینجیلە دەستكاری نەكراوەكان و خوای ئێمە و خوای ئێوە هەریەكە و ئێمە مل كەچی ئەو خوایەین یەكە و باوەڕمان بە نامەكانی ئێوە هەیە هەروەك باوەڕمان بە قورئان هەیە. كەواتە ئێوەی موسڵمان ڕاستەوخۆ یەكەم جار دوژمنایەتی دەرمەبڕن.

﴿ وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ فَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يُؤْمِنُونَ بِهِ ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئێمە تەوراتمان ناردوە بۆ سەر موسا و ئینجیل بۆ سەر عیسا لە پێش تۆوە ئێمە ڕەوانەمان كردوە بۆلای تۆ، ئەو نامەیە كە قورئانە دوایی كەسانێكی ئەوتۆ ئێمە نامەی خۆمان بەوان بەخشیوە لە خاوەن نامەكان باوەڕ بە قورئان ئەهێنن وەك عەبدوڵای كوڕی سەلام و هاوڕێكانی.

﴿ وَمِنْ هَؤُلَاء مَن يُؤْمِنُ بِهِ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ ﴾ وە هەندێكن لە بت پەرستانی دانیشتوانی مەكە كەسێ باوەڕ ئەهێنێ بەخوا و بەقورئان و بە موحەمەد و، بێ باوەڕیش نابێ بەو بەڵگە ئاشكرایانەی ئێمە كە بەڵگەن لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی تۆ مەگەر بێباوەڕان و ئەوانەی چونەتە خوارەوە لە بێباوەڕیدا بە وێنەی كەعبی كوڕی ئەشرەف لە خاوەن نامەكان و ئەبو جەهل لە بتپەرستان.

بت پەرستان ئەیان ووت: قورئان موحەمەد هەر خۆی داینـاوە، خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەو و ئەفەرموێ :

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ ﴾ وە تۆ لە پێش قورئانەوە هیچ نامەیەكت نەخوێندوەتەوە و نەیشت نوسیوە بەدەستی ڕاستی خۆت هیچ نامەیە; چونكە تۆ نەخوێنەواری، كاتێ ئەگەر تۆ نامەیەكت بخوێندایە، نامەیەكت بنووسایەتەوە دروست وابو ئەو بتپەرستانە گومانیان پەیدا بكردایە لەم كارەی تۆدا، ئەو كەسانە هەر گفت وگۆی پوچ ئەكەن.

مێژوونوسان و پێك هاتوون لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەچوەتە لای هیچ مامۆستایی بۆ فێربونی خوێندن و نوسین نە لە منالیدا و نە لەگەورەییدا. بە نەخوێنەواریە ماوەتە هەتا كاتێ قورئانی بۆ هاتووە.

كەواتە ئەو قورئانە دانراوی موحەمەد نییە، كارێكی پەكخەرەو یاسا و دەستووری خوای مەزنە و هەواڵی بەسەرهاتی پێغەمبەرە پێشووەكان و گەلانی ڕابردوی تێدایە.كەواتە دانراوی خوای مەزنە بە تەنیا.

﴿ بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ ﴾ بەڵكو ئەو قورئانە چەندین نیشانەی ئاشكرای ئایەتەكانی قورئانن و بەسروش هاتوەتە خوارەوە بۆ ناو سنگی كەسانێكی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان زانیاری خواناسین و زانایان باوەڕی پێ ئەهێنن و لەبەری ئەكەن و ئەیانپارێزن لە دەست كاری و خاوەن نامەكان باوەڕیان بەو قورئان هەیە لەناو خۆیان و لە نێوان یەكتریدا.

﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الظَّالِمُونَ ﴾ وە بێ باوەڕ نابن بـە ئایەتـە ئاشـكراكانی قورئـان و بـە پێغەمبەرایەتی موحەممەد مەگەر كەسێ ستەمی لەخۆی كردبـێ و بـاوەڕ نـەهێنێ و لایـان وابـێ قورئان دانراوی موحەممەدە.

وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَـٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْبَـٰطِلِ وَكَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾

بت پەرستان كاتێ نەیان توانی بەرەنگاری قورئان بكەن، وێنـەی ئـەو قورئانـە دابنێـن هیـچ شتێكیان بۆ نەمایەوە.

﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ وە بێ باوەڕان ئەیان ووت: بۆ نەنێراوەتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد چەند نیشانەیەکی ئاشکرا و ئادەمیزاد بیان بینن لە لایەن پەروەردگاری خۆیەوە، وەك داردەستی موسا و هوشتری ساڵح و خوانی عیسا. خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾:

﴿قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ تۆ بڵێ بە ڕاستی ئەو نیشانە ئاشکرایانە بە دەستی من نییە لای خوای مەزنە، ئەیان نێرێ بۆلای هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ و بەڕاستی من هەر پێغەمبەرێکی ئاشکرام ئادەمیزاد ئەترسێنم لە سزای خوای مەزن.

﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ﴾ ئایا بەس نییە بۆ ئەو بێباوەڕانە بە ڕاستی ئێمە ناردومانە بۆ سەرتۆ نامەیەکە قورئان ئەخوێنرێتەوە بەسەر ئەواندا و ناتوانن وێنەی دابنێن. ئەو قورئانە گەورەترین نیشانەی ئاشکرایە و پەك خەری ئێوەیە، داری دەستی موسا و هوشتری ساڵح و مردوزیندووکردنەوەی عیسا شتێکی کاتی بون و ڕابوردن. بەڵام قورئان ئەمێنێتەوە هەتا هەتایە.

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ بە ڕاستی هەیە لە بەردەوامی قورئاندا چاکەیەکی زۆر گەورە تەمێ خواری و ئامۆژگاری‌کردن بۆ تاقمێ باوەڕبهێنن، چاکە و ئامۆژگاری قورئان سەران سەری جیهانی گرتۆتەوە.

﴿قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا﴾ تۆ بڵێ: بەسە خوای مەزن ئاگادار بێ لە نێوان من و ئێوەدا لەسەر ئەوەی من پەیامی خوام ڕاگەیاندوە بە ئێوە و ئاگادارە ئێوە من بەدرۆئەخەنەوە و پشت ئەکەنە فەرمانی خوا.

﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ دووبارە خوای مەزن ئەزانێ بە شتێ لە ئاسمانەکان و زەویدایە لە ئاشکرا و لە نهێنی و ئەزانێ بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هەیە بەشتی پوچ و ناڕاست و باوەڕیان بەخوا نەهێناوە، ئەو کەسانە زیانۆمەندن بەهۆی ئەو کارانەوە.

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ﴾ وە بێباوەڕان داوا ئەکەن لە تۆ کە تۆ داوابکەی ئەو سزایە بە گورجی و بەپەلە برژێ بەسەریانا و ئەگەر کاتێکی دیاری‌کراو نەبوایە لەلایەن خوای مەزنەوە بە ڕاستی ئەو سزایە ئەهات بۆلای ئەوان کە داوای ئەکەن لە تۆ. بەڵام خوا کاتی دیاریکردووە بۆ هاتنی ئەو سزایە ئەو بێباوەڕی و داوایە ڕەوشتی ئەوانە، هەرکاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەی ترسانن لە ئەنجامی خراپی کردەوەکانیان بەسزایە، وولامی پێغەمەریان ئەدایەوە و ئەیان ووت: با ئەو سزایە بێت ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی.

﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ وە بەڕاستی ئەو سزایە دێت بۆلای ئەو بێباوەڕانە کوتوپڕ لەناکاودا و ئەوان هەستی پێناکەن لە کاتێکا دێت بۆلایان.

﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ وە بێ باوەڕان داوا ئەکەن لە تۆ بە گورجی تۆ داوا بکەی ئەو سزایە بێتە خوارەوە و بڕژێ بەسەریانا و، بە ڕاستی نازانن سزای دۆزەخ دەوری ئەوانی داوە و سزاکەی زۆر سەختترە لە سزای جیهان بۆ بێ باوەڕان.

﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە سزای خوای مەزن ئەو بێباوەڕانە دائەپۆشێ لەسەریانەوە و لەژێر پێکانیانەوە، خوای مەزن ئەفەرموێ: ئێوە بچێژن لەم ڕۆژەدا سزای شتێ ئێوە ئەیکەن لە جیهاندا.

يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٣﴾

﴿ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُون ﴾ ئەی بەندەكانی ئەوتۆی من باوەڕتان هێناوە: بە ڕاستی زەوی من پان وفراوانە ، دوایی ئێوە هەر من بپەرستن، زانایان بەبێ جیاواز پێك هاتوون لەسەر ئەوەی دروست نیە لە جێگەیێ دانیشی نەتوانی پەرستنی ئایینی خۆتت بەجێبهێنی لە نوێژ و جگەی نوێژ ، پێویستە لەسەری كۆچ بكا بۆ جێگەیەتر بتوانێ بەبێترس پەرستنی خوای مەزن بەجێ بهێنێ.

﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ هەموو خاوەن گیانێ كاتێ كۆتایی بە ماوەی دیاریكراوی ژیانی هات ئازاری مردن ئەچێژێ، لەپاشا ئێوە لە دوای مردن زیندو ئەكرێنەوە ئەگەڕێنەوە بۆلای ئێمە لە ڕۆژی دواییدا، بێگومان ئادەمیزاد لە هەر جێگەیێ، ئەبێ هەر بمرێ.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُون ﴾ وە كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان كردووە بە ڕاستی ئێمە ئەو كەسانەی كۆچیان كردووە و خانوی خۆیانیان بەجێهێشتووە دایان ئەنێن لەچەند هۆدەیەكا لە بەهەشت ئەڕوا بەژێر درەختەكانیدا و بەم لاو ئەولایانا چەندین ڕوباری ئاوی سارد و شیرین و بەتام بەردەوامن لەناو ئەو بەهەشتەدا و لەناو ئەو هۆدە بەرز وبەنرخانەدا ڕائەبوێرن بە خۆشترین خواردەمەنی و بەرگی نایاب. چاك و شیرینە پاداشتی كەسانێكی ئەوتۆ ئارامیان گرتوە لەسەر ئازار و دەركردنیان لە نیشتمانی خۆیانا، و لەسەر یارمەتیدانی پەروەردگاری خۆیانا پشت ئەبەستن بۆكردنی هەموكارێ و بەتەمای جگەی خوانین.

﴿ وَكَأَيِّن مِن دَابَّةٍ لَا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ وە زۆر لەو گیاندارانە هەن ئەڕۆن بەسەر زەویدا خواردەمەنی هۆی ژیان هەڵناگرن خوای مەزن خواردەمەنی ئەدا بەوان و بە خێویان ئەكا، هۆی ژیانی هەموو گیانداران لای خوای مەزنە و كۆتایی پێ نایە و خوا گفتوگۆی ئێوە ئەبینێ كە ئێوە ئەڵێن: خواردەمەنیمان دەست ناكەوێ هەتا نیشتمانی خۆمان بەجێ بێڵین ئەزانێ لەهەر جێگەیە بن و ئەتان ژێنێ و خواردەمەنیتان دەرخوارد ئەدا. كەواتە بێشەرمی بۆ ئەو كەسانەیە بۆ پارەوپول ئەبنە كرێگرتەی دوژمنانی ئیسلام و ئایین و نیشتمانی و ئەبنە ملشۆری دۆژمنی خۆیان.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ وە ئەگەر تۆ پرسیار بكەی لە بێباوەڕانی دانیشتووی مەكە چ كەسێ ئاسمانەكان و زەوی دروستكردوە و خۆر و مانگی ڕام كردوە دێن و ئەڕۆن لەبەر سودی ئێوە و بە ڕێك و پێكی كاری خۆیان ئەكەن بەڕاستی لە وولامی تۆدا ئەڵێن: خوای مەزن ئەوانەی هەموو كردووە. كەواتە كاتێ ئێوە ئەڵێن: هەر خوای مەزن ئەوانەی كردوە.

﴿فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ دوایی ئایا ئەو كەسانە بۆ ڕو وەرئەگێڕن لە پەرستنی خوای مەزن و بەدرۆ بوختان ئەڵێن: خوا بەتایبەتی ئێمەی كردوە بە خاوەنی دارایی و پلەوپایەی داوینەتێ لە جگەی ئادەمیزادی تر.

پرسار: کاتێ دانیشتوانی مەکە بڕوایان وابێ خوای مەزن دروستکەری هەموو بونەوەرانە، ئیتر هۆی ناکۆکی ئەوان و پێغەمبەر چ شتێکە؟

وەلام: بێباوەڕان ئەڵێن: خوا ئێمەی بە خۆشەویستی خۆی دروست کردوە، بونەوارنی تری بۆ ئێمە دروست کردوە بە تایبەتی، جگەی ئێمە بۆ هەژاری و بەندایەتی دروستکردوە.

﴿ اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ بە ڕاستی خوای مەزن خواردەمەنی فراوان ئەکا بۆ کەسێ ئارەزۆی هەبێ لە بەندەکانی خۆی و زۆریان ئەداتێ و تەنگانەیی ئەدا بەسەر کەسێکا ئارەزۆی هەبێ لە بەندەکانی خۆی و کەمیان ئەداتێ، بە ڕاستی خوا ئەزانێ بە هەمو شتێ لە فراوانکردنی هۆی ژیان و کەمکردنەوەی هەریەکەیان بە گوێرەی سودی چاکترینیان ئەیانداتێ.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ وە ئەگەر تۆ پرسیارت بکردایە لە بت پەرستان چ کەسێکە لە هەوری ئاسمان ئاوێ ئەنێرێتە خوارەوە، دوایی بەهۆی ئەو ئاوەوە زەوی زیندوبکاتەوە و گیا و ڕووەکەکانی سەوز بکاتەوە لە دوایی مردن و ووشك بوونی ئەو زەوی‌یە لە وڵامی تۆدائەڵێن: خوای مەزن ئەو ئاوەی ناردوەتە خوارەوە. بەڵام نەك بۆ کەسێ تر بەگشتی بە تایبەتی هەر بۆ ئێمەیە، بە گفتوگۆی خۆیان خۆیان بەدرۆ ئەخەنەوە ئەگەر خوا ئەوشتانەی کردبێ چۆن بەتایبەتی بۆ ئەوانە و چۆنیان زانیوە؟.

﴿ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ تۆ بڵێ: هەمو سوپاس و ستایشێ بۆ خوایە کە من و باوەڕداران ئەپارێزێ لە بێ فەرمانی خوای مەزن. بەڵام زۆرتر لە بێباوەڕان نازانن چاك و خراپ جوێ بکەنەوە بۆخۆیان.

وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ

﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

﴿ وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ﴾ وە ئەم ژیانی جیهانە هیچ شتێ نیە مەگەر خۆ خەریك کردن و یاری گاڵتەکردنە و هەر بۆ ماوەیەکی کەم ئادەمیزاد ڕائەبوێرن و، دوایی کتوپڕ کۆتایی پیٚ‌دێ. وەك ساختەهێنانی کۆڕوکۆمەڵی ئێستا شەوانە ستەمکاران پێکێ ئەهێنن بۆ خواردن و خواردنەوەی ئاژاڵی کوتوپڕ کۆتایی پیٚ‌دێ و جگە ڕسوایی و ماڵوێرانی هیچ شتێکیان بۆ نامێنێتەوە.

﴿ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ وە بەڕاستی جێگە و خانووی ڕۆژی دوایی هەر ئەو زیندوە و بەردەوامە و مردنی تیا نییە و نابڕێتەوە ئەگەر ئێوەی بتپەرست خاوەنی زانست و زانیاری بن، بۆ ئێوە نابینن بە گورجی ژیانی جیهان ئەڕوا و ئێوەیش ئەمرن.

﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ دوایی کاتێ ئەو بێباوەڕانە بچونایەتە ناو کەشتی لە دەریادا گەردەلول و شەپۆلی ئاو کەشتیەکەی ئەهێنایە لەرزە و ترسیان لە خۆیان پەیدا ئەکرد ئەپاڕانەوە لە خوای مەزن بەوێنەی کەسێ بە نیازی پاکەوە ئایین هەر بۆ خوادابنێ بە وێنەی باوەڕداران.

﴿ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ دوایی کاتێ خوای مەزن ئەوانی ڕزگار کرد و بەبێ بردنی بۆلای ووشکایی بەهۆی میهرەبانی خۆیەوە ئەو ترسەیان لەبیر ئەچێتەوە و کوتوپڕ ئەگەڕێنەوە بۆلای هاوبەشدانان بۆ خوای مەزن.

﴿ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ بۆ ئەوەی سوپاسی شتێ نەکەن ئێمە بەواغان بەخشیبوو ڕزگارمان کردن بۆ ئەوەی ڕابوێرن بەکۆبونەوەیان لای بتەکان و بێفەرمانی زۆری خوای مەزن بکەن، خوا پەلەی نی‌یە لەمەودوا ئەوان ئەزانن توشی چ سزایەکی سەخت و ڕسوا ئەبن.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴾ ئایا ئەو بتپەرستانە نەیانزانیوە بەڕاستی ئێمە بەهۆی میهرەبانی خۆمانەوە جێگەیەکی ڕێزدارمان بۆ ئەوان گێڕاوە بەبێ‌ترس ئەژین و کەس پەلاماریان نادا و ئادەمیزادی دانیشتوانی دەوروبەری ئەوان ئەفڕێنن و ئەکوژرێن و تالاّن ئەکرێن.

﴿ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴾ ئایا دوایی بۆ ئەوان باوەڕ بە شتی پڕوپوچ ئەهێنن و سوپاسی چاکەی خوای مەزن ناکەن؟ زۆر جێگەی سەرسوڕمانە. ئەبێ لە بیرمان نەچێ هەرکەسێ بۆ دارایی جیهان واز لەپەرستنی خوای مەزن بهێنێ و ببێ بە کرێگیراوی دوژمن و نیشتمانی خۆی بفرۆشێ وێنەی بت پەرستانە.

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُم ﴾ وە چ کەسێ ستەمکارترە لە کەسێ بوختان بکا بەدرۆ بیدا بەسەر خوای مەزندا و بلێ: خوا هاوبەشی هەیە، یاکاتێ ڕاستی و قورئان چویێ بۆلایان باوەڕیان بەو ڕاستیە نەهێنابێ و بەدرۆیان خستبێتەوە. بێگومان ئەو کەسە زۆر ستەمکار و درۆزن و بوختان چییە.

﴿ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴾ ئایا لە دۆزەخدا نیە جێگەیە بۆ بێ باوەڕان لە تۆڵەی ئەوەدا ئەو ڕاستی بەدرۆ ئەخەنەوە و بەبوختان و درۆ هاوبەش بۆ خوای مەزن دائەنێن.

﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ جەنگیان کردوە لەگەڵ بێباوەڕان لەبەر بەجێهێنانی فەرمانی ئێمە بەڕاستی ئێمە شارەزایی ئەو کەسانە ئەکەین بۆلای ڕێگەی ئایینی ئێمە. بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ چاکەکارانە فەرمان ئەدەن و ڕێگە لە خراپە ئەگرن و نیشتمان پاك ئەکەنەوە لە ستەمی ستەمکاران؟

**بە یاریدەی خوای مەزن تەواوبو**

# ﴿ سورەتی ڕوم ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە جگە لە ئایـەتی (١٧) لـە مەدینـە هاتوەتـە خـوارەوە . ژمـارەی ئایەتەکانی (٦٠) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾

﴿الم﴾ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پیتانە تەماشـای سەرەتـای سـورەتی ئەلبـەقرە و ئـالی عیمـران بکەن.

زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەمەیە: فارسەکان و ڕۆمەکان دوو ڕژێمـی زۆر گەورەبوون پێش هاتنی ئیسلام، فارسەکان لەخۆر هـەڵات و ڕۆمـەکان لـە خۆرئـاوا. زۆر جاران جەنگ لە نێوانیانا پەیدا ئەبوو. یەکێ لەو جەنگانە جەنگێ بو ڕوی دا لـە نێـوان کیسـرا (نەوشیرەوان) پاشای فارسەکان و لـەنێوان (جستینیان) پاشـای ڕۆمـەکان، لەشکری کیسـرا پەلاماری شارەکانی ڕۆمیاندا، زۆریان داگیرکردن هەتا گەیشتنە کەناری دەریای سـپی نـاوەندی نزیکی ئەنتاکیە لـە سـاڵی (٥٧١)ی زایینـی سـاڵی لـە دایکبوونـی پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾.جـەنگ بەردەوام بوو بیست ساڵ، کاتێ کیسرای دووەهەم بو بـە پاشـای فارسـەکان بڕیـاریدا هـەموو شارەکانی ڕۆم بخاتە سەر خاکی خۆی، بەو بۆنـەوە شـام و میسـری داگـیرکرد، ڕۆیـی بـۆلای

ئاسیای بچووك هەتا گەیشتە کەناری دەریای (پسفور) لە ساڵی (٦١٧) زایینی بەر لە کۆچی پێغەمبەر بە پێنج ساڵ هیرقەلی پاشای ڕۆم ترسی لێ پەیدابو، بۆیە لەشکرێکی زۆر بەهێزی پێکەوە نا، دوبارە جەنگ دەستی پێکردەوە. لە ساڵی (٦٢٢) زایینی ڕێکەوتی ساڵی کۆچی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ مەدینە، ئەو جەنگە بەردەوامبو هەتا ساڵی (٦٢٨) ڕێکەوتی ساڵی شەشەمی کۆچی، دوایی ڕۆمەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەسەر فارسەکانا، شارەکانی خۆیانیان داگیرکردەوە، دەستەڵاتی هیرقەل پەرەی سەند، ئەو جەنگانە بو بەهۆی لاوازی و بێ هێزی هەردوو ڕژێمی فارسەکان و ڕۆمەکان، شارەکانیان کاول بون و ڕووخان و دانیشتووانیان هەژار، پیلان پەرەی سەند بۆ نەهێشتنی هەردوو سەرۆکەکانیان، ئەوە بو شێرۆیەی کوڕی کیسرا کیسرای باوکی کوشت، کوڕی قەیسەر قەیسەری لە پاشایەتیەوە خستە کەنارەوە، هەرکاتێ فارسەکان سەرئەکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا بت پەرستەکان زۆر دڵخۆش ئەبو، موسڵمانان دڵیان ناخۆش ئەبو، چونکە بت پەرستان ئەیان ووت: ئێمەی بت پەرستیش سەرئەکەوین بەسەر ئێوەی خاوەن نامەدا، ئێوە و ڕۆمەکان هەردوولاتان خاوەن نامەن، ئێمە و فارسەکان هەردوولامان بت پەرستین، خوای مەزن بۆ دڵخۆشی پێغەمبەر و موسڵمانان دادپەروەری خۆی ڕاگەیاندو فەرمووی:

﴿ غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴾ شکێنراون و شکستیان خوارد ڕۆمەکان لە ناو نزیکترین زەوی بە نیشتمانی عەرەب، بەو بۆنەوە بت پەرستان دڵخۆش بون و موسڵمانەکان دڵگرانبون. وە ڕۆمەکان دوای شکان و شکستیان سەر ئەکەون بەسەر فارسەکانا:

﴿ فِي بِضْعِ سِنِينَ ﴾ لە دوای ژمارەیە لە ساڵان کە کەمتر نەبێ لە سێ ساڵ و زیاتر نەبێ لە ١٠ ساڵ. بە ڕاستی ڕۆمەکان لەناو ئەو چەند ساڵانەدا سەرکەوتن و زاڵبون بەسەر فارسەکانا.

﴿ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴾ هەر بۆ خوای مەزن هەمو شتێ بەر لە یاریدان و دوای یاریدانیان، بەر لە بەزان و شکانی ڕۆمەکان و دوای ژێرکەوتنیان، یانێ کاتێ شکانیان و کاتی سەرکەوتنی ڕۆمەکان هەردوولایان بۆلای خوای گەورە ئەگەڕێتەوە و، لە ڕۆژی سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکانا باوەڕداران شاد ئەبن و خۆشحاڵ ئەبن.

﴿ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ بەهۆی یارمەتیدانی خوای مەزن و هاتنەدیی بەڵێنی خوا بەسەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکانا و بڕوایان توند بو بەو هەواڵەی لە پێشا هەوڵیان پێدرابو بەسەرکەوتنی ڕۆمەکان و، خوا زۆر بەدەستەڵاتە تۆڵە لە دوژمنی خۆی ئەکاتەوە، میهرەبانە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی خۆی.

﴿ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ خوای مەزن بەڵێنیدا بە موحەمەد بە بەڵێنێ کە ڕۆمەکان سەرئەکەون بەسەر فارسەکانا، هەرکاتێ خوا بەڵێنێکیدا بەڵێنەکەی ڕاستەوخۆ پێچەوانەی تێدا نابێ و پێویستە بێتەدی و بەلام زۆرتری ئادەمیزاد نازانن بەڵێنی خوای مەزن ئەبێ جێبەجێ بکرێ.

﴿ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴾ بێباوەڕان ئەوپەڕی ئـەزانن بەشتێ ئاشکرایە لـە ژیانی جیهان خۆیانی بۆ ئامادە ئەکەن و ئەوان بـێ ئاگـان لـە ڕۆژی دوایـی بیری لێناکەنەوە و گرنگی پێنادەن.

أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاءُوا السُّوأَىٰ أَن كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِئُونَ ﴿١٠﴾ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

﴿ أوَلَمْ يَتفكَّرُوا فِي انفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ ئایا بێباوەڕان بیر لە خۆیان ناکەنەوە بەو نزیکییە کە لە نموونەی هەمو بونەوەرانن خوای مەزن ئاسمانەکان و زەویی و شتێ لە نێوان ئاسمانەکان و زەویدان دروستی نەکردون مەگەر بەڕاستی بەجۆرێکی دادپەروەری و بەماوەیەکی دیاریکراو لای زانیاری خۆی و جگەی خۆی نایزانێ و بەبێ سوود دروستنەکراون. خوای مەزن توانای هەیە بۆ گەڕانەوەی ئادەمیزاد بۆلای ژیانێکی تازە لە کۆتایی پێهاتنی تەمنیان و مردنیان و زیندویان ئەکاتەوە بۆ پرسیار و وەڵام.

﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴾ وە بەڕاستی زۆر کەس لە ئادەمیزاد و بڕوایان بەگەیشتنی سزای پەروەردەکەری خۆیان نیە، گومانیان وایە کە مردن زیندوناکرێنەوە و نازانن کەسێ بتوانێ لە نەبوونەوە ئادامیزاد بهێنێتە بونەوە ئاسانترە لای زیندووکردنەوەیان دوای مردنیان.

﴿ أوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ئایا بێباوەڕان نەڕۆیشتوون بەناو زەوی و نیشتمانی گەلانی ڕابردوودا بۆ بازرگانی و کاروان، دوایی تەماشا بکەن چۆن بوە کۆتایی پێهاتنی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش ئەوانەوە بوون.

﴿ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا ﴾ ئەو کەسانە لە پێش ئەوانەوە بوون لە تاقمی عاد و سەمود و جگەی ئەوان هێزیان سەختتر و بەتواناتر بوون لە دانیشتووانی مەکەو، ئەو کەسانەی پێشو زەویەکانیان ئەکێلا و دانەوێڵەیان تێدا ئەچێنا و ئاوەدانیان ئەکردەوە زۆرتر لەوەی ئەمان ئاوەدانی ئەکەنەوە ئەیکێڵن و ئەی چێنن.

﴿ وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ وە چو بۆلای ئەو گەلانەی پێشو پێغەمبەرەکانیان و باوەڕیان پێنەهێنان و بەدرۆیان خستنەوە، کاتێ بەدرۆیان خستنەوە خوای مەزن بنەبڕی کردن و سزای خۆی بەسەردا ڕژاندن.

﴿ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ دوایی خوا ستەمی لەوان نەکرد سزای دان و بەڵام خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد بەهۆی بێفەرمانی خوای مەزن و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان.

﴿ ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا السُّوأَى أَن كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِؤُون ﴾ لە پاشا سزای ئەو کەسانەی باوەڕیان بە پێغەمەرەکانی خۆیان ئەهێنا وێنەی سزای کەسانێکی ئەوتۆن

کاری خراپیان کردوە شایستەی سزابون لەبەر ئەوەی نیشانە ئاشکرا و کارە پەك خەرەکانی خوایان بەدرۆخستوەتەوە و لەبەر ئەوەیش گاڵتە بەو بەڵگە ئاشکرایانە ئەکەن و باوەڕیان پێناهێنن، ئەو سزایەش سەختترین سزایەکە هەتا هەتایە لە دۆزەخدان.

﴿ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ خوای مەزن بونەوەرانی یەکەمجار دروست کردوە ڕاستەوخۆ لە خاك و دواتر لە دڵۆپێ ئاوی پیاو وژن و فەرمانیان پێئەدا بە پەرستنی خوا، لەپاشا دوای مردنی ئادەمیزاد جارێ تر ئەیان گێرێتە لە دوارۆژدا و زیندویان ئەکاتەوە، لە پاشا ئێوە ئەگێڕرێتەوە بۆلای خوای مەزن بۆ پرسیار و پاداشت و وڵام.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ ﴾ وە ڕۆژێ پاشەڕۆژ هات و بەرپابو تاوانباران بێئومێد ئەبن و پەبێ هۆشی و سەرگەردانی ڕائەوەستن و ڕسوا ئەبن و بەتەمای ڕزگاربون نین.

﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاء وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ ﴾ وە ئەو ڕۆژە بۆ تاوانباران نیە کەسانێ بۆیان بپاڕێتەوە لە هاوڕێکانی بت پەرستیان و ڕزگاریان بکا لەسزای ئەو ڕۆژە و باوەڕیان نامێنێ بە هاوبەشەکانی خۆیان و بێزاریان لێ دەرئەبڕن.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴾ وە ئەو ڕۆژەی پاشەڕۆژ دێت و پەیدا ئەبێ ئەو ڕۆژە ئادەمیزاد لەیەك جوێ ئەبنەوە، باوەڕداران بۆلایە و بێباوەڕان بۆ لایەتر، هەریەکەیان بۆ جێگەی دیاریکراوی خۆیان.

﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردوە، دوایی ئەو کەسانە لەناو باخچە و چیمەنەکانی بەهەشتا ڕائەبوێرن بەرابواردنی جۆراوجۆر بەخۆشی و ڕوی گەشەوە.

﴿ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاء الْآخِرَةِ فَأُوْلَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و ئایەتەکانی قورئانی ئێمە و گەیشتن بەسزای ڕۆژی دوایی بەدرۆخستوەتەوە، دوایی ئەو کەسانە ئامادەئەکرێن بۆ ناوسزای ئاگری دۆزەخ و ڕزگاربونیان بۆ نابێ.

لە پاش ئەوەی خوای مەزن باسی دانیشتوانی بەهەشت و دانیشتوانی دۆزەخی کرد فەرمان ئەدا بەدەربڕینی پاکی بۆخوای مەزن و پەرستنی خوا لە هەمو شەو و ڕۆژێکا و ئەفەرموێ:

فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْىِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾

﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴾ دوایی ئێوە پاك و خاوێنی دەربڕن بۆ خـوای مەزن و نوێژەکانتان بکەن کاتێ ئێوە چوونە ناو شەوێ بەکردنی نوێژی مەغریب و عیشاو کاتێ ئێوە چونە ناو بەیانی بەکردنی نوێژی بەیانی.

﴿ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾ وە هەمو سوپاسێ بـۆ خـوای مەزنە لەناو ئاسمانەکان و ناو زەویدا دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی زەوی و بەر لە ئێوارە ئێوە

نوێژی عەسر بكەن و كاتێ ئێوە چونە نیوەڕۆ نوێژی نیوەڕۆ بكەن. بەو دوو ئایەتە خوای مەزن پێنج نوێژی پێویست كردوە لە شەو و ڕۆژ بكا.

﴿ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ ﴾ خوای مەزن شتێكی زیندو لەمردوێ دەرئەهێنێ وەك دەرهێنانی ئادەمیزادێ لە دلۆپێ ئاو، مریشك لە هێلكە، باوەڕدارێ لەبێ باوەڕی، زانایە لە نەزانێ و، مردویە لە زیندوێ دەرئەهێنێ، وێنەی دەرهێنانی دلۆپێ ئاو لە ئادەمیزاد، دەرهێنانی هێلكە لە مریشك، دەرهێنانی بێباوەڕی لە باوەڕدارێ، نەزانێ لە زانایە. وێنەی ئەو شتانە زۆرن.

﴿ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾ وە خوا زەوی دوای مردنی ووشكبونی زیندو ئەكاتەوە و گیاو ڕوەكی تێدا سەوز ئەكا، هەر بەو جۆرەیش ئێوەی ئادەمیزاد زیندوو ئەكاتەوە و ئەهێنرێنە دەرەوە دوای مردنیان لە جیهاندا.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾ وە هەندێكە لە بەڵگە ئاشكراكان لەسەر توانای خوای مەزن كە ئێوەی دروست كردوە یەكەم جار لە خاك، دوایی لە دلۆپێ ئاوی ئادەم و باوكەكانتان، لە پاشا ئێوە بوون بە ئادەمیزاێ و ئێوە بڵاو ئەبنەوە لە زەویدا و بەكاری ئەهێنن بۆ سودی خۆتان.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا ﴾ وە هەندێ لە بەڵگە ئاشكراكان لەسەر توانای خوای مەزن كە دروستی كردوە بۆ سوودی خۆتان لەسەر شێوازی خۆتان و لە ڕەگەزی خۆتان ژنەكانتان و، هاوسەرەكانتان؛ لەبەر ئەوەی ئێوە دانیشن لە لایان و بەخۆشی و دڵشادی پشوبدەن. ئەگەر ژنەكانتان لە ڕەگەزی خۆتان نەبونایە تێگەیشتن و هاوبەشیتان بۆ یەكتری گونجاو نەئەبو لەیەكتری خۆتان بە بێگانە دائەنا.

﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ وە خوای مەزن دروستیكردوە لە نێوان ئێوە و ژنەكانتانا خۆشەویستی و بەزەیی و میهرەبانی بۆ یەكتری. بەڕاستی لە دروستكردنی ئێوە بەو جۆرە چەندین بەڵگەی ئاشكرا هەیە لەسەر توانای خوای مەزن بۆ تاقمێ بیربكەنەوە لە گەورەیی خوای مەزن. كەواتە مەبەست لە دروستكردنی ژنان خۆشەویستی و بەزەیی و دۆستایەتیە. نەك ڕابواردنی ئاژاڵی.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگە ئاشکراکانی خوای مەزن لەسەر توانای خۆی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی و جیاوازی زمان و ڕەنگی ئێوە جیاوازیتان لەبەر زۆری دیاری ناکرێن و نایەنە ژمارە. جیاوازی ڕەنگ وەك ڕەشی بۆ سودان و زۆربەی دانیشتوانی ئەفەریقا، زەردی بۆ چین و یابان ز زۆربەی خۆرهەڵات، سپیەتی و سوری بۆ زۆربەی ئەوروپا، ڕەنگی مام ناوەندی بۆ ڕۆژهەڵاتی مام ناوەند. بەڕاستی هەیە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و جیاوازی زمان و ڕەنگ چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ هەمو زانایان و بگرە بۆ هەمو بونەوەران.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگەی ئاشکراکانی خوای مەزن لەسەر توانای خۆی خەوتنی ئێوە لەشەودا بە زۆری و لە ڕۆژدا هەندێ جار بۆ پشوودانتان و ماندو دەرچونتان و داواکردن و گەڕانی ئێوە بۆ پەیداکردنی هۆی ژیانتان بەزۆری لە ڕۆژدا و کەمێ جار لە شەودا. بەڕاستی هەیە لە خەوتن و پەیداکردنی هۆی ژیانی خۆتان چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ تاقمێ فەرمودەی خوا ببینن و ئاگاداری وەرگرن و گوێ لە ڕاستی بگرن.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگە ئاشکراکانی خوای مەزن لەسەر توانای خۆی خوای مەزن نیشانی ئێوەی ئەدا بزیسکە و چەخماخەی هەورا لەبەر ترساندنی ئێوە ئەگەر ئێوە پێویستیتان بە بارینی باران نەبێ و لەبەر ئومێد پەیداکردنی ئێوە بۆ بارینی باران کاتێ ئێوە پێویستیتان بە باران هەبێ.

﴿ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاء مَاء فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ وە خوای مەزن ئەنێرێتە خوارەوە لە هەوری ئاسمان ئاوێ، دوایی خوای مەزن بەو ئاوە زەوی زیندوو ئەکاتەوە دوای مردنی و ووشکبوونی. بەڕاستی هەیە لە بزیسکەی هەور و ناردنە خوارەوەی باران چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ تاقمێ خاوەنی ئەقڵبن و بیر لە کرداری خوای مەزن بکەنەوە.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگە ئاشکراکانی خوای مەزن لەسەر توانای خۆی کە ئاسمان و زەویی ڕاوەستاونە بەو پەیڕەوە سەرسوڕێنەرەوە کە ئێمە ئەی بینین بەهۆی فەرمان و بەڕێوەبردنی خۆیەوە،ن لە پاشا هەرکاتێ خوای مەزن بانگی ئێوەی کرد بەبانگ کردنێ لە زەوی و گۆڕەکانتانا بۆ زیندوکردنەوەتان دوای مردنتان کوتوپڕ ئێوە بە پەلە و بەزیندوویی لە زەوی و گۆڕەکانتانا دێنە دەرەوە.

وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ

ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾

﴿ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴾ وە بۆ خوای مەزنە هەمو کەسێ لەناو ئاسمانەکان و زەویدان، هەمو کەسێ لەوان فەرمانبەردار و مل کەچی خوای مەزنن، هەتا ئەوانەیش لەخوا یاخین و باوەڕیان بەخوا نیە ناتوانن لە توانای خوای مەزن دەربچن.

﴿ وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ﴾ وە خوا کەسێکە ئەوتۆیە یەکەمین جا بونەوەرانی لە نەبونەوە هێناوەتە بوونەوە، لەپاشا دوای مردنیان ئەیانگێڕێتەوە بۆلای خۆیو زیندویان ئەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا و، گەڕانەوەیان ئاسانترە لەسەر خوای مەزن و هیچ شتێ لای خوای مەزن گران نی‌یە.

﴿ وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ وە هەر بۆ خوای مەزنە هەمو وێنەوکاری بەرز و بەڕێز لە ناو ئاسمانەکان و زەوی‌دا، بەجۆرێ هاوتای نیە و کەس بالادەستتر نی‌یە لە خوای مەزن و، خوا زۆر بەدەستەلاتە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێت.

بێ باوەڕان گومانیان ئەبرد کە خوای مەزن هاوبەشی هەیە لە بوونەوەراندا بۆ پەرستن، خوایمەزن ئەو کەسانەی خاوەنی سامان و خاوەنی بەندەن بەدرۆ ئەخاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِنْ أنفُسِكُمْ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاء فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ ﴾ خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە بۆ ئێوە وێنە و شێوازێ لە خۆتانە کە نزیکترین شتن لە خۆتان و

دوربۆی مەڕۆن ئایا بۆ ئێوە هەیە لە بەندەکانتانا هیچ کەسێ لەوان ببنە هاوبەشی ئێوە لەو سامان و داراییە ئێمە بەخشیومانە بە ئێوە؟ بێگومان نیە.

﴿ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾ دوایی ئێوەی سەربەست و بەندەکانتان یەکسانین لەو سامانەدا، ئێوە ئەترسن بەندەکانتان ببنە هاوبەشی ئێوە لە داراییەکانتاناو دەست کاری داراییەکانتان بکەن وەك خۆتان هەروەك ئەترسن لە جگەی خۆتان ئەوانیش ببنە هاوبەشی ئێوە لە سامانەکانتانا و دەست کاری بکەن وەك ئێوە بە جۆرێکی نارەواو بەبێ ڕەزامەندی خۆتان، ئەگەر بەندەکانتان و جکەی خۆتان خۆیان بکەن بە هاوبەش لە سامانەکانتانا خۆتان بە ڕسوا و بێ نرخ دائەنێن، ئیتر ئێوە بەبێ بەڵگە چۆن ئێوە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن؟

﴿ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ هەر بەو جۆرەی ئێمە ڕوونمان کردەوە بۆ ئێوە ئێمە ڕوونی ئەکەینەوە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر توانا و بێهاوبەشی خۆمان بۆ تاقمێ خاوەنی ئەقڵبن و تەماشای ئەو بەڵگانە بکەن.

﴿ بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ فَمَن يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ بەڵکو کەسانێکی ئەوتۆ لە بێباوەڕان ستەمیان لەخۆیان کردوە، بە هاوبەشدانان بۆ خوا دوای ئارەزۆی خۆیان کەوتوون و بەبێ ئەوەی بزانن بەشتێ پێویستە لەسەریان بەرانبەر بە خوای مەزن لە دانانی خوا بە تەنها. دوایی چ کەسێکە ڕامویی کەسێ بکا خوای مەزن ڕێگەی ڕاستی لێ وون کردبێ و بۆ ئەو کەسانە نیە هیچ کەسێ یاریدەیان بدا بۆلای ڕێگەی ڕاست. بێگومان خوای مەزن ڕێگەی چاك و خراپی بۆ دیاریکردوون. بەڵام خۆیان ڕێگەی خراپیان گرتوە.

فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾ دوایی تۆ دوای ئایینی ڕاستی ئیسلام بکەوە ڕوی خۆت ڕاوەستێنە بۆی و یەکێی خوای مەزن ڕون بکەرەوە بە جۆرێ لە هەمو ئایینێ لادە بۆلای ئەو ئایینە پاکە.

﴿ فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ﴾ تۆ دوای ئایینێکی پاکی خوای مەزن بکەوە و دەستی لێ بەرمەدە ، ئایین ڕەوشتێکی پاکی ئەوتۆیە خوای مەزن ئادەمیزادی لەسەر ئەو ئایینە پاکە دروست کردوە بە گوێرەی سروشت کە ئایینێکە خوای مەزن بەتەنها و بێ هاوبەش دائەنێ.

﴿ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ﴾ هیچ گۆڕانێ بۆ بوونەوەرانی خوای مەزن نییە، هەرکەسێ خوا بەختیاری بۆ دیاریکردبێ بێ فەرمانی خوا ناکا، هەرکەسێ خراپە بۆخۆی هەڵبژێرێ بێختیار نابێ، گۆڕانیش بۆ ئەو ئایینە پاکەی خوا نیە.

﴿ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ ﴾ ئەو شتەی خوای مەزن پێویستی کردوە لەسەر بەندەکانی خۆی ئایینێکی ڕاستە و گومانی تێدا نیە.

﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وە بەڵام زۆرتری ئادەمیزاد نازانن و بیروبۆچونی خۆیان لەسەر زانستی بێگومانی ڕاستی دانانێن. ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ لای ئەوەی خوای مەزن پێویستی کردوە لەسەر بەندەکانی خۆی بەکردار و بە گفتوگۆ پابەندی ئایینی پاکی ئیسلام بین، چونکە ئایینێکی ڕاستە و خوار و خێچی تیدا نییە.

﴿ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ پێویستە ئێوەی ئادەمیزاد بۆلای ئایینی خوای مەزن بگەڕێنەوە و لەخوا بترسن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا و ئێوە نوێژەکانتان بکەن، چونکە یادی خوایان تێدایە و ئێوە لەو کەسانە دووربن هاوبەش بۆخوای مەزن دائەنێن و ئایینی پاك بپەرستن.

﴿ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ لەو بت پەرستانەی ئەوتۆ مەبن ئایینی خۆیانیان پارچە پارچە کردوە و بەگوێرەی مەبەستی خۆیان شتی خراپ و نارەوایان خستوەتە ناوی، بون بە تاقم تاقم و بیروبۆچونیان لە یەکتری جیاوازە و هەریەکەیان لەوی تریان بێزارن و هەموو تاقمێکیان بەو بیروباوەڕە لایانە شادمان و دڵخۆشن، گومانیان وایە ئەوەی لای خۆیانە ڕاستە بە تەنها.

وَإِذَا مَسَّ النَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ

سُلۡطَٰنٗا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشۡرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ فَرِحُواْ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ إِذَا هُمۡ يَقۡنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۖ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيۡءٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٤٠﴾

﴿ وَإِذَا مَسَّ النَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ﴾ وە هەرکاتێ ئازاری توشی ئـادەمیزاد ببوایـە لە گرانی و هەژاری و نەخۆشی ئەپاڕانەوە لە پەروەردگاری خۆیان ئەگەڕانـەوە بـۆلای خـوای مەزن بە نیازی پاکەوە.

﴿ ثُمَّ إِذَا أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّـهِمْ يُشْـرِكُونَ ﴾ لـە پاشـا کاتـێ پـەروەردگار بەوانی ببەخشایە دوای ئەو ئازارە لـە لایەن خۆیەوە چاکەیە و ئازارەکەی لـەسـەر هەڵنەگرتایـە کوتوپڕ تاقمێ لەوان هاوبەشیان دائەنا بۆ پەروەردگاری خۆیان.

﴿ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەنجامی ئەوان بە جۆرێ بو سوپاسی شتێ نەکەن ئێمە بەوانمان بەخشیوە دوایی ئەوان ڕابوێرن بە بێ سوپاسی خۆیانەوە کەمێ، دوایی ئێوە ئەزانن بە ئەنجامی ڕابواردنی خۆتان چۆن ئەبێ؟

﴿ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا بِهِ يُشْرِكُونَ ﴾ ئایا ئێمە ڕەوانەمان کردوە بەسەر بێباوەڕانا بەڵگەیە یان نامەیە، دوایی ئەو نامەیە گفت وگۆ بکا بە شتێ ئەو تاقمە نەیکەن بە هاوبەش بۆ ئێمە و بڵێ: هاوبەش دانان ڕاستە؟

﴿ وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴾ وە هەرکاتێ بەخشییێتمان بە ئادەمیزاد چاکەیە لە تەندروستی و دارایی فراوان شادمان ئەبون بەو چاکەیە و لە خۆیان بایی ئەبون و، ئەگەر توشی ئەوان ببێ ئازار و خراپەیە بەهۆی شتێکەوە خۆیان کردویانە لە بێ فەرمانی خوای مەزن کوتوپڕ ئەوان بێ ئومێد ئەبن لە میهرەبانی خوا و پەرستنی خوا جێبەجێ ناکەن.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ ئایا دانیشتوانی مەکە نەیانزانیوە بە ڕاستی خوای مەزن فراوان ئەکا چاکە و دارایی و خواردەمەنی بۆ کەسێ ئارەزوی هەبێ و کەمی ئەکاتەوە بۆ کەسێ ئارەزوی هەبێ. بە ڕاستی هەیە لە فراوانکردن و کەم کردنی سامان بۆ کەسانێ ئارەزوی هەبێ چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر توانای خوای مەزن بۆ تاقمێ باوەڕبهێنن بە فەرمانەکانی خوای‌مەزن.

﴿ فَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ ﴾ دوایی تۆ ببەخشە بە خزمانی نزیکی خۆت و هەژار و مێوان و کاروانی مافەکانی خۆیان لە زەکات و دەستیکەوتی تر و دارایی موسڵمانان بە گشتی.

﴿ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ بەخشینی ئەو مافە بەو کەسانە و بەو کەسەی دوورە لە دارایی خۆی چاکترە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ نیازیان ڕەزامەندی خوای مەزن بێ بەو کارەی ئەیکەن و، ئەو کەسانە ئەوانەن سەرئەکەون و ڕزگاریان ئەبێ لە سزای هەردوو جیهان.

﴿ وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ ﴾ و هەرشتێ ئێوە بەخشییێتان بە جگەی خۆتان لە دیاری و شتی تر لە خواردەمەنی و بەرگ و لەبەر ئەوە دارایی ئێوە زۆرتربێ بەهۆی دارایی جگەی خۆتان، دوایی دارایی ئێوە گەشە ناکات لای خوای مەزن و زۆرترنابێ، بۆ نمونە تۆ دیارییەك یا جگەی دیاری پێشکەش بکەی بە جگەی خۆت یا یارمەتی بدەی لە بازرگانی و جگەی بازرگانیدا، بۆ ئەو کەسە ببەخشێ بەتۆ زۆرتر لەوەی تۆ ئەیدەی بەو کەسە ئەو کارەی تۆ بەو جۆرە نە پاداشتی چاکەی بۆ تۆ ئەبێ لای خواوە نە سزایش ئەدرێت چونکە قەدەغە نیە.

بۆ زانین: سود= (ربا) دوو جۆرە: جۆرێکیان قەدەغە نیە، بە وێنەی ئەو سودەی لەم ئایەتدا باسی کرا، جۆرێ ترین هەیە قەدەغەیە و لە گوناهە گەورەکانە، وەك ئەو سودەی لە ئایەتی (٢٧٥)ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی کراوە.

﴿ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ ﴾ وە هەرشتێ ئێوە بەخشیبێتان لە زەکات ئێوە مەبەستان ڕەزامەندی خوای مەزن بێ و بە نیازی سودی تایبەتی و باسکردنتان نەبێ، دوایی ئەو کەسانە چاکەکان بۆیان دووپات ئەکرێتەوە لای خوای مەزن بە چەندین ئەندازە.

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ﴾ خوای مەزن کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردوە، لە پاشا ئێوەی بەخێو کردوە و خواردەمەنی پێ بەخشیون و لە پاشا ئێوە ئەمرێنێ دوایی کۆتایی پێهاتنی تەمەنی دیاریکراوتان، لە پاشا دوای مردن لە ڕۆژی دواییدا زیندوتان ئەکاتەوە بۆ پرسیار و وەڵام و وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە.

﴿ هَلْ مِن شُرَكَائِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَلِكُم مِّن شَيْءٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ئایا لەو بتانەی کە ئێوە ئەیان کەن بە هاوبەش بۆ خواو ئێوە ئەیان پەرستن لە جگەی خوای مەزن کەسێ هەیە ئەو شتانە بکا و ئێوە دروست بکا و بەخێوتان بکا بتانمرێنێ و زیندووتان بکاتەوە، پاکی و باڵادەستی و دوری بۆ خوایە لە شتێ ئێوە بیکەن بە هاوبەش بۆ خوای مەزن.

ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾

﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ ﴾ خراپە و گرانی و کەم بارانی و بێ سەوزایی و زیانی بازرگانی و مردنی گیانداران بڵاوبۆتەوە لەناو زەوی و لەناو دەریادا بەهۆی

شتێکەوە ئادەمیزاد کردوویانە لەبێ فەرمانی خوای مەزن . هەر شتێ خوای مەزن قەدەغەکردبێ کردنی ئەو شتە تاوان و خراپەیە لە زەوی‌دا. بە وێنەی جەنگ و ستەم و ڕووتاڵی ژنان و داوێن پیسی و خواردنەوەی مەی و کردنی قومار و سوکایەتی کردن بە پەرستنی خوای مەزن، هەروەها شتی تریش.

﴿ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ لەبەر ئەوەی خوای مەزن بچەژێنێ بەوان سزای هەندێ لەو کارەی ئەوتۆ بێ‌باوەڕان کردویانە لە جیهاندا. بێگومان سزای دوا ڕۆژ گرانترە بۆ ئەوەی ئەوان لەو کارە خراپانە بگەڕێنەوە و ڕووبکەنە خوا پەرستی.

﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴾ تۆ بڵێ بە بت پەرستان: ئێوە بڕۆن و بگەڕێن بەناو زەوی‌دا، دوایی ئێوە تەماشا بکەن چۆن بوە و بە چ جۆرێ بوە کۆتایی پێهاتنی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش ئەوانەوە بوون و جێگەکانیان چۆڵ و هۆڵە، زۆر لەوانەی پێشوو هاوبەشبان بۆ خوا دانابو، دوایی خوای مەزن هەموویانی لەناوبردن.

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴾ دوایی تۆ: دوای ئایینێکی ڕاست بکەوە و ڕوی خۆتی بۆ دانێ و لەو ئایینە لانەدەی لە پێش هاتنی ڕۆژەی‌کەی کە ڕۆژی دواییە کەس توانای نیە خۆی لەو ڕۆژە لادا، بیگێڕێتەوە و هاتنی ئەو ڕۆژە لەلای خوا وە هاتوە، لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد جویێ ئەبنەوە لە یەکتری، باوەڕداران بۆلای بەهەشت و بێ‌باوەڕانیش بۆلای دۆزەخ.

﴿ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴾ هەرکەسێ باوەڕی نەهێنابێ، دوایی سزای بێ‌باوەڕی‌یەکەی لەسەر خۆیەتی و، هەرکەسانێك کردەوەی چاکیان کردبێ، دوایی جێگەیەکی چاکیان بۆخۆیان ئامادە کردوە کە بەهەشتە بۆ ڕۆژی دوایی و لەو جێگەیەدا دائەنیشن.

﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴾ ئادەمیزاد لەیەك جویێ ئەبنەوە لەبەر ئەوەی خوای مەزن پاداشتی کەسانێکی ئەوتۆ بداتەوە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە لە پاداشت و بەخشش و چاکەی خوای مەزن . بە ڕاستی خوای مەزن بێ باوەڕانی خۆش ناوێ.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم

بِالْبَيِّنَاتِ فَانْتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَانْظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَظَلُّوا مِنْ بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أن يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِ ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگە ئاشکراکانی خوای مەزن لەسەر توانای خۆی کە بایەکانی باشور و باکور و خۆرهەڵات ڕەوانە ئەکا مژدە ئەدەن بە بارینی بارانی ئێوە زۆر ئارەزۆمەندن بۆ بارینی، بۆ ئەویش ببەخشێ بە ئێوە هەندێ لە چاکە و میهرەبانی خۆی لە هەرزانی ڕوناکی بۆ دانیشتوان.

﴿ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ وە بۆ ئەوەیش ئەو بایانە کەشتیەکان ببەن بەناو ئاودا بەهۆی دەستوری خوای مەزنە بەگوێرەی ئارەزۆی خۆتان و بۆ ئەوەیش ئێوە پەیدابکەن لە چاکەی خوای مەزن ئەوەی بتانەوێ لە بازرگانی و گواستنەوەی کەل و پەلتان و بۆ ئەوەیش ئێوە سوپاسی گەورەیی خوای مەزن بکەن و بپەرستن و بەیەکی دانێن.

﴿ وَلَقَدْ أرسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَى قَوْمِهِمْ فَجَاؤُوهُم بِالْبَيِّنَاتِ ﴾ و بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوە لە پێش تۆ و چەندین پێغەمبەر بۆلای تاقمەکەی خۆیان، دوایی چووبوون بۆلایان بە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ئەوەی ڕاست ئەکەن و نێرراوی خوای مەزنن.

﴿ فَانتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ دوایی ئێمە تۆڵـەمان کـردەوە لـە کەسانێکی ئـەوتۆ تاوانباریـان کردبـوو بـە بـەردەوامیان لـەسـەر بێباوەڕی وبێفـەرمانی و ئازاردانی پێغەمەرەکانیان و پێویستە لـەسەر ئێمە یارمـەتیدانی بـاوەڕداران لـە پێغەمبـەران ئـەو کەسانە لـەگەڵیان.

﴿ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ ﴾ خـوای مـەزن کەسێکی ئەوتۆیە بایەکان ڕەوانەئەکا، دوایی ئەو بایانە هەورەکان کە لـە هەڵمی ئاو پەیدا ئـەبن بەهۆی گەرمایی تیشکی خـۆرەوە دوایـی خـوای مـەزن ئـەو هەورانـە بڵاوئەکاتـەوە و پارچـە پارچەیان ئەکا و هەرپارچەیەکیان ڕەوانە ئەکا بۆلای هەر جێگەیە چۆن خـوای مـەزن ئـارەزۆی هەبێ.

﴿ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ ﴾ وە خوای مەزن ئـەو هـەورە ئـەگێڕێ بـە چەند پارچەیەك، هەر پارچەیەکیان ڕەوانە ئەکا بۆ لای جێگەیە، دوایی تۆ باران ئـەبینی دڵـۆپ دڵۆپ دێتە خوارەوە لـەناو هەورەوە.

﴿ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ دووایی خوای مەزن ئەو بارانـەی گەیاندە شار و خاك و کشت وکاڵی کەسێ ئارەزۆی هـەبێ لـەبـەندەکانی خـۆی کوتوپـڕ ئـەو بەندانەی خوا شادمان و دڵخۆش ئەبن و موژدە ئەدەن بە یەکتری.

بۆ زانین: بێگومان ئەو بارانەی خوای مەزن دروستی کردوە جیاوازن لە یەکتری لـە بـارەی زۆری و کەمی، لـە بون و لـە نەبون بە گوێرەی جیاوازی بایەکان هەیانە بە بەردەوامی ئەو بایانە هەن، هەیانە ئەو بایانە لـە کاتێکی تایبەتیدا پەیدا ئەبێ، هەر بـەو جۆرەیـش بـاران ئـەبارێ: لـە هەندێ جێگەدا بەردەوامە و هەموکاتێ ئەبارێ وەك کیشـوەری ئـەمریکای بـاکور و باشـور و خۆرئاوای کیشوەری ئەوروپا، لـە شوێنەکانی هێڵی ناوەڕاسـتی زەوی هـەر لـە هـاویندا بـاران ئەبارێ و پێی ئەوترێ: بارانی وەرزی، لـە هەرێمەکانی دەریای سپی ناوەڕاست لـە زسـتانا بـاران ئەبارێ، جێگە دەشتاییەکان بەکەمی بارانیان لێ ئەبارێ، ئەوانە هـەموویان بـە گوێـرەی ویسـتی خوای مەزنە.

﴿ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ ﴾ وە بەڕاسـتی دانیشـتووانی ئـەو شوێنانە لـە پێش ئەوەی کە باران ببارێ بەسەریانا لـە پێش پەیدابوونی هەوروباران بـێئومێدبوون لە بارانی باران و چاوەڕوانی بارانیان ئەکرد.

﴿ فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ دوایی تۆ تەماشا بـکە بـۆلای نیشاکانی باران دوای بارینی کە چاکەی خوای مەزنـە چـۆن خـوای زەوی زینـدوو ئەکاتـەوە. دوای مردنی و ووشکبوونی بە هۆی بارانەوە سەوز هەڵئەگەڕێ بە ڕووەك و درەختەکانیەوە.

﴿ إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ بەڕاسـتی ئـەو دەسـتەڵاتەی زەوی زیندووکردوەتەوە دوای مردن و ووشکبوونی هەر ئەو کەسەی مردووان زیندوو ئەکاتـەوە لـە ڕۆژی دواییدا و خوای مەزن دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیە و خاوەنی توانایە.

﴿ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا مِن بَعْدِهِ يَكْفُرُونَ ﴾ وە ئەگەر ئێمە بایەکمان ڕەوانەبکردایە چاکەی تێدا نەبوایە و هەوری پەیدانەکردایە، دوایی ئەو بێباوەڕانە کشت وکاڵی خۆیانیان ئەبینی زەرد هەڵگەڕا و، دوای سەوزایەتی بەڕاستی ئەوان دوای ئەوە کشت وکاڵی خۆیانیانبینی زەردبوە گەڕأن بێباوەڕ بەوچاکانەی خوای مەزن بەخشیبووی بەوان لەوەوبەر لە کاتی هەرزانیدا و سوپاسیان نەکردن.

فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَا أَنتَ بِهَادِ الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۖ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ الْبَعْثِ ۖ فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾

﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاء ﴾ دوایی بە ڕاستی تۆ ناتوانی گفت وگـۆی خۆت ببیسێنی بە مردوان، ئەو بێباوەڕانە وەك مردووان تـەمێ خوارنـابن، بیستنیش نزیمـترینی هەستی مرۆڤایەتییە و، تۆ ناتوانی دەنگی خۆت ببیسێنی بە ئـادەمیزادە کـەڕەکان بتـەوێ بـانگی بکەی.

﴿ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴾ کاتێ ئەو بێباوەڕانە واز بـهێنن لـە باوەڕهێنـان بـەتۆو پشـت بکەنـە ڕاستی و ڕونەکەن بۆ لای تۆ بە جۆرێ بیانەوێ ڕاستی ببیسن ئەو بێ باوەڕانە وەك کەڕ وانـە و دڵیان مردووە لـە ئاستی ڕاستی.

﴿ وَمَا أَنتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَن ضَلَالَتِهِمْ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَـهُم مُّسْلِمُونَ ﴾ وە تـۆ توانای شارەزایی کردنی کەسانێکت نییە کوێربن و ڕێگەی نـەبینن لایـان بـدەی لـە گومڕایـی خۆیان، گفتوگۆی تۆ نابیسن و کاریان تێ ناکا، تۆ ئامۆژگاری خۆت نابیسـێی بـەو بێباوەڕانـە مەگـەر کەسـێ ببیسێ باوەڕبـهێنێ بـەناوەرۆکی ئایەتـەکانی قورئـانی ئێمـە، دوایـی ئـەوان فەرمانبەرداری شتێ بن تۆ فەرمانیان پێ ئەدەی.

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ﴾ خوای مەزن کەسـێکی ئـەوتۆ تیە ئێوەی دروست کردو لـە شتێکی لاوازو بێنرخ وەك دڵۆپێ ئاو لـە پاشا پلەیـە لـە خـوای مەزن هێز وتوانا و ئەقڵی بەخشی بە ئێوە لـە دوای ئەو لاوازییەی هەتان بوو بونە خاوەن توانا و بەڕێوەبردنی کاری خۆمان.

﴿ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ ﴾ لە پاشا خوای مەزن ئێوە ئەگێڕێتەوە لـە دوای ئەو هێز و توانا و ئەقڵەوە بۆلای لاوازیە تـر بـۆ لای پـیری و لاوازی لـەش و ئەقڵ، خوای مەزن دروست ئەکا شتێ ئارەزۆی هەبێ لە لاوازی و هێز و گەنجی و پیری و خوا ئەزانێ بەشتێ چاکبێ بۆ هەمو بوونـەوەران، توانـای هەیـە بـۆ گۆڕانـی هـەموو شتێ و لابردنی شتێ و دانانی شتێ تر لـە جێگەیا.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُـونَ ﴾ وە ڕۆژێ پەیدا ئەبێ ڕۆژی دوایی و ڕاکردنی ئادەمیزاد بۆ وەستان لـە خزمـەت خـوادا تاوانبـاران سـوێند ئەخۆن لـە جیهاندا نەماونەتەوە ماوەیەکی کەم نەبێ، هـەر بـەو جـۆرەی لایـاندا بـوو لـە شـتێ چاکەی ئەوانی تێدابو باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نەهێنابوو، هەروایش لـە ڕۆژی دواییـدا سـوێند ئەخۆن، ماوەیەکی کەم لـە جیهاندا ماونەتەوە.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْـثِ ﴾ وە کەسـانێکی ئەوتۆ بەخشـرابو بـەوان زانیـاری ڕاسـتی و باوەڕهێنـان بـە خـوای مـەزن لـە پێغەمبـەران و فریشتەکان ووتیان بە ڕاستی لـە نامەی خوای مەزندا تۆمار کراوە، وە ماوەیە خوای ویستویەتێ بمێنێتەوە لـە جیهاندا ئەو ماوەیەیش فەرمانی پێدراوە بە سەری ببەن لـە گۆڕەکانتانا لای زانیـاری

خوایە و کەس نایزانێ، ئیتر سودێ لــە سوێند خواردنــی ئێوەدا نیـە چـەندە لـە گۆڕەکانتانـا ماونەتەوە، ئێوە بڕواتان بەم ڕۆژە نەبو.

﴿ فَهَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئەم ڕۆژی زیندوبونەوەیە ئــەو ڕۆژەیـە ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بەڵام ئێوە نەتان ئەزانی توشــی ئـەم ڕۆژە ئـەبن و کوێـر و کـەڕبوون و ڕاستیتان نەئەبیست و نەتان ئەبینی.

﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾ دوایـی لـەم ڕۆژەدا بیـانوو هێنانەوەی بێباوەڕان سود بە کەسانێکی ئەوتۆ نابەخشێ ستەمیان لــەخۆیان کـردوە و باوەڕیـان نەهێناوە بەم ڕۆژە ئەو ئاواتەیان جێگەی خۆی نــاگرێ بگەڕێنــەوە بـۆلای جیـهان لـەبەرئـەوەی باوەڕبهێنن ، ڕازی ناکرێن و وازیان لێ ئەهێنرێ هەر لــە سـەرگەردانی و خەفـەتباری و سـزادا بژین.

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾ وە ئێمە ڕوونمان کردوەتەوە بۆ ئادەمیزاد لەناو قورئانی پیرۆزدا هەمو وێنەیە بۆیان لەسەر ڕاستی موحەمەد و ڕاسـتی ڕۆژی دوایـی، ئیـتر بیانوویان لێوەرناگیرێت.

﴿ وَلَئِن جِئْتَهُم بِآيَةٍ لَّيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴾ وە بە ڕاستی ئەگەر تـۆ بـڕۆی بۆلای بێباوەڕان بە بەڵگەیــەکی زۆر پـەك خـەر و ئاشـکرا ئـەوەندە دڵیـان ڕەقـە بـە ڕاسـتی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ئەڵێن: ئێوەی باوەڕدار دوای هیچ شتێ نەکەوتوون و مەگەر ئێوە دوای کارێکی پڕوپوچی ئەوتۆ کەوتوون پێغەمبەرەکەتان جادوی لێکردون.

﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ هەر بەو جۆرەی مۆردراوە بەســەر دڵـی بێباوەڕاندا خوای مەزن مۆر ئەدا بەسەر دڵی کەسانێکی ئەوتۆدا دوای زانیاری ناکەون و دڵیان داخراو و باوەڕ و زانیاری ناچێتە ناویی و کاری پەك خەر کاریان تێ ناکا.

﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾ دوایی تــۆ ئـارام بگـرە لـەسـەر ئازاری بێباوەڕان. بە ڕاستی بەڵێنی خوای مەزن ڕاستە و ئایینی ئیسلام سەرئەخا بەسەر هـەموو ئایینەکانی تردا و یارمەتی تۆ ئەدا و بێئومێد مەبە لە گەیاندنی فـەرمانی خـوای مـەزندا، زۆری پێناچێ ئایینی ئیسلام خۆرئاوا و خۆر هەڵات ئەگرێتەوە و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە تۆ توشی خەفەت و دڵگرانی و ئازار ناکەن و باری تـۆی پـێ گـران بکـەن، بـەهۆی بەدرۆخستنەوەی تۆ و سوکایەتی کردن بە تۆ.

## بە یاریدەی خوای مەزن کۆتایی پێ هات

# ﴿ سورەتی لوقمان ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٤) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

## بسم الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ الم ﴾ مانای ئەو پیتانەیە لە سورەتی ئەلبەقەرە و هەندێ لە سورەتەکانی تردا باسیان کراوە.

﴿ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْحَكِيمِ ﴾ ئەو ئایەتانەی پێك هاتوون لەو پیتانە ئایەتی نامەیەکن پڕن لە زانست و زانین لە لایەن خوای مەزنەوە نێرراوە بۆ سەر موحەمەد.

﴿ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ ﴾ ئەو نامەیە شارەزاکەرە بۆ ئەو ئادەمیزادە چاکەکەرانەی ئەوتۆ بەردەوامن لەسەر چاکە و نوێژکردن و ئاسایش و خۆشیە بۆیان.

﴿ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾ وە کەسانێکن زەکاتی سامانی خۆیان ئەدەن بەو کەسانە شایستەی ئەوەن زەکاتیان بدرێتێ و ئەو کەسانە ئەوانەن باوەڕی بێگومان ئەهێنن بە ڕۆژی دوایی.

﴿ أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ وە ئەو کەسانە ئەوانەن ڕزگاریان ئەبێ لە سزای خوای مەزن و توشی بەختیاری و سەربەرزی ئەبن لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ وە هەندێکە لە ئادەمیزاد کەسێ گفت وگۆی پڕوپوچ ئەکڕێ بۆ ئەوە ئادەمیزاد لابدەن لە ڕێگەی ڕاستی ئایین و لە بیستنی قورئانی پیرۆز بەبێ ئەوەی بیربکەنەوە لە چاك و لە خراپ و بزانن ئەو کارەی خۆیان زۆر بێ‌سوودە.

﴿ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ وە لەبەر ئەوەی ڕێگەی ئایینی خوا و ئایەتەکانی قورئان بکەن بە گاڵتەی خۆیان و گوێیان لێ نەگیرێ، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایە توشی ڕسوایی و بێ‌نرخیان بکا.

ئەو ئایەتە لەوەوە هاتوەتە خوارەوە: نەزری کوڕی خەرسی کوڕی کەلدە بۆ بازرگانی چوە هیەر هەواڵی عەجەمەکانی کڕی و ئەی گێڕایەوە بۆ قوڕەیشیەکان و ئەیووت: موحەمەد هەواڵی عادو سەمود باس ئەکا، منیش باسی ڕۆستەم و ئەسفەندیار و کیسراکانتان بۆ ئەکەم، بەو بۆنەوە وازیان لە بیستنی قورئان هێنا.

بۆ زانین: شتی پڕوپوچ و بێ‌سود هەمو شتێ ئەگرێتەوە وە ئادەمیزاد توشی‌خراپە بکەن و فێری کاری ناڕەوایان بکەن، ئیتر گۆرانی بێ یا ڕۆژنامە و فیلم و شتی تر.

﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا وَلَّى مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ﴾ وە هەرکاتێ بخوێنرێتەوە ئایەتێ نامەی ئێمە بەسەر ئەو کەسەدا واز لە بیستنی ئەو ئایەتانە ئەهێنێ خۆی بەگەورە دائەنێ و بەبێ‌نرخیان دائەنێ. وەکئەوەی ئەو ئایەتانەی نەبیستبێ.

﴿ كَأَنَّ فِي أُذُنَيْهِ وَقْرًا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ وەك ئەوەی لە ناو هەردوو گوێچکەیا کەڕێ پەیدابوبێ و هیچ شتێ نەبیسێ، دوایی تۆ مۆژدە بدە بەو کەسە بە سزایە خاوەن ئازارە.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ جَنَّاتُ النَّعِيمِ خَالِدِينَ فِيهَا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردوە، بۆ ئەو کەسانە هەیە بەهەشت بەخۆشی ڕائەبوێرن لە ناویانا بەهەموو جۆرە ڕابواردن و خۆشیەکەوە، بە بەردەوامی لەناویانان هەمو کاتێ و دەرناکرێت.

﴿ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ خوا بەڵێنی داوە ئەو شتانەیان بداتێ و بەڵێنی خوای مەزن ڕاستە و خوا زۆر بەدەستەلاتە هیچ کەسێ ڕێگە لە بەڵێنی ناگرێ، ئەوەی خوا ئەیکا بەگوێرەی زانستە و لە جێگەی خۆیدا دایئەنێ.

﴿ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾ خوای مەزن ئاسمانەکانی لە ژوور ئێوەوە درووست کردون و وەستان بەبێ ئەوەی دانرابن لەسەر کۆڵەکەیە نەیەڵێ بکەونە خوارەوە ئێوە ئەو ئاسمانانە ئەبینن. بەڵکو خوای مەزن یاسای ڕاکێشانی گشتی داناوە بۆ هەمو ئەستێرەیە بەجۆرێکی تایبەتی بۆ هەریەکەیان و هەرخوا ئەیزانێ.

﴿ وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ ﴾ وە خوای مەزن داینـاوە لە ناو زەویدا چەندین کێو بەش کراون بەسەر ڕووی زەویدا بە پەیڕە پرۆگرامێکی تایبەتی لەبەر ئەوەی زەوی نەجوڵێ بە ئێوە و گەردەلول و تۆز لە ئێوە کەم کاتەوە، ئەو کێوانە هەیانە لەسەرەوەن ئێوە ئەیانبینن، هەیانە لەناو دەریاکانان.

خوای مەزن بڵاوی کردوەتەوە لەسەر زەوی لە هەمو جۆرە شتێ ئەڕۆن بەسەر زەویدا بە ئاسماندا هۆی ژیانی خۆیان مسۆگەر ئەکەن.

﴿ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴾ وە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە لەهەوری ئاسمانەوە ئاوێ، دوایی ئێمە ڕواندومانە لە زەویدا لەهەموو جۆرە شتێکی جوان و بەڕێز و جۆراوجۆر و بەنرخ.

﴿ هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ ئەو شتانەی باسکران وە ئێو بینیتان دروستکراوی خوای مەزنن، دوای ئێوە نیشانی منی بدەن کەسانێکی ئەوتۆ لە جگەی خوا چ شتێکیان دروست کردوە؟ بەڵکو ستەمکاران و بێباوەڕان لەناو گومڕاییەکی زۆرئاشکرادان و ڕێگەی زۆر خراپیان گرتوە.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ

لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أن اشْكُرْ لِلّٰهِ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە بەخشیبومان بە لوقمان زانیاری و ئەقڵی تەواو بەجۆرێ هەمو شتێكی ڕاست و دروستی لە ئاین و خواپەرستی و كۆمەڵایەتیدا ئەزانی و كاری پێ ئەكردن، ئێمە پێمان ووت: تۆ سوپاسی خوا بكە، چونكە سوەكەی هەربۆخۆت ئەگەڕێتەوە.

لوقمانی كوڕی باعوراو لەنەوەی ئازەرە كوڕی خوشكی ئەیوب یا كوڕ خوشكی دایكی ئەیوبە، هەزار ساڵ ژیاوە، بە خزمەت داوود گەیشتوە و زانستی لێ وەرگرتوە، بەر لە بوونی

داود بە پێغەمبەر ووڵامی پرسیاری دانیشتوانی بۆ ڕوونکردوونەتەوە، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن پێغەمبەر نەبوە پیاوێکی چاکی خوا بوە، خاوەنی ئەقڵ و زانستی بوە لە کاتی خۆیدا و دەرونێکی پاکی هەبوە.

﴿ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ وە هەرکەسێ سوپاسی خوای کردبێ، دوایی بە ڕاستی سوپاسی هەر بۆ سودی خۆی کردوە و، هەرکەسێ بێ سوپاسی خوای کردبێ، دوایی بەڕاستی خوای مەزن پێویستی بە هیچ کەسێ نیە، خوای مەزن شایستەی سوپاسە بەتەنها.

دوای ئەوەی خوایمەزن باسی لوقمانی بە چاکە کرد، باسی هەندێ ئامۆژگاری لوقمان بۆ کورەکەی ئەکا، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە لوقمان بەکوڕەکەی خۆی ووت و ئەو ئامۆژگاری ئەکرد: ئەی کوڕی خۆم: تۆ هاوبەش بۆ خوا دامەنێ لە پەرستندا بەڕاستی هاوبەش دانان ستەمێکی زۆر گەورەیە. خوای مەزن دوای ئەو ئامۆژگارییەی لوقمان ئەفەرموێ:

﴿ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ ﴾ و ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد کە چاکە بکەن لەگەڵ باوك و دایکانا، دایکیان ئەوانیان هەڵگرتوە لە منالدانیاندا ئازار لەسەر ئازار و ئێش: ئازاری هەڵگرتنی منالەکە، ئازاری ژانی منالبون، ئازاری دانانی منالەیکەی، ئازاری شیردانی بە منالەکەی، هەتا منالەکە گەورەتربێ ئازاری زۆرترە، دایك دووساڵ شیر ئەدا بە مندالەکەی دوای دوو ساڵ لەشیر ئەیبڕێتەوە ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لای ژورری شیردان دووساڵە:

﴿ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾ فەرمانمان دا بە ئادەمیزاد سوپاسی من و دایك و باوکانیان بکەن، هەر بۆلای منە گەڕانەوەی ئادەمیزاد بۆ پرسیارکردن لەوان لەسەر سوپاسی من ودایك و باوکیان لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ وە ئەگەر باوك و دایك لەگەڵ تۆ بەهەمو جۆرێ کۆششی خۆیانیان بەکارهێنا لەسەر ئەوەی تۆ بکەی بەهاوبەش بۆمن لەپەرستندا بەشتێ کە ئەو شتە هەرنەبوە و شایستەی نیە تۆ پێی نازانی وەك بتەکان، دوایی تۆ لەو شتەدا پەیڕەوی دایك و باوکت مەکە، چونکە نابێ پەیڕەوی جگەی خوا بکرێ بەبێ فەرمانی خوای مەزن.

﴿ وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ﴾ وە تۆ هاوڕێتی باوك و دایکت بکە لە ژیانی جیهاندا وەك منالێکی خاوەن چاکە لە شتێکا زیان بەتۆ ناگەیەنێ لە ئاییندا و دژی یاسای ئایین نەبێ و، تۆ دوای ڕێگەی کەسێ بکەوە گەڕابێتەوە بۆلای من بەنیازێکی پاکەوە.

﴿ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ لەپاشا هەر بۆلای منە گەڕانەوەی ئێوە لە ڕۆژی دواییدا، دوای من هەواڵ ئەدەم بە ئێوە بەشتێ ئێوە ئەیکەن لە جیهاندا لە چاك و لە خراپ.

﴿ يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾ ئەی کوڕی خۆم: بەڕاستی ئەگەر تۆ بە ئەندازەی کێشانەی دانەیە لە تۆوی خەرتەلەیی، دوایی تۆ لە ناوی بەردێکی ڕەقدابی یا لەنێوئاسمانەکاندا یا لەناو زەویدا بی خوای مەزن ئەو تۆوە دەرئەهێنێ لە ڕۆژی دواییدا بۆ پرسیار و وولام پاداشت و تۆڵە. بە ڕاستی زانستی خوای مەزن ئەگاتە لای هەموو شتێکی نهێنی، ئاگاداری جێگەی هەموو شتێکە.

مێژوونووسان لەبارەی زانا و زیرەکی لوقمانەوە زۆر شتیان نووسیوە وتویانە: لوقمان بەندەیەکی بێنرخ بوە لای گەورەکەی خۆی، ڕۆژێ لەگەڵ بەندەکانی تریدا ناردی بۆ ناو باخ و هەندێ میوەی بۆ بهێنن، کاتێ گەیشتنە ناوباخ جگە لە لوقمان بەندەکانی تر هەموو میوەکەیان خوارد، بەندەکان پیلانێکیان بۆ لوقمان ساختە هێنا و ووتیان: لوقمان هەموو میوەکەی خوارد، گەورەکەیان کاتێ پرسیاری لە لوقمان کرد ووتی: تۆ دەرمانێ بدە بەهەمووومان بڕشێینەوە ئەو کاتە بۆمان دەرئەکەوێت کێمان میوەمان خواردوە، کاتێ ڕشانەوە پیلانەکەیان یەخەی بەندەکانی تری گرت.جارێ تر گەورەکەی لوقمان گرەوی کرد لەگەڵ تاقمێ ئاوی دەریاچەیەکی دیاریکراو بخوا، کاتێ هۆشی کردەوە بۆی دەرکەوت گرەوەکەی دۆڕاندوە،پەنای برد بۆلای لوقمان، ووتی بەو تاقمە: ئێوە ئەبێ ئەو ئاوانەی ئەڕژێتە ناو ئەو دەریاچەیەوە لایان دەن نەڕژێتە ناو ئەو دەریاچەیەوە، ئەوان ووتیان: ناتوانین. لوقمان ووتی: گرەوی لەسەرخواردنەوەی ئاوی دەریاچەکە کردوە نەك لەسەر خواردنەوەی ئاوی ئەو هەمو ڕووبارانە ئەڕژێنە ناوی.

﴿ يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ ئەی کوری خۆم: پێویستە تۆ بەردەوام بی بۆ کردنی نوێژەکان و، تۆ فەرمان بدە بە چاکە و ڕێگە بگرە لە خراپەکردنی ئادەمیزاد بەگوێرەی توانای خۆت.

﴿ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ وەتۆ ئارام بگرە لەسەر شتێ توشی تۆ ئەبێ لە ئازاری ئادەمیزاد. بە ڕاستی ئارامگرتن هەندێکە لەسەر بەردەوامبون لەسەر ڕاستی و لەو شتانەی خوای گەورە فەرمانی داوە بەکردنی و پێویستە بکرێ.

﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا﴾ وە تۆ ڕووی خۆت بە دەعییە وەرمەگێڕە لە ئادەمیزاد و بەبێ نرخیان بزانی و، تۆ مەڕۆ بەسەر زەویدا و بە دەعییە و دەمارەوە.

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾ بەڕاستی خوای مەزن هەمو کەسێ خۆی بەگەورە بگرێ و شانازی بە پلە وپایەو دارایی خۆی بکا خۆشی ناوێ.

﴿ وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ ﴾ وە تۆ لە ڕۆیشتنی خۆتا مام ناوەندی بە نە زۆر بەپەلە بڕۆ و نەزۆر لەسەر خۆ و ڕێزی جگەی خۆتت لابێ و، تۆ دەنگی خۆت نزم بکەرەوە بە گوێرەی پێویست. بەڕاستی خراپترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە و لەهەموو دەنگێ گەورەترە.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ ۗ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾ ئایا ئێوە نەتان زانیوە بەڕاستی خوای گەورە شتێ لەناو ئاسمانەکان و لەناو زەویدان ڕامی کردوە بۆ سودی ئێوە، وەك

مانگ و خۆر و ئەستێرەکان بۆ ڕوناکی و گەرمایی و شتێ لەناو زەوی‌دایە، وێنەی کێوەکـان و بیابان و و کانگاکان و درەخت و گیا و گیانلەبەران.

﴿ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴾ وە خوای مەزن چاکەی ئاشکرا و نهێنی خۆی تـەواو کردوە بەسەر ئێوەدا، چاکە ئاشـکراکانی وەك چـاو و گوێچکـە و زمـان و ئەندامـەکانی تـر و دەرمان و کارەبا و زۆرشتی تر، چاکە نهێنیەکان وەك دڵ و ئەقڵ و زانست کە بەچاو نـابینرێن، هەمو ڕۆژێ خوای مەزن چاکەیە ئەبەخشێ بە ئێوە و بەتازەیی بۆمانی دروست ئەکا کە بەبیرتانا نەهاتوە، بەوێنەی فڕۆکە و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت.

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴾ وە هـەندێ لـە ئادەمیزاد هەیە کەسێ و دوژمنایە و گفتوگۆی خراپ ئەکا لەبارەی یەکێتی و ئایینی خواوە بەبێ بەڵگە و زانستی و بەبێ شارەزابوونی بۆلای ڕاستی، بەو نامەیە ڕاستی بۆ ڕوون ئەکاتەوە.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ﴾ وە هەرکاتێ ببێژرایە بەبت پەرستان: ئێوە دوای شتێ بکەون خوا ناردوویەتـە خـوارەوە، ئـەیان ووت: بـەڵکو ئێمـە دوای شتێ ئەکەوین لـە باوباپیرانمان دەست کەوتووە لەسەر ئەو شتەبوون.

﴿ أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ ﴾ ئایـا ئـەوان دوای باوکیـان ئەکـەون بـا وەکو شەیتان بانگی ئەوان بکا بۆلای سزایەکی زۆر سەختی ئاگری کڵپەداری دۆزەخ؟

﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى ﴾ وە هەرکەسـێ بـە نیازی پاکەوە پەرستن بۆ خوای تەنها بکا و هەموکارێکی خۆی هەواڵەی لای خوا بکـا و، ئـەو کەسە بەکردار و گوفتار و بە دڵ چاکەکەربێ، دوایی بەڕاستی ئەو کەسـە دەسـتی گرتـوە بـە ئایینێکی زۆر بەهێزی وا ڕای ئەکێشێ بۆلای ڕزگاری و سەرکەوتن.

﴿ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ ﴾ وە بۆلای خوای مەزن ئەگەڕێتەوە کۆتایی هەموکاری نەك بۆلای جگەی خوا.

﴿ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ وە هەرکەسێ باوەڕی نەهێنابێ بەو ئایینە بەهێزە، دوایی بێ‌باوەڕی ئەو کەسە تۆ خەفەتبار نـەکا، بۆلای ئێمەیە گەڕانەوەی ئەوان، دوایی ئێمە هەواڵ ئەدەین بەوان بەشتێ ئەوان کردوویانـە لـە جیهاندا. بەڕاستی خوای مەزن ئەزانێ بەشتێ پەنهانیان داوە لـە دڵیانا و بەدەرونیانا ئەڕوا.

﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾ ئێمە وازیان لێ‌ئەهێنن ماوەیەکی کورت لـە جیهاندا، ڕابوێرن لەناویا بە ئارەزۆی خۆیان، لەپاشا ئێمە ئەوان ئـەنێرین بـۆلای سـزایەکی زۆر سەخت لەناو ئاگری دۆزەخدا.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وە ئەگەر تـۆ پرسیاربکەی لـەبێ بـاوەڕان چ کەسـێ ئاسمانـەکان و زەوی دروست

کردوە، بەڕاستی لە وولاّمدا ئەڵێن. خوای گەورە دروستی کردوون. تۆ بڵێی: هەمو سوپاس و ستایشێ بۆخوای مەزنە. بەڵکو زۆرتر لەوبێباوەڕانە تەماشای کاری خوا ناکەن ڕایان بکێشێ بۆلا زانیاری و ڕێگەی ڕاست.

﴿ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴾ هەر بۆ خوای گەورەیە شتێ لە ئاسمانەکان و شتێ لەناو زەویدان و بۆ جگەی خوانین. بەڕاستی خوا هەر ئەو خوایەیە پێویستی بەهیچ کەسێ نیە، شایستەی هەمو جۆرە سوپاس و ستایشێکە.

﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ وە بەڕاستی هەمو درەختێ سەوز بوە لە ڕوی زەویدا بهێنرێن و بکرێن بە خامە و پێنووس و، ئاوی دەریا یارمەتی بدا و بکرێ بە مورەکەب بۆی و پێنووسەکە بکرێ بەو دەریایەدا و دوایی پێ هات، لە دواییدا هەر حەوت زەریاکانی جیهان بهێنرێن و بخرێنە سەر دەریاکەی تر و بەکاربهێنرێن هەتا کۆتایی‌یان پێ‌دێ و پێنوسەکانیش لەناو ئەچن، فەرمودەو زانیاری‌یەکانی خوای مەزن کۆتایی‌یان پێ‌نایە، پێنوسەکان و هەمو ئاوی دەریاکان کۆتایان پێ‌دێ فەرمودەکانی خوا تەواونابێ و هەر ئەمێنێتەوە. بە ڕاستی خوا زۆر بەدەستەلاّتە، هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆی دائەنێ.

بۆ زانین: مانای وانیە ئەگەر زۆرتر لە پێنوسی هەمو درەخت و زۆرتر لە حەوت زەریاکان و ڕوبارەکان بهێنرێ فەرمودەی خوا کۆتایی پێ دێ. بەڵکو مەبەست ئەوە خوای مەزن وێنە بۆ بێباوەڕان ئەهێنێتەوە بە گوێرەی ئەقڵ و زانستی ئەوان.

﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ دروستکردنی ئێوەو هەمو گیانداران و زیندوکردنەوەیان وەك دروستکردن و زیندوبونەوەی تاکە کەسێکە. بەڕاستی خوای مەزن گفتوگۆی بێباوەڕان ئەبیسێ ، ئەزانێ بەو بوختانانەیان، لەمەو پاش پرسیاریان لێ‌ئەکرێ.

هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەیە: ئوبەی کوڕی خەلەف و هەندێ لە هاوڕێکانی وتیان: چۆن ئەو هەمو گیاندارانە بەیەکجار و لە یەك کاتا جارێ تر بە تازەیی دروست ئەکرێنەوە، لە کاتێکا ئادەمیزاد لەکاتێ دانانی لە منالّداندا هەتا کاتی لەدایکبوونی پلەی جۆراوجۆر ئەبڕی، خوای مەزن فەرموی: دروستکردنی ئادەمیزاد و گیانداران هەمویان و زیندوکردنەوەیان لە ڕۆژی دواییدا شایستەی ماندووبون نین بۆ خوای گەورە دروستکردنیان و زیندووبونەوەیان وەك دروستکردن و زیندوبونەوەی یەك کەسە، ئەوەی لای ئادەمیزاد گرانبێ لای خوا ئاسانە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ
وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ

بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ آيَاتِهِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ ﴾ ئایا تۆ نازانی بەڕاستی خوای مەزن شەووڕۆژی دروستکردن و کاتی یەکێکیان ئەبا بەناو کاتی ئەوی تریانا، یەکێکیان درێژ ئەبێ و ئەوی تریان کورت ئەبێ، کاتی وا ئەبێ ڕۆژ لەناو نیوەی گۆی زەیدایە و شەو لە نیوەکەی تریایەتی، ئەویش بەهۆی گەڕانی زەوی‌دا بەدەوری خۆیا و بەدەوری خۆردا.

﴿ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ وەخوای گەورە خۆر و مانگی ڕام کردوە بۆ سودی ئێوە، بەجۆرێ دروستی‌کردون و سودیان بۆ ئادەمیزاد هەبێ، هەریەکەیان ئەڕۆن بەجێگەی دیاریکراوی خۆیانا هەتا ئەو کاتەی خوا دیاری کردوە کە ڕۆژی دواییە، ئەو کاتە کۆتایی بەهاتوچۆیان دێت و، بەڕاستی خوای مەزن ئاگارداری شتێکە ئێوە بیکەن لە چاك و لەخراپ.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾ ئەو کارانەی ئەوتۆ خوا کردونی، بۆ ئەویە کە بەڕاستی ئێوە بزانن هەر خوا ڕاستە و دروست نی‌یە هاوبەشی بۆ دابنرێ و، ئەوەی ئێوە ئەیپەرستن هەر ئەو پوچە لە جگەی خوای گەورە و، بەڕاستی هەر خوا بالآداستە و لەهەموو شتێ گەورەتر.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ لْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ آيَاتِهِ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە کە بەڕاستی کەشتی ئەڕوا بەناو دەریادا بەهۆی چاکە و دیاریکردنی خوا بۆ ئێوە بۆ سودی ئێوە ڕامی کردوە، لەبەرئەوەی هەندێ لە بەڵگەکان لەسەر توانای خۆی نیشانی ئێوەی بدا.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بەڕاستی لەهاتوچۆی کەشتی بەناو دەریادا چەندین بەڵگەی ئاشکرا هەن بۆ هەمو کەسێ ئارامی زۆر هەبێ لەسەر شتێ خوای دیاری‌کردوە بۆ هەمو کەسێ سوپاسی خوا بکا لەسەر چاکە زۆرەکانی خوای گەورە بۆمان.

﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ وە هەرکاتێ شەپۆلی گەورەی دەریا بێباورانی ناو کەشتیەکەی داپۆشی و ئاو بەرزبووەیەوە بەم لاولای کەشتیەکەدا بەوێنەی شتێ سێبەر بکا بەلای سەریانا وەك کێوێکی گەورە ئەو کاتە ئەوبێباوەڕانە بە نیازی پاکەوە لەخوا ئەپاڕێنەوە و ڕزگاریان بکا لە ئازاری ئاوی دەریا و پەنا ئەبەن بۆلای خوا و ئایینی پاك هەر بۆ خوا دائەنێن و خۆیان لەبت پەرستی و گۆمان و ئارەزۆی خراپ دوور ئەخەنەوە.

﴿ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ﴾ دوایی کاتێ خوای گەورە ڕزگاری کردن بۆلای وشکایی زەوی، دوایی هەندێ دوای ڕێگەی ڕاست و ڕێگەی ئایینی پاك ئەکەون، هەندێ تریان چاکە و ڕزگارکردنی خوایان لەبیر ئەچێتەوە وەك لەوەوبەر توشی ئازار نەبووبێ.

﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴾ وە بە نیشانە ئاشکرا و ئایەتە پەك خەرەکانی نامەی ئێمە بێباوەڕ نابێ مەگەر کەسێ زۆر بێباوەڕبێ بیمەرج بێ، سوپاسی چاکەکانی خوای گەورە نەکا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ ﴾ ئەی هەمو ئادەمیزاد: ئێوە لە پەروەردگاری خۆتان بترسن و لەبێ فەرمانی ئەو خۆتان بپارێزن و، ئێوە لە سەختی و سامی ڕۆژێ بترسن کە ڕۆژی دواییە، هیچ باوکێ هیچ سودێ بەکوری خۆی نایەگەنێ و سزاکەی هەڵناگرن و هیچ خراپەیەکی لێناگیرێتەوە.

﴿ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئًا ﴾ وە هیچ منالێ سزای باوکی خۆی هەڵناگرێ و سزای لێناگیرێتەوە لەو ڕۆژەدا.

﴿ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾ بەڕاستی بەڵێندانی خوای مەزن بە ئێوە کە ڕۆژی دوایی و پرسیار دێت بەڵێنێکی ڕاستە و بێگومان دێتەدی، دوایی جوانی جیهان فریوی ئێوە نەدا و نەتان خەڵەتێنێ و لە ڕۆژی دوایی لاتان بداو باوەڕی پێنەکەن.

﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴾ وە شەیتانی فریودەرو هەموو کەسێکی خراپ فریوی ئێوە نەدا لە پەرستنی خوا و دانانی خوا بەیەك خوا.

پیاوێ بەناوی حەرسی کوڕی عەمری کوڕی حاریسە لەعەرەبە دانیشتوەکانی دەشت هاتە خزمەت پێغەمەر ووتی: چ کاتێ ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ. شارەکانمان ووشك و بێئاوە چ کاتێ باران ئەبارێ؟ ژنەکەی خۆمم بەسك پڕی بەجێهێشتوە چ کاتێ منالی ئەبێ و نێرە یان مێیە؟ من ئەزانم چ کاتێ لەدایك بووم و چ کاتێ ئەمرم. ئەزانم لە چ جێگەیەکدا لەدایك بووم، لە چ کاتێکدا ئەمرم. خوای مەزن فەرموی ئەو پێنج شتە هەرخوای مەزن ئەیانزانێ.

١- ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ﴾ بەڕاستی هەر لە لای خوایە زانینی کاتی دیاریکراوی ڕۆژی هاتن وپەیدابوونی دوارۆژ، سودەکەیشی ئەوەیە کە ئادەمیزاد بۆ هەموو کاتێ خۆیان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا و توێشو ئامادە بکەن بۆ ئەو ڕۆژە، هەموو کاتێ چاوەڕوانی بکەن.

٢- ﴿ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ ﴾ وە بەتەنها خوا باران ئەبارێنێ، یانێ بەڕاستی هەر خوا توانای بەسەر هاتنە خوارەوەی باراندا هەیە و، هۆی هاتنەخوارەوەی باران پەیداکردنی هۆیەکانی لە تیشکی خۆر و پەیدابونی هەڵم و بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان ئەوانە هەموویان بۆلای خوای مەزن ئەگەڕێنەوە. ئیتر ئەو ڕستەیە ئەوە ناگەیەنێ کاتی هاتنە خوارەوەی باران نەزانرێ کاتێ نیشانەی بارینی باران ئاشکرابو. بەڵام لەلایەن جگەی خوای گەورەوە ئەزانرێ چ کاتێ نیشانەکانی باران بارین پەیدا ئەبن.

پرسیار: زانایان کاتێ هەور پەیدابو ئەتوانن بیگۆڕن بۆ باران. کەواتە هاتنەخوارەوەی تایبەتمەندنی‌یە بەخواوە؟

وەڵام: ئەوە ڕاستە. بەڵام پەیداکردنی هەور و ڕەوانەکردنی باران لە جێگەیەکەوە بۆلای جێگەیەتر هەر بەدەستی خوایە.

٣- ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾ وە خوا ئەزانێ بەشتێ لەمنالداندا هەیە و، ئەزانێ بەسروشتێ لەسەری ئەبێ‌لەدوای لەدایکبوونی: جوان ئەبێ یا ناشیرین؟ زیرەك ئەبێ یا کەودەن؟ بەختیار ئەبێ یا بێبەخت؟ هەژارە ئەبێ یا ساماندار؟ خوێنەوار ئەبێ یا نەخوێنەوار هەرخوایش ئەزانێ لەچ کاتێکی نەگۆڕاودا لە دایك ئەبێ و، چەند شتی تریش. بەڵام بەهۆی ئامێری تازەوە ئەزانرێ ئەو شتەی لە منالدانایە نێرە یا مێینە.

٤- ﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ﴾ وە هیچ کەسێ نازانێ بەیانی چ شتێ ئەکا و چی بەسەر دێ لە چاك و لەخراپ. پۆشەوێژانو خوێندنەوەی ناولەپ و کێشانی رمل و دانەگرتنەوە و هاوردنی گیانی مردوان و، خەواندنی منالان و، هەواڵدان بەپەیدابوونی شتێ لەمەودوا و ئەستێرە گێران، هەمویان بێبنچینەن و گۆترەکارین، ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو شتانە هەبێ ئەقڵیان سوك و لاوازە، ئەو کەسانەیش بەکاریان دێنن و درۆزن و تالان کەری دارایی دانیشتوانن بەجۆرێکی ناڕەوا پارەوپول پەیداکردنە.

٥- ﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ وە هیچ کەسێ نازانێ لە چ جێگەیەکی زەوی‌دا ئەمرێ و لە چ کاتێکا ئەمرێ. چونکە ئەگەر بزانن چ کاتێ ئەمرن ترس و ئازار ئەکەوێتە دەرونیان و هەوڵی ئاوەدان کردنەوەی زەوی نادەن کە خوا فەرمانی پێداوە، بەتەمەڵی دائەنیشن. نمونەیە بۆ ئەوەی هیچ کەسێ نازانێ لە چ جێگەیە ئەمرێ: ئەگێڕنەوە فریشتەی مردن چوە لای سولەیمان تەماشای پیاوێکی ئەکرد لای سولەیمان دانیشتبو پیاوەکە بە سولەیمانی وت: ئەو پیاوە وەك منی مەبەستیێ، داوات لێ ئەکەم فەرمان بەبا بدە بەبا بۆ هیندستان، دوایی بردی و لە هیندستان فڕەی‌دا و کوتوپڕ فریشتەی مردن لە کات و جێگەی دیاری‌کرداودا گیانی کێشا.

**بە یاریدەی خوای مەزن کۆتایی پێ‌هات**

## ﴿ سورەتی سوژدە ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (١٦) هەتا ئایەتی (٢٠) لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٠) ئایەتن .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾

## بسم الله الرحمن الرحیم

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ الم ﴾ لەسورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تردا مانا و بیروبۆچوونی زانایان بۆ ئـەو پیتانـە روون کراونەتەوە.

﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ نامەیەکی ئەوتۆ نێـراوە بـۆ سـەر موحەمـەد پێك هاتوە لەو پیتانە ئێوە گفتوگۆی خۆتانی لێ پێك دێنن نامەیەکە گومانی تێدا نیـە و، هاتوەتـە خوارەوە لە لایەن پەروەردەکەری هـەمو بونـەوەران و، دەسـتکردی جگـەی خـوا و جـادو و گفتوگۆی پۆشەوێژان نی‌یە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾ بـەڵکو بـت پەرسـتان ئـەڵێن: ئـەو قورئانـە موحەمەد خۆی هەڵیبەستوە، بێگومان هەڵبەستراوی هیچ کەسـێ نی‌یـە؟ بـەڵکو ئـەو قورئانـە راستی‌یەکی ئەوتۆیە هاتوە خوارەوە لەلایەن پەروەردگاری تۆوە.

﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾ لەبەر ئەوەی تۆ ئەو تاقمە بترسێنی لە سزای رۆژی دوایی کە خوای مـەزن لـە پێش تـۆوە هیـچ پێغەمـەرێکی نـەناردوە بۆلایـان بیانترسێنێ، بۆ ئەوەی ئەوان شارەزایی وەرگرن.

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾ خـوا کەسێکی ئەوتۆیـە ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتەی لەنێوان ئاسمانەکان و زەویدان دروستی‌کردوون لەشەش ماوەی جیاوازدا و پلەپلە، خوای مەزن ئەی توانی بەیەك جـار دروسـتیان بکـات. بـەلام لەبەرئـەوەی بەندەکانی خۆی فێربکا هەموو کارێکیان پلەبەپلە و پەلـەی تێدا نەکەن و بیر لەدوارۆژ بکەنەوە.

﴿ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ لە پاش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی ئـەوەی لـەنێوانیابون خوای مەزن هەمو بونەورانی هێنایە ژێرفەرمانی خۆی بەتەنها و هێنانیە بونەوە، توانای پـەیداکرد بەسەریانا.

﴿ مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ بۆ ئێوە نیە لە جگـەی خـوای مـەزن هیچ کەسێ یارمەتیدان بدا و بۆتان بپارێتەوە مەگەر بەدەستوری خوای کەورە، هەر ئەو بەتەنـها بەرێوەبەرتانە، دوایی بۆ ئێوە بیرناکەنەوە و پەند وەرناگرن و بگەرێنەوە بۆلای راستی.

﴿ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ﴾ خوای مەزن بونەوەرانی دروستکردوە و، کاروباریـان ئەبا بەرێوە لـە ئاسمانەوە بۆلای زەوی، بەخشیویە بە هەمویان ئەو جـۆرەی خـوا ویسـتویەتی لـە سەری بن، توانا و زانیاری داوە پێیان رێگەی راست بدۆزنەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مانـای ئەو ئایەتە ئەوەیە: خوا سروش لـە ئاسمانەوە بە جبرەیلدا ئەنێرێتە خوارەوە بـۆلای زەوی و، بـەو سروشە فەرمانی هەموو بونەوەرانی دیاریکردوە و ئەیانبا بەرێوە.

﴿ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ لـە پاشا کـردەوە و کـاری ئادەمیزاد بەرز ئەبێتەوە بۆلای خوا لـە رۆژێکـا کـە رۆژی دواییـە ئـەندازەی مـاوەی ئـەو رۆژە

ئەوەندەی ماوەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە لە جیهاندا ئەیان ژمێرن. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەختە پرسیار لە ئادەمیزاد ئەکرێ لە هەمو کارەکانی.

﴿ ذَلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ ئەو کەسەی دروست کەری هەمو شتێکە و ئاگاداری هەمویانە ئەو کەسەیە ئەزانێ بەشتێ بونەوەران کردویانە و ئەیکەن گەورەبێ یا بچوك نهێنی بێ یا ئاشکرا، خوایەکە زۆر بەتوانا و بەدەستەڵات، خاوەنی میهرەبانی و بەزەییە بۆیان.

﴿ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە هەمو شتێکی دروستکردوە بە شیرینترین شێوەیە خۆی ویستویەتی و بەڵگە بن لەسەر توانای خۆی، هەرشتێ ئێوە ئەی بینن پەیرەو و پرۆگرامێکی بێداوە زۆر ڕێك و پێکە.

﴿ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ ﴾ وە خوا کەسێکی ئەوتۆیە یەکەمین مرۆڤی دروستکردوە کە باوکی هەموو ئادەمیزادە بە شیرینترین دیمەن لە خاکێکی بێ گیانی مردوو، منداڵەکانی دروستکردوە لە پوختەی تۆوێ لە ئاوێکی لاوازی پشتی پیاو و سنگی ژن، زاوزێ ئەکەن بە وێنەی گیاندارانی تر.

﴿ ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ ﴾ لە پاشا خوای گەورە ئەو مرۆڤەی دروست کراوە لە خاك ڕازانیەوە بەجوانترین دیمەن، بەجۆرێ هەموو ئەندامەکانی شیاوی یەکتربن و، ئەو گیانەی خۆی دروستی کرد بو کردی لە شیاوبو بەبونەوەرێکی زیندو.

﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ وە خوای گەورە گوێچکە و چاو و دڵی دروست کردوەبۆ سودی ئێوە بۆ بیستن و بینین و بیرکردنەوە، ئارەزۆی خواردنی بۆ دروستکردون بۆ مانەوەی ژیانتان، ئارەزۆی ژن ومێردی بۆ مانەوەی رەگەزتان، هەرشتێ خوا بۆئێوەی دروستکردبێ سودێکی تێدایە. لەگەڵ ئەو هەموە چاکانەدا ئێوە کەم جار سوپاسی خوا ئەکەن.

وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ

مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا بِمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا إِنَّا نَسِينَاكُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾

﴿ وَقَالُوا أئذا ضَلَلْنَا فِي الْأَرْضِ أئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ وە بێ باوەڕان ئەیان ووت: ئایا کاتێ ئێمە لەناوچوین و مردین و خراینە نـاو زەوی و ئەندامـەکانمان ڕزین؟ ئایا ئێمـە ئەبینـەوە بـە دروستکراوێکی تازە سەر لـە نوێ گیان ئەکرێتەوە بەلـەشماندا، زیندوبونەوە بۆ پرسیار و پاداشت و تۆڵـە نی‌یە.

﴿ بَلْ هُم بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ كَافِرُونَ ﴾ ئەو بێباوەڕانە هەرچەند بڕوایان بەبونی خـوا هەیـە. بـەڵام بڕوایان بەگەیشتنی سزای پەروەردگاری خۆیان نیە و، بڕوایان بە زیندووبوونەوە نیە.

﴿ قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ تـۆ بڵـێ بـەو کەسـانە بڕوایان بەزیندووبونەوە نیە: فریشـتەی مـردن گیـانی ئێـوە ئەکێشێ فریشـتەیەکی ئـەوتۆ بـەو سپێردراوە گیانی ئێوە بکێشـێ بێـئـەوەی ئێـوە ئاگـادرابن لـە پاشـا ئێـوە ئەگێڕرێنـەوە بـۆلای پەروەردگاری خۆتان، زیندو ئەکرێنەوە و پرسیاری ئەوشتانەتان لێ ئەکرێ لـە جیهاندا کردووتانە لـە چاك و لـە خراپ.

﴿ وَلَوْ تَرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ وە ئەگەر تۆ تاوانباران ببینـی کاتێ سەریان دائەنەوێنن لـە خزمەت پەروەردگاری خۆیانـا بەرسـوایی و شـەرمەزاری‌یەوە لـە ڕۆژی دوایدا.

﴿ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَارْجِعْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴾ ئەو کاتە بێبـاوەڕان ئـەڵێن: ئـەی پەروەردگاری ئێمە: هەموو ڕاستی‌یەکانمان بۆ دەرکەوت، بەچاوی خۆمان ئەو ڕاسـتیانەی ئێمـە بەدرۆمان ئەخستنەوە و بینیمان، ئـەو ڕاستیانە ئێمـە بـەدرۆمان ئـەزانین و بەهەڵـەداچوبوین و باوەڕمان پێنەهێنان و بیستمان، دوایی ئێمە داوا لەتۆ ئەکەین بمانگێڕنەوە بۆلای جیـهان و ئێمـە کاری چاك ئەکەین و، بەڕاستی ئێمە باوەڕ ئەهێنین.

﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي ﴾ وە ئەگەر ئێمە بمان ویستایە ئەمان بەخشی بەهەمو کەسێ ڕێگەیەً بۆلای شارەزابوون و، ئێمە ئەو ڕێگەیـەمان بـۆ ئامادەئـەکردن و ڕانمویان وەرئەگرت و، بەڵام فەرمان لـە لایەن منەوە دیاری‌کراوە و پێویسـت کـراوە بڕیارمـان داوە.

﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ بەڕاستی من دۆزەخ پـڕ ئەکـەم لـەو جنۆکـە و ئادەمیزادانە بە ئارەزۆی خۆیان بەردەوامبوون لـەسەر بێباوەڕی هەتا مردوون بەهەموویانەوە.

﴿ فَذُوقُوا بِمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا إِنَّا نَسِينَاكُمْ ﴾ دوایی ئێوە بچێژن سزای خوا بەهۆی بێباوەڕیتان بە گەیشتن بەم ڕۆژەی خۆتان و وازتان لەفەرمانی ئێمە هێنابوو. بەڕاستی ئێمە واز لەئێوە ئەهێنین سزای خۆتان بچێژن.

﴿ وَذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وە ئێوەی بێباوەڕ بچێژن سزای بەردەوام لە دۆزەخدا بەهۆی شتێکەوە ئێوە کردوتانە لە جیهاندا وبێفەرمانی ئێمەتان کردوە.

إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ جَنَّـٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾

﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ بەناوەڕۆکی ئایەتەکانی نامەی ئێمە ئەهێنن، کاتێ بەو ئایەتانە ئامۆژگاری کردن کاریان تێئەکا زۆر بە چاکی و بەسوژدەبردنەوە بۆ خوا ئەکەون بەڕودا، وە ئەو کەسانە بە پەیوەست بە سوپاسەوە پەروەردگاری خۆیان دور ئەخەنەوە لە شتێ شایستەی ئەو نیە پاکی ئەکەنەوە لەو شتانەی بێباوەڕان باسی ئەکەن لە هاوبەشدانان بۆی لە پەرستندا و، خۆیان بە گەورە دانانێن بۆ باوەڕهێنان و بۆ سوژدەبردن بۆ پەروەردگار.

﴿ تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ ئەو کەسانە تەنیشتی خۆیان دوور ئەخەنەوە ژێرەخەر و جێگەی خەوتن بەجێ ئەهێڵن لەبەر ترسی سزا و بەئومێد پاداشت و چاکە، پەروەردگاری خۆیان ئەپەرستن بەنیازی پاکەوە و، لەو شتانەی ئێمە بەوانمان بەخشیوە ئەیدەن بە هەژاران لە ڕێگەی ئایینی خوادا.

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ دوایی هیچ کەسێ لە بونەوەران نازانێ بەشتێ خوا ئامادەی کردوە بۆ باوەڕداران لە پاداشتی زۆر گەورە و لەشتێ چاوی ئەوانی پێ فێنك بکاتەوە و دڵی ئەوانی پێخۆش بکا لەبەر پاداشت دانەوەیان بەشتێ ئەوان کردویانە لە جیهاندا و ئەیکەن.

﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ ﴾ ئایا دوایی کەسێ باوەڕی هێناوە بە وێنەی کەسێکە دەرچوبێ لە سنوری خوای مەزن باوەڕی نەهێنابێ، ئەو کەسانە لە جیهاندا و لە کاتی مردندا و لە پاشەڕۆژدا وەك یەك نین.

﴿ أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلًا بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ جیاوازی نێوان باوەڕداران و بێباوەڕأن بەم جۆرەیە: کەسانێ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانی کردوە، دوایی بۆ ئەوان هەیە چەندین بەهەشتێ کە جێگەی گەڕانەوەی ڕاستی و بەردەوامە بۆ باوەڕداران و جیهان کۆچی تێدا ئەکرێ، ئەو بەهەشتانە بەخششی خوایە بۆ باوەڕداران بەهۆی شتێکەوە لە جیهاندا ئەیکەن، بەرزترین جێگەن بۆیان ئامادەکراوە.

﴿ وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لە بازنەی دیاریکراوی خوا دەرچوون و باوەڕیان نەهێناوە، دوایی جێگەی گەڕانەوەی ئەوان ئاگری دۆزەخە هەموو کاتێ بیانەوێ کە لەو وئاگرە بێنە دەرەوە ئەگێڕنەوە بۆ ناو ئاگرەکە و نایەڵن بێنەدەرەوە.

﴿ وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴾ وە بەو بێباوەڕأنە ئەبێژرێ بۆ زۆرتر ڕسواکردنیان: ئێوە بچێژن سزای ئاگرێکی ئەوتۆ ئێوە ئەو سزایەتان بەدرۆ ئەخستەوەو باوەڕتان پێی نەبو.

﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە هەندێ لە سزای جیهان ئەچێژین بەیت پەرستانی مەکە جگە لە سزای گەورەی ڕۆژی دوایی لە کوشتن و بەندکردن و گرانی و نەخۆشی و برسێتی، بۆ ئەوە ئەوان بگەڕێنەوە لە بت پەرستی بۆلای پەرستنی خوای تاك و تەنها.

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾ وە چ کەسێکە ستەمکارتر لە کەسێ ئامۆژگاری کرابێ بە ئایەتەکانی قورئـانی پـەروەدگاری خـۆی و بەو بەڵگە ئاشکرایانە لەسەر یەکێتی و تەنهایی خوای گەورە. لە پاشا ئەو کەسـە وازی هێنابێ لەو بەڵگە ئاشکرایانە. بە ڕاستی ئێمە تۆڵە ئەسێنین لە تاوانباران.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ فَلَا تَكُن فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ ۖ وَجَعَلْنَـٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَـٰكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا نَسُوقُ ٱلْمَآءَ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَـٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَـٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَلَا تَكُن فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَائِهِ ﴾ وە بـە ڕاسـتی ئێمـە نامەیـە کـە تەوراتە بەخشیبومان بە موسا هەروەك قورئانمان ڕەوانە کـردوە بـۆ تـۆ، کەواتـە نەکەویتـە نـاو گومانەوە لە گەیشتن بەو قورئانە، تۆ ئەو قورئانەت هەر لـە خـواوە وەرگرتـوە نـەك لــە لایـەن جگەی خواوە. بەجۆرێ تر مانای ئەو ڕستەکراوە. یانێ تۆ لـە گەیشتن بەموسا لـە میعراجدا یا لە ڕۆژی دواییدا گومانت نەبێ.

﴿ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ ﴾ وە ئێمە ئەو نامەی تەوراتە هاتوەتە خوارەوە بۆ سەر موسا گێڕامان بە شارەزاکەر بۆ بەنی ئیسرائیلیەکان بۆلای ڕێگەی ئایینی خوای گەورە.

﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾ وە ئێمە چەند پێشەوایەکمان گێڕا بەوەی فێری تەورات بن و ناوەڕۆکەکەی بزانن بە گوێرەی دەستووری ئێمە بەنوئیسرائیلیەکان شارەزای یاسای ئاین بکەن و، ئەوانیش بە گوێرەی فەرمانی ئێمە شاروزایی وەربگرن کاتێ ئارام بگرن لەسەر بیستنی ئامۆژگاری و باوەڕ بەبەڵگە ئاشکراکانی ئێمە بهێنن بەبێ گومان. مەبەست لەو پێشەوانە موسا و عیسا و ئەو پێغەمەرانەی نێوان ئەوانە، هەمو یەکێ لەوان ئازاری زۆریان توشبو بەدەست تاقمەکانی خۆیانەوە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر ئەوە فەرمانی دادپەروەریی خۆی ئەدا لە نێوان ئادەمیزادا و چاك و خراپیان جوێ ئەکاتەوە لە ڕۆژی دوایدا لە شتێکا ئەوان جیاوازی بیروباوەڕیان لەو شتەدایە، دوایی پاداشتی چاکەکەران ئەداتەوە بەبەهەشت، سزای خراپەکەران ئەدا بە ئاگری دۆزەخ. بێگومان ئەو ڕۆژە باوەڕداران و بێباوەڕان دیاری ئەکرێن.

﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ أَفَلَا يَسْمَعُونَ ﴾ ئایا خوای مەزن ڕونی نەکردوەتەوە بۆ دانیشتوانی مەکە ئێمە زۆر کەسمان لەناوبردوە لە پێش ئەوانەوە لە دانیشتوانی نەتەوە ڕابوردوە بێباوەڕەکان بەوێنەی تاقمی نوح و هود و سالح و موسا کە پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ ئەخستنەوە، ئێستا جێگەکانیان چۆڵە و بت پەرستانی مەکە ئەڕۆن بەناویانا، ئایا دوایی ئەوان بۆ ئامۆژگاری قورئان نابیسن و تەمێ خواربن بەناوبردنی ئەوانەی پێشو، هەندێکیان بەخنکاندنی ئاو و ئەوانی تر بەبومەلەرزە و بای سەخت و ڕۆچونی زەوی.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاء إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴾ ئایا ئەوان نازانن کە بەڕاستی ئێمە ئەو ئاوەی پەیدائەبێ لە هەڵمی زەریا و دەریاکانەوە ئەبێ بە هەوروباران ئەباری ڕەوانەی ئەکەین بۆلای زەوییەکی ووشکی بێگیا و بێئاو، دوایی بەهۆی ئەو ئاوەوە دەرئەهێنین ڕووەك و گیاو لەوەڕی زۆر چوارپێ و ئاژاڵەکانیان و خۆیان لەو گیا و لەوەڕە ئەخۆن و پێی ئەژین، ئایا دوایی بۆ ئەوان ئەو شتانە نابینن و ئامۆژگاری وەرگرن و باوەڕ بەخوا و بە پێغەمەر و بەقورئان بهێنن.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ وە بێباوەڕان ئەڵێن: چ کاتێ ڕۆژی جیابونەوەی ئێوە و ئێمە دێت و ئێوە سەرئەکەون و ئێمە سزا ئەدرێین ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ، دوایی ئێوە هەواڵ بدەن بە ئێمە بۆ کاتی هاتنی ئەو ڕۆژە.

﴿ قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لَا يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴾ تۆ بڵــێ بــەوان ڕۆژی هــاتنی دیاریکراوی خوا بۆ ڕۆژی دوایی سود ناگەیەنێ بــە کەســانێکی ئــەوتۆ باوەڕیــان نــەهێنابێ لــە جیهاندا، باوەڕهێنانیان سود بەوان ناگەیەنێ لەو ڕۆژەدا و مۆڵەتەیان نادرێ هەتا پەشیمان ببنــەوە و باوەڕبهێنن و، سودی بۆ ئەوان نابێ.

﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَانتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴾ دوایی تۆ واز لەو بێباوەڕانە بهێنە پەلە ئەکەن بــۆ هاتنی ڕۆژی دوایی و، تۆ چاوەڕوانی سەرکەوتن بکە لە لایەن خواوە. بەڕاستی ئەوبێ باوەڕانــە چاوەڕوانی دوارۆژی ڕسوایی خۆیان بکەن. هەرچەندە ئەوان ئەوەندە نەفامن چاوەڕوانی نــەمانی تۆ ئەکەن.

**کۆتایی بەماناکردنی ئەم سورەتە هات بەیاریدەی خوای مەزن**
**لە ڕۆژی هەینیدا (٢٩) مانگی سەفەر (١٤٢٤)ی کۆچی**
**بەرانبەر بە ( ٢٠٠٠/٦/٢ )ی زایینی**

# ﴿ سورەتی ئەلئەحزاب ﴾

لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٧٣) ئایەتن.

گێڕراوەتەوە لەدوای جەنگی ئوحود ئەبو سوفیان و ئەبوجەهل و عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل و ئەبولئەعوەری سولەمی چون بۆ مەدینە، بوون بەمیوانی عەبدولای کوڕی ئوبویەی سەرۆکی دوڕوەکان و ئەجەدی کوڕی قەیس و موعتەبی کوڕی قوشەیر، داوایان لە پێغەمەری خواکرد بەبێترس ڕێگەیان پێبدرێ بە ئارەزۆی خۆیان گفتوگۆبکەن لە خزمەتیا، دوایی ڕێگەیان پێدرا، ووتیان بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾: ئێمە داوامان لە تۆ ئەوەیە باسی خواکانمان بەخراپە نەکەی و بڵێی پارانەوەیان لە خزمەت خوادا سود ئەبەخشێ و لەوانی وەرئەگرێ، ئێمەیش واز لە تۆ ئەهێنین و باسی خوا و تۆ بەخراپە ناکەین، دووڕوەکانی مەدینەیش پشت گیریان لێکردن. عومەری کوڕی خەتاب توڕەبو، ووتی بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دەستورم پێبدە بیانکوژم، پێغەمەر فەرموی: من ڕێگەم پێداون، عومەر ووتی: بچنە دەرەوە بەنەفرەت بن و خەشمی خواتان لەسەربێ، دوایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: بیان کەنە دەرەوە لە مەدینە، ئەم ئایەتانەی خوارەوە لەو بارەوە هاتە خوارەوە و فەرموی:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٣﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ لە خوا بترسە و بەبەردەوامی خۆت لە خراپە بپارێزەو، تۆ پەیرەوی بێباوەڕان و دووڕووان مەکە. بەڕاستی خوا ئەزانێ بەنیازی خراپی ئەوان، هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و، بەگوێرەی زانیاری خۆی هەمو کارێ ئەکا.

﴿ وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ وە تۆ دوای شتێ بکەوە بەسروش لە لایەن پەروەردگاری خۆتەوە بۆلای تۆ هاتوە، بەردەوامبە لەسەر پەرستنی خوا و، پەیڕەوی بێباوەڕان و دووڕوان مەکە.

بەڕاستی خوا بەشتی ئەزانێ ئێوە ئەیکەین و ئاگاداری هەمو شتێکە و ئاگای لە نیازی خراپی ئەوان هەیە.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾ وە تۆ پشت هەر لەسەر خوا ببەستە و، هەمو کارو فرمانی خۆت هەر هەواڵەی لای خوا بکە و، خوا بەسە بە پاراستن بۆ تۆ، بۆلای ئەو ئەگەڕێتەوە هەمو کاری بونەوەران.

بۆ زانین:

١- جەمیلی کوڕی موعەمەر لەبێباوەڕان یەکێ بۆ لەو کەسانە شتی لەبیر نەئەچوەوە، زۆرشتی لەبەر ئەکرد، عەرەبەکان گومانیان وابو کە خاوەنی دوودڵە و، بەهەردووکیان شت وەرئەگرێ زۆرتر لە پێغەمەر بەگومانی خۆیان، دوایی کاتێ بت پەرستان لە جەنگی بەدردا شکان، ئەبوسوفیان جەمیلی بینی تاکە نەعلێکی بەدەستەوەیە، ئەوی تریانی لەپێدایە. ئەبوسوفیان پێیووت: دەنگ وباسی خۆمان چۆنە؟ ووتی شکستمان خواردوە، ئەبوسوفیان بە جەمیلی ووت: بۆ تاکە نەعلێکت بەدەستەوەیە؟ ئەوی تریانت لە پێدایە، جەمیل وتی: هەستم نەکردوە کە هەردوکیان لەپێمدا نیيە، دانیشتوان بۆیان ڕوون بویەوە ئەگەر خاوەنی دوودڵ بوایە لەبیری نەئەچوو تاکە نەعلێکی بەدەستەوەیە.

٢- ئەبێ بزانرێ: بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام ئەگەر کەسێ بەژنی خۆی بووتایە: تۆ لەلای من وەك دایکم وای، یا بیوتایە: تۆ لەسەر من وەك پشتی دایکم وای ئەو ژنە تەڵاقی ئەکەوت. بەڵام دوای هاتنی ئایینی ئیسلام ئەو ڕستەیە قەدەغەکراو، بڕیاریدا تەڵاقی پێناکەوێ. بەڵام پێویستە بریتی بۆ بدا (کفاوە) وەك لەمەودوا لە سورەتی (ئەلموجادەلەدا) ڕون ئەکرێتەوە.

١- کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زەینەبەی پورزای خۆی و کچی جەحشی مارەکرد کە لە پێشا ژنی زەیدی کوڕی حاریسە بۆ پێغەمبەر زەیدی کردبو بەکوڕی خۆی بەرلەوەی بکرێ بە پێغەمەر، زەید بە منالی دیل کرابوو کردبویان بەبەندە لەلایەن دانیشتوانی توهامەوە، دوایی حەکیمی کوڕی خوزافی کڕیووی و، بەخشیبووی بە خەدیجەی کچی خوەیلیدی پورزای، کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خەدیجەی مارەکرد زەیدی بەخشی بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ باوك و مامی زەید هاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، داوای کڕینەوەیان لە پێغەمەر کرد، پێغەمەر فەرموی: خۆی سەربەستە، ئێوەی هەڵبژارد بیبەنەوە بەبێپارە، زەید بەندەیی هەڵبژارد بەمەرجێ لەلای پێغەمبەربێ، دوایی ئازادی کرد و کردیشی بەکوڕی خۆی، بەگوێرەی دەستووری ئەو

ڕۆژەی پێش ئیسلام ئەو کەسە ئەبو بەکوڕی ڕاستی ئەو کەسە لەهەمو ڕوەیەکەوە، کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زەینەبەی مارەکرد کە لە پێشا ژنی زەید بوبو، تەلاقی دابو، جوەکان و دوڕوەکان ووتیان: موحەمەد ژنی کورشی خۆی هێناوە، خوای مەزن بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو سێ مەبەستانە، ئەم ئایەتانەی خوارەوەی ناردە خوارەوە و فەرموی.

مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾

﴿ مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ ﴾ خوا دروستی نەکردوە بۆ هیچ پیاوێ دوودڵ لەناو ورگیدا: بەجۆرێ کاتا دووشت بزانێ و لەبیری نەچێتەوە، یا بە یەکێکیان لە خوابترسێ و،بەوی تریان لە ئادەمیزاد بترسێ، بە یەکێکیان بڕوای وابێ ستەم کردن قەدەغەیە، بەوی تریان باوەڕی وابێ ستەمکردن ڕەوایە، بەیەکێکیان بڕوای بەتاکە خوایێ هەبێ و، بەوتریان باوەڕی بەچەند خوایە هەبێ، خوای مەزن لەو ئایەتەدا ڕونی کردوەتەوە ئادەمیزاد توانای ئەوەی نیە لە یەکاتا بڕوای بەدووشتی دژی یەکتر هەبێ، چونکە ئەو شتە پێچەوانەی یاسای سروشتە.

﴿ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ ﴾ وە خوا ئەو ژنانەی ئەوتۆ ژنی ئێوەن و، ئێوە زیهاریان لەگەڵ ئەکەن. وەك مێرد بەژنی خۆی بڵێ تۆ دایکی منی نەیگێڕاون بەدایکی ئێوە، چونکە ژن بە ووتەیە نابێ بەدایکی ڕاستی، بەڵام ووتنی قەدەغەیە و بریتی

لەسەر پێویست کراوە بەو مەرجانەی باسی ئەکرێ لە سورەتی (ئەلموجادەلە)دا دوایی ئەو ڕستە ئەگەر مێردەکەی کتوپڕ ژنەکەی تەلاق نەدا پێویستە کەفارەتی بۆ بدا بەر لەوەی بچێتە لای ژنەکەی. کەفارەتەکەی ئازادکردنی بەندەیەکە ئەگەر توانای بەندە نەبو شەست ڕۆژ لەسەر یەك بەڕۆژوبێ، ئەگەر توانای ئەوەیشی نەبو، خواردن بدا بەشەست هەژار.

﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ ﴾ وە خوا کوڕی جگەی ئێوەی نەگێڕاوە بە کوڕی ڕاستەقینەی ئێوە، کوڕی ڕاستی باوکی خۆیانن و، بە ووتەی ئێوە نابن بە کوڕتان، ئەو جۆرە کارە بەزمانی عەرەبی پێی ئەوترێ (التبنی).

﴿ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ ﴾ ئەو شتانەی ئێوە ئەیلێن گفتوگۆیەکی بێناوەرۆکە و بەدەمتانا دێ، نە ژنەکانتان ئەبن بەدایکی ڕاستەقینەی ئێوە و، نە کوڕی جگەی خۆتان ئەبن بەکوڕی ڕاستی و کوڕی پشتی ئێوە. کەواتە زەید کوڕێ موحەمەد نی یە. بەڵکو کوڕی ڕاستەقینەی حاریسەیە.

﴿ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ﴾ وە هەر خوا ڕاستی ئەفەرموێ و، هەر خوایش شارەزایی ئادەمیزاد ئەکا بۆلای ڕێگەی ڕاست، کوڕی جگەی خۆ کردن بە کوڕی ڕاستی ئێوە نابێ و، ژنەکانیشتان نابن بەدایکی ڕاستی ئێوە.

﴿ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ ﴾ ئێوە ئەو کەسانەی ئێوە کردونتان بەکوڕی خۆتان بانگیان بکەن بۆلای باوکی ڕاستی خۆیان نەك بۆلای ئەو کەسانە کردونیان بەکوڕی خۆیان، بانگی‌کردن ئەوان بۆباوکی ڕاستی خۆیان دادپەروەرترە لەوەی ئێوە بەدەم بیان بەکوڕی خۆتان.

﴿ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە نەتانزانی بەباوکی ڕاستەقینەی ئەوان برای ئایینی و دۆست و ئازادکراوی ئێوەن، دوایی ئێوە بەوان بڵێن: ئەی برای ئێمە، ئەی دۆستی ئێمە.

﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ ﴾ وە هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نیە لەشتێکا ئێوە لەوەبەر بەهەڵەو نەزانینەوە کردوتانە بەرلەوەی قەدەغەکراوە و، ووتوتانە کوڕی جگەی خۆ ئەکرێ بەکوڕ.

﴿ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ بەڵام گوناه لەسەر کەسێکە خراپەی ئەو شتە بزانێ و بەدەستیان قەست بیکا دوای قەدەغەکردنی و بڵێ: کوڕی جگە خۆ ئەکرێ بەکوڕ. وە خوا خۆش ئەبێ لەکەسێ بەهەڵە ئەو شتە بکا یا لەبیری بچێتەوە، خوا میهرەبان و بەبەزەییە بۆ کەسانێ بە دەستیان قەست نەیکەن.

ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ

وَأُوْلُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّـٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٨﴾

﴿ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ ﴾ پێغەمەر چاکتر و لەپێشتر و شایستەترە بۆ باوەڕداران لە خۆیان و، بەسودترە بۆیان و، پێویستە باوەڕداران پەیڕەوی بکەن بەبێ ڕەخنە و بەبێ‌دڵ گرانی پێغەمەر ئەفەرموێ: باوەڕناهێنێ هیچ یەکێ لە ئێوە هەتا هەمو ویستێکی دوای شتێ ئەکەوێ تۆ هێناوتە بۆلایان، دواکەوتن و پەیڕەوی کردنی شتێ پێغەمەر هێناوێتی پەیڕەوی‌کردنی‌شتێکە لە لایەن خواوە هاتوە نەك لە لایەن پێغەمەرەوە. کەواتە پەیڕەوی‌کردنی پێغەمەر دژی سەربەستی ئادەمیزاد نیە و سەربەستی زەوت نەکردوون. ژنەکانی پێغەمەر دایکی باوەڕدارانن لە ڕێزگرتنیان و قەدەغەکردنی مارەکردنیان، لە جگەی ئەوانەدا وەك ژنانی بێگانە وان.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوو کەسی ئەکرد بەبرای یەکتری، هەرکاتێ یەکێکیان بمردایە ئەوەکەی تریان ئەبو بەمیرات گری جگەی خزمانی تری، ئەو کارە بەردەوام بو هەتا خوای مەزن فەرموی:

﴿ وَأُوْلُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ ﴾ وە خزمە نزیکەکانی پشتی لەپێشترن لە میرات گرتندا لەباوەڕداران و کۆچ کەران، هەتا خزمی نزیکتر هەبێ میراتی مردوو بەوان نادرێ، ئەو فەرمانە تۆمارکراوە لە نامەی خوادا و، ئەبێ بەو جۆرەبێ.

﴿ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا ﴾ مەگەر كاتێ میرات ئەدرێ بەجگەی خزمانی نزیك كە ئێوە لە كاتی ژیانی خۆتانا وەسیەتتان كردبێ و ڕاتانسپاردبێ هەندێ لە دارایی خۆتان دوای مردنتان بدرێ بە دوست و خزمانی دوری میرات نەگر، ئەو كاتە دروستە ئەوەی ڕاسپێردراوە بدرێ بە جگەی خزمانی نزیك، ئەو فەرمانە بەردەوامە و، لەنامەی خوادا تۆماركراوە، هەركەسێ بێفەرمانی ئەو كارە بكا تاوانبارە... (مَّعْرُوفًا) بە مانا وەسیەتە.

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو كاتە بكەرەوە ئێمە لە پێغەمبەران و لەتۆ و لەنوح و لەئیبراهیم و لە موسا و عیسای كوڕی مەریەم پەیمانمان لەوان وەرگرتوە كە پەیامی ئێمە ڕاگەیەنن بە ئادەمیزاد و، بانگیان بكەن بۆلای پەرستنی خوا بەتەنها و نیازی پاكەوە.

﴿ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا لِّيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ وە ئێمە پەیمانێكی زۆر بەتینمان وەرگرت لەو پێغەمبەرانە لەبەر ئەوەی خوای مەزن پرسیار ئەكا لەو پێغەمبەرە ڕاستانە لە ڕاستی كردار و گفتوگۆی خۆیان و گەیاندنی پەیام بە ئادەمیزاد و، خوای گەورە ئامادەی كردوە بۆ بێباوەڕان سزایەكی خاوەنی ئازار.

ناوبردنی نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و موحەمەد لە دوای پێغەمبەرەكان لەبەر ئەوەیە بە ئەوان گەورەترینی پێغەمبەرانن، موحەمەدی پێش ئەوانی تر خستوە لەبەر ئەویە لەوان گەورەترە، هەموو پێغەمبەرانی تر كاریان بەدەستووری نوح كردوە، دوایی بەدەستوری ئیبراهیم دوواتر بە یاسای موسا، دوایی بەدەستوری عیسا، دوای ئەوان بەدەستوری موحەمەد هەتا ڕۆژی دوایی و دوای ئەو پێغەمبەرێ تر نایەت.

خوای مەزن لەم ئایەتانەی دواییدا باسی جەنگی (ئەلئەحزاب) ئەكا، یا جەنگی (خەندەق) ئەو باسە لە ئایەتی (٩)ی ئەم سورەتەوە دەست پێئەكا تا ئایەتی (٢٧)، بەكورتی باسی ئەو جەنگە ئەكەین.

١ – جوەكان لە پاش كۆچی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە مەكەوە بۆ مەدینە زۆرتر لە قوڕەیشیەكان ڕقیان پەرەی سەند بەرانبەر بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە تایبەتی دوای دەركردنی هۆزی بەنو نەزیری جوەكان دوای دەركردنی ئەوان دەستیان كرد بە هاندانی هۆزەكان عەرەب بۆ جەنگ كردن و بەگژاچوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەو مەبەستە كۆمەڵێ لە جوەكان بە سەرۆكایەتی حویەی كوڕی ئەختەب چوون بۆلای قوڕەیشیەكان لە مەكەو، هانیاندان لەسەر جەنگ كردن و ووتیان ئێمەش هاوپشتیان ئەكەین بۆ جەنگ كردن لەگەڵ موحەمەدو هاوڕێكانی، دوایی قوڕەیشیەكان چوون بۆلای هۆزەكان غەفتان كە بریتی بوون لە هۆزی موڕەو بەنو عامیرو بەنو فەزارەو ئەشجەع و سولەیم و، دوایی چوون بۆلای ئەو هەمووە هۆزانە تۆڵەیان بەسەر

موسڵمانانەوە هەبوو، هەموویان هاندان لەسەر دژایەتی کردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە هەموویانیان ڕاگەیاند کە قورەیشیەکان هاری کاریان ئەکەن بۆ ئەو مەبەستە و، توانیان کۆمەڵێکی زۆر پێکەوە بنێن ژمارەیان گەیشتە نزیکەی شەش هەزار کەس بە سەرۆکایەتی ئەبو سوفیان، هۆزەکانی بەنو سەعدو کەنانەو ئەسەدیش لایەنی ئەوانیان گرت، بە هەموویان گەیشتنە دەهەزار کەسی ئازاو جەنگاوەر، بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ لەژێر ئالأی ئەبو سوفیانا، کاتێ گەیشتنە لای مەدینە پێك هاتن کە هریەکە لە هۆزەکان بۆ ماوەی ڕۆژێ سەرۆکایەتی جەنگ وەربگرن یەك لە دوای یەك.

٢- کاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ موسڵمانان بە بیستنی ئەو ئەندازە لەشکرە زۆرە سەرسامبوون کەسەربازو چاوەڕێ هوشترو کەل و پەلی جەنگ و چەکی زۆریان هەیە، سەلمان لە ڕێگەو ڕێچکەی جەنگی ئەزانی و فێری بوبو کاتێ لەناو فارسەکاندا بوبو، بە پێچەوانەی عەرەبەکان بۆ سازدانی جەنگ نەزانبوون، دوایی بە ئاماژەی ئەو بیرەی سەلمان دەستیان کرد بە هەڵکەندنی خەنەق بەهەر چوار لای مەدینەداو، بە ئامۆژگاری سەلمان ڕازی بوون، بەم لاو لای مەدینەدا خەنەتیان لێدا، پێغەمەر (د.خ) هاوکاری هاوڕێکانی ئەکرد لە چاڵ هەڵکەنن و خۆڵ فڕێداندا، بەجۆرێ هەموو لەشی پیرۆزی تۆزاوی بوبو، چەند پیاوێ لە دوورەکان خۆیانیان ئەدزییەوە بە بیانوی بێ تواناییان بۆ جەنگ کردن، هەندێ تریان بێ دەستورو بەبێ ئاگاداری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەچونەوە بۆلای خێزانەکانیان، لەماوەی شەش ڕۆژدا خەنەقەکەیان تەواوکرد، ئەو خانوانە نزیکی خەنەقەکە بوون چۆڵیان کردن .

٣- قورەیشەکان و تاقمەکانی تر توشیان بوو بە تووشی ئەو خەنەتەوە، بۆیە نەیان توانی پەلاماری ناو شاری مەدینە بدەن، لە پشتی خەنەقەکەوە چادریان هەڵداو سەربازگەیان دانا، پێغەمەریش بەسێ هەزار موسڵمانەوە چوونە بەرانبەریان و پەشتیان دابەلای کێوی (سەلعەوە) کە کێوێ بوو لای مەدینەوە، سەربازگەیان بۆخۆیان پێك هێنا، خەنەقەکە کەوتە نێوان هەردوولایان،بۆ ماوەی چەن ڕۆژێ تیریان بۆیەکتر ئەهاویشت، بەو جۆرەی پێویستبوو هیچ لایەکیان پەلاماری ئەو لاکەی تریان نەئەدا .

٤- ئەو کاتە کاتی زستان بوو، سەرمای سەختی زۆر ڕوی ئەداو پەیدا ئەبوو، کۆمەڵێ لە بێ باوەڕان وایان دانابوو لە ماوەیەکی کەمدا موسڵمانان بنەبڕبن و، بەسەرکەوتووی بگەڕێنەوە، ئەوەی ئەوان چاوەڕوانیان ئەکرد دەستی نەدا بۆیان، حویەی کوڕی ئەختەب بۆی دەرکەوت ئەو هەلە لە دەست دەربچێ بۆی ناگەڕێتەوە، بە ناچاری چوو بۆلای کەعبی کوڕی ئەسەدی سەرۆکی بەنوو قورەیزەی جوەکان لە نزیك مەدینەو باشوری مەدینە کە لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا پەیمانی ئاشتەوایی هەبوو، حویەی باسی ئەو شتانەی بۆ کردن کە بەهۆی موحەمەدە جوەکان تووشی بوون لە دەردەسەری زۆر، ووتی: چاوەڕوانی

تووشبوونی شتی خراپتر ئەکرێ ئەگەر تاقمی باوەڕداران سەرکەون، داوای لێ کردن پەیمان لەگەڵ موسڵماناندا بشکێنن و یارمەتیان نەدەن، ڕێگە بکەنەوە لەلایەن خۆیانەوە بۆ پەلاماردانی موسڵمانان و وازی لێ نەهێنان هەتا داواکەی وەرگیراوە، کینەی جوەکان کلپەی سەند لە دڵیاناو پەیمانەکەیان شکاند.

٥- هەواڵی چونی حوبەی و، پەیمان شکانی بەنو قورەیزەو یارمەتی دانیان بۆ تاقمەکان گەیشت بە پێغەمەران ﴿ﷺ﴾. موسڵمانان ترسیان لێ پەیدا بوو، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نوێنەری خۆی نارد بۆلای بەنو قورەیزە بە بەشداربوونی مەعازی سەرۆکی هۆزی ئەوس، لەگەڵیان کەوتنە باسکردنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ کەعبدا، لە ئەنجامدا کەعب ووتی: پێغەمەر چ کەسێکە؟ پەیمانی نێوان ئێمەو موحەمەد نەماوە، هەردولایان کەوتنە جنێودان بە یەکتری، سەعدی کوڕی مەعاز بە توڕەییەوە گەڕایەوە بۆلای موسڵمانان.

٦- حوبەی کوڕی ئەختەب چویەوە بۆلای کۆمەڵەکان هەواڵی دانێ بە پەیوەستبون و هاوکاری بەنو قورەیزە لەگەڵیاندا، بەمەرجێ مۆڵەتی (١٠) ڕۆژیان بدرێتێ هەتا چەك و پێویستی تر ئامادە ئەکەن، تاقمی بێ باوەڕان سێ تاقمیان لە خۆیان پێك هێنا بۆ پەلاماردانی موسڵمانان: ئینولئەعوەری سولەمی لە سەروەی شیوی مەدینە لای خۆرهەڵاتەوە، تاقمی ئەلعویەینەی ئەلغەزادی لە خوارەوەی شیوی مەدینەی خوار ئاوای مەدینە، تاقمی ئەبو سوفیان لەبەردەم خەنەقەکەوە پەلاماری موسڵمانان بدەن .

٧- موسڵمانان ترسی زۆریان لێ پەیدابوو کە دوژمن لە سەرەوەو لە خوارەوە پەلاماریان بدەن، دانیشتوانی مەدینە هەموویان گومانی مەترسیان لێ پەیدابوو، هەر کۆمەڵێکیان بە جۆرێ: دووڕوەکان شاراوەی دڵی خۆیانیان لە کینە دەربڕی و، ئەیان ووت: موحەمەد بە ووتەی خۆی گەنجی کیسراو قەیسەر داگیر ئەکا کەچی هیچ کەسێ لە ئێمە ناتوانێ بچێتە دەرەوە بۆ سەر ئاو، هەندێ تریان ئەیان ووت: ناموسی ئێمە پێشانگای دوژمنانە بۆ پەلاماردانیان، بە پێغەمەریان ئەوت: دەستورمان پێ بدە بچینەوە بۆلای خێزانەکانمان هەتا بەرگری لە ناموسی خۆمان بکەین. لەلایەترەوە هورەو گیانی ئازایی بەرزبویەوە لە نێوان تاقمەکانی بێ باوەڕان بە جۆرێ لە جێگەیەکی تەنگەلانی خەنەقەکەوە پەڕینەوە بە ئەسپەکانیانەوە، یەکێ لەوان عەمری کوڕی عبدودی ئەلعامیری بوو کە بە هەزار جەنگاوەر ئەژمێررا لەگەڵ عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل، دوای علی ئەبو تالیب عەمری کوشت، هاوڕێانی بەرەو دووا ڕایان کرد.

٨- پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وای بە چاك زانی ژیریەتی بەکاربهێنێ بە جگەی چەك بۆ ئەو جەنگە. فەرموی بە نوعەیمی کوڕی مەسعود. بە ڕاستی تۆ یەکێکی لە هۆزی غەفتان. بەڵکو ئەگەر ئەتوانی بێ باوەڕان پارچە پارچە بکەیی و تێکیان بدەی، دوایی نوعەیم چوو بۆلای هۆزی

بەنوقورەیزەی جوەکان و، لەوەو بەر هاورێ و دۆستی ئەوانبوو، نەیان ئەزانی موسڵمان بوەو، دۆستایەتی کۆنی بیرخستنەوە، لە پاشا بەوانی ووت: ئەگەر ئێوە یاریدە بدەن لە دژی موحەمەد ئەبێ بزانن کە قورەیشیەکان و هۆزی غەفتان ناتوانن درێژە بە مانەوەی خۆیان بدەن لێرەو ئەگەڕێنەوە بۆلای جێگەی خۆیان، ئێوە بە تەنها ڕووبەڕووی موحەمەد ئەبنەوە، توانای ئەوەتان نابێ و تۆڵەتان لێ ئەکاتەوە. من ئامۆژگاری دۆستانەتان ئەکەم کە ئێوە دەست بە جەنگ مەکەن هەتا کۆمەڵێ لە پیاوە گەورەکانی قورەیش و غەفتان بە بارمتە لەلای خۆتان دایان ئەنێن هەتا نەتوانن هەڵبێن، هۆزی بەنو قورەیزە بە گفتوگۆی نوعەیم ڕازی بوون. لە پاشا نوعەیم چو بۆلای قورەیشیەکان، بەوانیشی ووت: خۆ ئێوە ئەزانن دۆستایەتی من و ئێوە نهێنی نیە لاتان. بە تایبەتی من موحەمەدم خۆش ناوێ، من شتێ ئەزانم پێویستە لەسەرم پێتان بگەیەنم، داوام وایە کەس نەزانێ، ئەوانیش ووتیان: ئێمە بە دڵی تۆ ئەکەین، نوعەیم ووتی: بەنو قورەیزە لەو کارە کردویانە لە شکاندنی پەیمانەکەیان لەگەڵ موحەمەدا لێی پەشیمانن، ئەوان هەوڵی دۆستایەتی ئەدەنەوە لەگەڵ موحەمەدا کە هەندێ لە پیاوە گەورەکانی ئێوە بدەن بە دەست موحەمەدەوە بیان کوژێ، بەمەرجێ ئەوان لەگەڵ موحەمەدبن هەتا ئێوە بنەبڕ ئەکا، ئامۆژگاری ئەکەم: ئەگەر بەنو قورەیزە ناردیان بۆلاتان و، داوای یارمەتیان لە ئێوە کرد کەسیان نەدەنە دەست. لەپاشا چوبۆلای هۆزی غەفتان، ووتی: ئەی خزمانی غەفتان: ئێوە هۆزو خزمی منن و خۆشەویسترین کەسی منن، بێگومان وائەزانم بڕوام پێ ئەکەن، ئەوانیش ووتیان: تۆ ڕاست ئەکەی، نوعەیم ووتی بەوان: ئەو شتەی بە قورەیشیەکانی ووتبوو، لە بارەی بارمتەوە، ووتی هیوام وایە کەس نەدەن بە بارمتە بە بەنو قورەیزە، لە پاشا ئەبو سوفیان و سەرۆکەکانی غەفتان پیاوێکیان نارد بۆلای هۆزی بەنو قورەیزە بەوان بڵێ: مانەوەمان لێرە درێژەی کێشاوە، ئێمە وای بە چاك ئەزانین بەیانی پەلاماریان بدەین لەناکاودا، بەنو قورەیزیەکان ووتیان:بەیانی شەممەیە ئێمە ناتوانین جەنگ بکەین، دووبارە ئێمە ناتوانین جەنگ بکەین هەتا ئێوە لە پیاوە گەورەکانتان هەندێکیان بە بارمتە لامان دانەنێن، ئەو کاتە بڕواتان پێ ئەکەین، دوایی قورەیشیەکان و غەتفانیەکان ووتیان: بەخوا نوعەیم ی کوڕی مەسعود ڕاستی کرد.

٩- دووایی شەو داهات، ڕەشەبایەکی زۆر گران هەڵی کردو بارانێکی زۆر باری و هەورەگرمەو بریسکەی زۆر دەستی پێ کردو زەوی ڕوون کردەوە، بەو بۆنەوە چادری تاقمەکان پارچە پارچە بوون و مەنجەڵ و کاسەو کەوچکیان شکاو ترسی زۆریان لێ پەیدابوو، فریشتەکان لەهەر چوارلاوە دەستیان کرد بە (الله أكبر). بە جۆرێ واکەوتە دەرونی تاقمەکانەوە کە موسڵمانان پەلاماریان ئەدەن، موسڵمانانیش بە هەلیان زانی دایان بەسەریانا دوایی ئەبو سوفیان بانگی کرد لە تاقمەکەی خۆی: بە گورجی بارکەن با

برۆینەوە. تاقمەکان بە پەلەو بە گورجی بە گوێرەی توانای خۆیان، کەل و پەلی خۆیانیان دا بەسەر کۆڵیاناو ڕۆیشتن، ڕۆژ بویەوە وە موسڵمانان چاویان بە تاقە کەسێ نەکەوت لە تاقمی بێ باوەڕان و، هیچ سودێکیان دەست گیرنەبوو، خوا موسڵمانانی سەرخست.

١٠ - پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوایی چونەوەی تاقمی بێ باوەڕان بیری لە کردەوەی بەنو قورەیزە کردەوە کە پەیمانەکەیان شکاندوە، چونکە ئەگەر تاقمی بێ باوەڕان ڕایان نەکردایە پشتیوانیان ئەکردن لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بۆیە کاتێ نیوەڕۆ پێغەمەر فەرمانی دا جاڕ بدرێ پێویستە موسڵمانان هەموویان نوێژی عەسر نەکەن هەتا نەگەنە لای هۆزی بەنوقورەیزە، موسڵمانان هەچەندە ماندوی ئابڵوقەی زۆریشبوبون بە گورجی چونە دەرەوەو، ئابڵوقەی قەڵاکانی بەنو قورەیزەیاندا، بۆ ماوەی بیست و پێنج شەو، لە دوایدا هیچ جۆرە تیر نازیە ڕوی نەدا، هۆزی بەنو قورەیزە تەنگیان پێ هەڵ چنرا، نەیان توانی لە قەڵاکانیان بێنە دەرەوە، کاتێ زانیان مانەوەیان لە قەڵاکانیانا سودیان پێ نابەخشێ بیریان لەبەسرهاتی پاشەڕۆژی خۆیان کردەوە. بەر لە هاتنی تاقمی بێ باوەڕان بەنوقورەیزە هاوسوێندی هۆزی ئەوسبوون، بە گومان خۆیان وایان دانابوو لەمەوپاش نایەڵن تووشی خراپە ببن، هەروایشبوو، تاقمێ لە هۆزی ئەوس چوون بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بە پێغەمەریان ووت: بەنوقورەیزە هاو سوێندی ئێمەن، داوایان لە پێغەمەر کرد: هەروەك لەوەو بەر هۆزی بەنو قەینقاعی جوەکان هاوسوێندی هۆزی خەزرجبوون بەرەلای کردن، ئێستاش هۆزی بەنوقورەیزەی هاوسوێندی ئەمانیش بەرەڵا بکا، پێغەمەر فەرمووی بە هۆزی ئەوس: ئێوە ڕازی ئەبن کەسێ لە خۆیان بکەن بە فەرمان ڕەوای خۆیان و پەیڕەوی بکەن، هەرشتێ ئەو کەسە بڕیاری لەسەردا هەموویان بەو بڕیار ڕازی بن، هۆزی ئەوس وویتیان: بەڵێ: ئێمە بەو بڕیارە ڕازی ئەبین، ئەوانیش بە جوەکانیان ووت: کەسێ دیاری بکەن بۆخۆتان بۆ ئەو کارە، ئەوانیش سەعدی کوڕی مەعازیان هەڵبژارد، لەبەر بەدبەختی خۆیان لەبیریان نەمابوو کاتێ سەعد چوبۆلایان گفتوگۆی خراپیان لێ پەیدا بووبوو، کاتێ پەیمانەکەیان شکاندبوو، گفتوگۆی ناڕەوایان بە پێغەمەر وتبوو، سەعد بەڵێنی لێ سەندن هەر شتێ ئەو بیڵێ بە دڵی بکەن، ئەویش فەرمانیدا هەموویان لە قەڵاکانیان بێنە دەرەوە، چەکەکانیان فڕێ بدەن، ئەوانیش بەو کارە هەڵسان، دوایی سەعد فەرمانی دا پیاوەکانیان بکوژن و ژنەکانیان دیل بکرێن و داراییان بەش بکرێ. کاتێ پێغەمەر گەڕایەوە بۆ مەدینە هەموو پیاوەکانی بەنوقورێزەی لە هەندێ خانوەکانی یاریدەراندا بەندکردن، دوایی فەرمانیان دا چاڵێکیان هەڵکەند، جولەکانیان تاقم تاقم ئەهێناو ئەدرا لەسەریان، یەکێ لەوانە لەسەری درا حوبەی کوڕی ئەختەب و کەعبی کوڕی ئەسەدبوو، ژمارەی کوژراوەکانیان گەیشتە نزیکەی حەوسەد کەس، لە دواییدا تەرمەکانیان لەو چاڵەدا نێژران، ژن و منداڵ و داراییان بەشکرا بەسەر موسڵماناندا، لە دوای دەرکردنی پێنج یەکی داراییان کە خرایە ناویە یتو لماڵەوە .

بەو جۆرەی باسکرا کۆتایی بە جەنگی ئەلئەحزاب هێنرا، لەمەو دووایش خوای مەزن لەو باوەڕەوە ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا۟ ٱلْفِتْنَةَ لَءَاتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا۟ بِهَآ إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ ٱللَّهِ مَسْـُٔولًا ﴿١٥﴾

﴿ يا أَيُها الذيْنَ أَمَنُوا أَذكُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ إذْ جاءَتْكُمْ جُنُودٌ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە بیری چاکەی خوا بکەن بەسەرتانەوە، کاتێ هاتن بۆلای ئێوە چەند لەشکرێك لە قورەیشیەکان و غەتفان و کەنانەو جوەکان کە نزیکەی (١٠) هەزار کەس بوون ئەیان ویست ڕوناکی ئیسلام بکوژێننەوەو لەناوتان بین.

﴿ فأرْسَلْنا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنوداً لَمْ تُرْوها وَكانَ اللهُ بِما تَعْلَمُونَ بَصِيراً ﴾ دوایی ئێمە رەوانەمان کرد بۆسەریان بایەکی سەخت، بە جۆرێ چادرەکانیانی بەسەردا روخان و پارچە پارچەی کردن، بۆیشم رەوانە کردن چەند لەشکرێ لە فریشتەکان ئێوە نەتان ئەبینین و خوا ئاگادارە بەشتێ ئێوە ئەیکەن لە هەڵکەندنی خەنەق کە خۆتانی پێ بپارێزن و، ئەزانێ بە پەنا بردنتان بۆلای خوای مەزن.

﴿ إذْ جاؤُوكُمْ مِنَ فَوْتِكُمْ وَمِنْ أسْفَل مِنْكُمْ ﴾ بیری کاتێ بکەنەوە لەشکری دژومن هاتن بۆلاتان لەسەرەوەی شێوەکەی لای خۆرهەڵاتی مەدینەو، لە خوارەوەی شێوەکەی رۆژئاوای مەدینە.

﴿ وَإذْ زاغَتِ الأبْصارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَناجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللهِ الْظُنُونا ﴾ بیری ئەو کاتە بکەنەوە چاوەکانتان هەر تەماشای لای دوژمنی خۆتانیان ئەکرد بەلای راست و بەلای چەپاو، لە ترسانا تەماشای هیچ لایەکی ترتان نەئەکردو، لە ترسانا دڵتان لە جێگەی خۆیا نەمابو گەیشتبوە قورگتان، چونکە سی ئادەمزاد لە کاتی زۆرترسا بەرز ئەبێتەوە بۆ کۆتایی قورك و، ئێوە چەندین گومانی جۆراوجۆرتان ئەبرد لەسەرکەوتن و ژێرکەوتن: باوەرِدارانی پاك ئەیانزانی خوای مەزن بەڵێنی خۆی ئەباتە سەرو ئاینی خۆی سەرئەخا، بێ باوەران و دووروان و باوەرِ لاوازان گومانیان وابوو نەگبەتی موسڵمانانی گرتوەو موحەمەد لەناوئەچێ.

﴿ هُنالِكَ ابْتُلِي الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزالاً شَدِيداً ﴾ ئا لەو کاتە ناسك و گرانەدا باوەرِداران تاقی ئەکرێنەوەو، باوەرِداران لە ترساو لە زۆری دوژمن جم و جوڵیان پێ ئەکەوێ زۆرِ بەسەختی و بە گرانی .

﴿ وَإذْ يَقُولُ الْمُنافِقُونَ وَالذيْنَ في قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ ما وَعَدَنا اللهُ وَرَسُولَهُ إلاّ غُرُوراً ﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە کە دووروان و کەسانێکی ئەوتۆ نەخۆشی و لاوازی باوەرِی لە دڵیانابوو ئەیان ووت: خواو پێغەمەری خوا موژدەیان نەئەدا بە ئێمە مەگەر هەربۆ فریودانی ئێمە بووە، بەڵێنێکی پوچ دەرچوو، ئەیووت ئێمە گەنجی کیسراو قەیسەر داگیرئەکەین کەچی ئێمە ناتوانین بچین بۆ دەرەوە.

﴿ وَإذْ قالَتْ طائِفَةٌ مِنْهُمْ يا أهْلَ يَثْرِبَ لامُقامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا ﴾ وەبیری ئەو کاتە بکەنەوە: کۆمەڵێ لە دوورووەکان کاتێ پێغەمەرو هاورێکانی دەستیان کرد بە کەندنی خەندەق ئەیان ووت: هەڵکەندنی خەندەق بێ سوودەو، رێگە لە جەنگ ناگرێ و، دووای هاتنی لەشکرێ بێ باوەران ووتیان بە جەنگاوەری باوەرِدارانی ئەی دانیشتوانی یەسریب ئێوە توانای وەستان و جەنگ کردنتان نیە لەگەڵ ئەم لەشکرە زۆرو بەهێزەدا، دوایی ئێوە بگەرێنەوە. بۆناو مەدینە و بۆناو خاوو خێزانی خۆتان. یەسریب ناوی مەدینەیە بەر لە هاتنی پێغەمەر بۆ مەدینە، ناونراوە بەناوی پیاوێ لە عەمالیفەکان کە بە ناوی یەسریب بووە کە بە مانا ترساندنە، بۆیە پێغەمەر ناوەکەی گۆرِی بە (طبیة).

﴿ وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِنْهُمُ النَّبِيَ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنا عَوْرَةٌ وَما هِيَ بِعَوْرَةٍ إِنْ يُرِيدُونَ إِلاَّ فِراراً ﴾ وەتاقمێ لە دووڕووەکان داوای دەستوریان ئەکرد لە پێغەمەر کە بگەڕێنەوە بۆ ناو خێزانەکانیان و، ئەڵێن: بەڕاستی خانوەکانمان لە دەرەوەیەو بۆیە دزوتیر ئەیان گرێتەوەو قایم نین، پێغەمەر دەستوری پێ ئەدان بۆچاودێریان. بەلاّم خوای مەزن بە درۆی خستەوەو، دوروی ئەوانی ئاشکرا کردو فەرموی: خانوەکانیان بە دەرەوەنیەو، ئەوان هیچ مەبەستێکیان نیە مەگەر ئەوە نەبێ ڕابکەن و خۆیان لە جەنگ ڕزگار بکەن.

﴿ وَلَوْ دُخِلَتْ مِنْ أَقْطارِها ثُمَ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لآتَوْها وَما تَلَبَّثُوا إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ وەئەگەر لە هەموو لایەکی مەدینەوە دوژمنانی ئیسلام بهێنرێتە سەر خانوەکانیان و، لە پاشا لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە داوا لەو دووڕوانە بکرێ لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕێن و جەنگ بکەن لەگەڵ موسڵمان و بێ ئایینی خۆیان ڕابگەیەنن، بەڕاستی پەنا ئەبەن بۆلای بێ باوەڕی و، لە ئایینی خوا وەرئەگەڕێن کوتوپڕ مەگەر ماوەیەکەم ڕاوەستن.

﴿ وَلَقَدْ كانُوا عاهَدُوا اللهَ مِنْ قَبْلُ لا يوَلُّونَ الأدْبارَ وَكانَ عَهْدُ اللهِ مَسْئولاً ﴾ وەهەندێ لە دووڕووەکان بەر لە جەنگی خەندەق کاتێ ویستیان لە جەنگی ئوحودا ڕابکەن بەڵێنیان دابوو بە پێغەمەری خوا بەرەو دوا ئەگەڕێنەوەو جەنگ بکەن لە خزمەت پێغەمەردا هەتا مردن و، جارێ تر کاری وا نەکەن و، بەڵێندان بە خوای مەزن لە ڕۆژی دواییدا پرسیاری بۆ ئەوکرێ و، دووایی پێویستە ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکرێ.

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ

اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ الْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا وَإِن يَأْتِ الْأَحْزَابُ يَوَدُّوا لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِي الْأَعْرَابِ يَسْأَلُونَ عَنْ أَنبَائِكُمْ وَلَوْ كَانُوا فِيكُم مَّا قَاتَلُوا إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾

﴿ قُلْ لَنْ يَنْفَعَكُمْ الْفِرارُ إنْ فَرَرْتُمْ مِنَ الْمَوتِ أو الْقَتْلِ وَإذاً لا تُمَتَّعُونَ إلاّ قَلِيلاً ﴾ تـۆ بـەو کەسانە بڵێ هەڵدێن لـە جەنگدا: ڕاکردن و هەڵهاتن سود بـە ئێـوە ناگەیـەنێ ئەگـەر ئێـوە ڕابکەن لـە مردنی جێگەی خۆتان یا لـە کوشتنی جەنگداو، هەڵهاتن تەمەنی ئێوە درێژ ناکاو، ئەگەر ئێوە ڕزگارتان ببێ لـە کوشتنی جەنگدا ئێوە ناژین و ڕانابوێرن مەگەر ماوەیەکی کـەم، دوایی لـە کاتی دیاری کراوی خۆتانا ئەمرن و، ئەخرێنە دۆزەخ.

﴿ قُلْ مَنْ ذا الذي يَعْصِمُكُمْ مِنَ اللهِ إنْ أرادَبِكُمْ سُوءاً أوْ أرادَبِكُمْ رَحْمَـةً ﴾ تـۆ بڵـێ بـەو دووڕوانە: چ کەسێکی ئەوتۆیە لـە جگەی خوا ئێوە بپارێزێ لـە خراپە ئەگەر حوا بیەوێ ئێوە تووشی شکان بکا لـە جەنگدا، یا بیەوێ تووشی ئێوەی بکا چاکەو سەرکەوتن؟.

﴿ وَلا يَجِدُونَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللهِ وَلِياً وَلا نَصِيرً ﴾ وەدەستیان ناکەوێ بۆ خۆیان لـە جگەی خوای مەزن هیچ دۆستێك و هیچ یارمەتی دەرێ ڕزگاریان بکا لــەکاتی توشـبونی ئـازارداو، ئازارەکە بگێڕێتەوە لـەوان؟.

﴿ قَدْ يَعْلَمُ اللهُ الْمُعَوقِينَ وَالْقائِلِينَ لأخْوانِهِمْ هَلُمَ إلَيْنا ﴾ بەڕاستی خوا ئـەزانێ بـەو کەسـانە دووڕوون و خۆیان لائەدەن لـە جەنگ کردن و نارۆن بۆ هەڵکەندنی خەندەق و، ئەزانێ بەو کەسانەیش بە برا دەرەکانی خۆیان ئەڵێن: وەرن بۆلای ئێمەو، واز لـە یارمەتی دانی موحەمەد بهێنن و، بە خۆشی بژین، موحەمەدو تاقمەکەی لـەناو ئەچن و بەرگـەی ئـەم لـەشکرە زۆرە ناگرن .

﴿ وَلا يأتُونَ الناسَ إلاّ قَلِيلاً أشِحَةً عَلَيْكُمْ ﴾ وەئەو دووڕوانـە نـارۆن بـۆ جـەنگ کـردن مەگەر ماوەیـەکی کـەم، هەرئـەوەندە موسـڵمانان بیـان بینـن، لـە پاشـا ئەڕۆنـەوە بـۆلای خێزانەکانیان بەشداری جەنگ ناکەن، ئەو دووڕووانــە ڕژدو چروکـن یارمـەتی ئـاینی خـوا نادەن بە دارایی خۆیان و خۆیشیان ناچن بۆ جەنگ و یارمەتی ئێوە نادەن، خـۆ دزینـەوە لـە جەنگ بۆ بەرزبونەوەی ئاینی ئیسلام لێ بوردنی بۆنیە لای خوای مەزن.

﴿ فَأذا جاءَ الْخَوْفَ رَأَيْتُهُمْ يَنظُرونَ إلَيْكَ تَدُورُ أعْيُنُهُمْ كالذي يُغشى عَلَيْهِ مِنَ المَوتِ ﴾ دوایی کاتێ بهاتایه شتێ چاوەڕوان ئەکرا لە ترسی دوژمن، یا لە تۆ بترسانایه، تۆ ئەوانت بە جۆرێ ئەبینی چاوی خۆیانیان ئەسوڕانەوە بە چەپاو بە ڕاستا لە ترسانا بە وێنەی کەسێکی ئەوتۆ بێهۆشی بەسەردا بێت لەکاتی سەرە مەرگدا.

﴿ فَأذا ذَهَبَ الْخَوْفَ سَلَقُوكُمْ بِألْسِنَةٍ حِدادٍ أشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ ﴾ دوایی کاتێ ترسی دوژمن ڕۆیی و کەوتنە خۆشی بە زمانێکی تیژو کراوە ئازاری ئێوە ئەدەن بە گفتوگۆی خراپ و نالەبارو لە دانیشتنی خۆیانا جنێوتان ئەدەنێ زۆر بەبێ شەرمانە، ئەو دووڕوانە لەکاتی بێ ئومێدیا ترسنۆکن. بەڵام لەکاتی بەشکردنی دەست کەوتا گفتوگۆ لەسەر بەش ئەکەن و ، دەنگ بەرز ئەکەنەوەو، نارەزایەتی خۆیان دەرئەبڕن و ئەڵێن: ئێمە شایستەین بەوەی بەشداربین لەو دەست کەوتانەدا،ڕژد و چروکن لەسەر چاکەکردن.

﴿ أوْلئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأحْبَطَ اللهُ أعْمالَهُمْ وَكانَ ذلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيراً ﴾ ئەو کەسانە بە نیازی پاکەوە باوەڕیان نەهێناوە، دوای خوا پاداشتی کردوەکانیانی پوچ کردوەتەوە، چونکە لەبەر خوا لەگەڵ ئێوە نەبوون و، پوچ کردنەوەی پاداشتی کردەوەکانیان ئاسانە لەسەر خواو، ستەمی تێدا نیە هەتا بەردەوامبن لەسەر بێ باوەڕی و دووڕوی .

﴿ يَحْسَبُونَ أنَ الأحْزابَ لَمْ يَذْهَبُوا ﴾ ئەو بێ باوەڕو دووڕوانە گومان ئەبەن لەبەر ترسنۆکی خۆیان ئەو تاقمە بێ باوەڕانە نەڕۆیشتوون و نەگەڕاونەتەوەو نەشکاون و بە ئومێدی ئەوەن موسڵمانان نەمێنن.

﴿ وَإنْ يَأتِ الأضْرابُ يَوَدُ لَوْ أنَهُمْ باذُونَ فِي الأعْرابِ يَسْألُونَ عَنْ أنْبائِكُمْ ﴾ وەئەگەر جارێ تر تاقمە بێ باوەڕەکان بگەڕێنەوە بۆلای مەدینە ئاوات ئەخوازن دوربن لە مەدینەوە لە دەشتابن لەناو عەرەبە دەشتەیەکاندا، پرسیار لە هاتوچۆکەران بکەن لەشتێ موسڵمانان توشیان ببێ و هەواڵی ئێوە بدا بەوان.

﴿ وَلَوْ كانُوا فِيْكُمْ ما قاتَلُوا إلاّ قَلِيلاً ﴾ وەئەگەر ئەم جارەیش لە ناو ئێوەدابن و جەنگ دەست پێ بکاتەوە جەنگ لەگەڵ ئێوە ناکەن مەگەر ماوەیەکی کەم، هەتا ئێوە بیان بینن.

لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾

﴿ لَقَدْ كانَ لَكُمْ فِي الرَسُولِ اللهِ أسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كانَ يَرْجُوا اللهَ وَالْيَوْمَ الأخِرَ وَذَكَرَ اللهَ كَثيراً ﴾ بەڕاستی بۆ ئێوەی باوەڕدار هەیە لە کردەوەو کفتوگۆی نێرراوی خوادا دواکەوتنێکی چاك و شیرین لە جەنگداو لە جگەی جەنگداو، لە ئارام گرتنیدا لەسەر توشبوونی کاری گران و سەخت، بۆ کەسێ بە ئومێدی بە خزمەت گەیشتنی خواو پاداشتی ڕۆژی دوایی و خۆشی بەردەوام و، بۆ کەسێ یادی خوا بکا بە زۆری بە بەجێ هێنانی نوێژەکان و بە پەرستنی خواو بەخشینی خۆی و دارایی بەنرخی لەبەرخوا.

﴿ وَلَما رَأى الْمُؤْمِنونَ الأحْزابَ قالُوا هذا ما وَعَدَنا اللهُ وَرَسُولَهُ وَصَدَقَ اللهُ وَرَسُولَهُ ﴾ وەکاتێ باوەڕداران چاویان کەوت بەو تاقمە بێ باوەڕانە هاتبونە سەریان لە مەدینمەدا ووتیان: ئەمە ئەو شتەیە خواو پێغەمەری خوا بەڵێنیان دابوو بە ئێمەو، ڕاستیان فەرموە خواو فروستادەی خوا.

ئەوەی شایانی باسێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەر لــە هــاتنی تــاقمی بێ باوەڕەکــان فــەرموی بــە موسڵمانان: لـەمەو پاش ئێوە تووشی ئازار ئـەبن و، بێ بـاوەڕان و بـت پەرستان یـاریدەی یەکتری ئەدەن بۆ بنەبڕی موسڵمانان، کاتێ موسڵمانان چاویان کەوت بەو تاقمانە هەر چوار لایان لێ گرتوون ووتیان: ئا ئەمەیە: ئەو بەڵێنەی خواو پێغەمەر دابویان بە ئێمە.

﴿ وَما زادَهُمْ إلاّ إيمانا وَتَسْليماً ﴾ وە توشبونی ئازاری سەخت و بینینی ئەو تاقمــە زۆرەی بێ باوەڕان هیچ شتێکی بۆ باوەڕداران زۆر نەکرد مەگەر باوەڕهێنان بـەخواو بڕواکـردن بـە بەڵێنی خواو خۆ بەدەستەوە دان بە فەرمانەکانی خوای مەزن.

﴿ مَنَ الْمُؤْمِنِينَ رجالٌ صَدَقُوا ما عاهَدُوا اللهَ عَلَيْهِ ﴾ هەندێکن لـە باوەڕداران چەند پیــاوێ بڕوایان بەوشتە هەبوو ئەوان بەڵێنیان دابوو بەخوا لـەســەر جێبـەجێکردنی کـە ڕاوەستانە لـەگەڵ پێغەمەر بۆ جەنگ کردن لـەبەر ئەو بەڵێنەدا بومان لـەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە.

﴿ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضى نحبه وَمِنْهُمْ مَنْ ينتظر وَما بَدَّلوا تَبْديلاً ﴾ دوایی هەندێ لـەو باوەڕدارانە لـە بەڵێنی خۆیان بونەوەو بەجێیان هێنا کەسانێ مردن یا کــوژران بــەر لــە ڕوداوی جــەنگی تاقمەکان، لـە جەنگی ئوحودو جگــەی ئوحــودا، هەیشــیانە کەســێ چــاوەڕوانی کوشــتن یــا سەرکەوتن ئەکاو، باوەڕداران پــەیمانی خۆیــان تــاگۆڕن بــە هیــچ جــۆرە گۆڕانــێ گومانیــان لـەسەرکەوتندا نیە.

﴿ لِيَجْزِيَ الصّالِدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِبَ الْمُنافِقِينَ إنْ شاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إنَ اللهَ كانَ غَفُوراً رَحِيماً ﴾ بەڕاستی خوا فەرمان ئەدا بە جەنگ کردن لـە ڕێگەی خوادا لـەبەر ئەوەی پاداشتی باوەڕدارانی ڕاست بداتەوە لـە ڕۆژی دوایدا بەهۆی ڕاستی خۆیانــەوە لــە جیــهاندا، چونکـە هیچ شتێکیان نەگۆڕیوە لـەوەی پێویستیان کردبوو لـەسەر خۆیان و، لـەبــەر ئــەوەیش ســزای دوڕوان بدا ئەگەر ئارەزۆیان وابوو بمرن لـەسەر دووڕوی یا یارمــەتیان بــدا بــۆلای پەشــیمان بوونەوە. بەڕاستی خوا خۆش ئـەبێ لــەو کەســانەی پەشیمان ئەبنــەوەو خــاوەنی بــەزەیی و میهرەبانیە بۆیان .

﴿ وَرَدَ اللهُ الذِيْنَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَـمْ يَنـالُوا خَـيْراً ﴾ وەخــوا کەســانێکی ئــەوتۆ باوەڕیــان نەهێنابو لـەو تاقمانە هاتن بۆسەر باوەڕداران بەڕق و کینەی خۆیانــەوە گەڕاندنیــەوە بــۆلای جێگەی خۆیان و هیچ چاکەیەکیان دەست نەکەوت و بە ئاواتی خۆیان نەگەیشتن و بەســەر شۆڕی گەڕانەوە.

﴿ وَكَفى اللهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتالَ وَكانَ اللهُ قَوِياً عَزيــزاً ﴾ وەبەســە بــۆ بــاوەڕداران خــوا ئــەو جەنگە لـەوان لابدا بەهۆی ناردنی پایەکی سەخت و ڕەوانەکردنی فریشــتەکان بــۆ یارمــەتی دانیان و، خوا زۆر بە توانایەو زۆر بە دەستەڵاتە یارمەتی باوەڕداران ئەداو تۆڵـە لـە بێ بــاوەڕ ئەسێنێ.

﴿ وَأَنْزَلَ الَّذِيْنَ ظَاهَرُوهُمْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِنْ صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ﴾ وەخوا کەسانێکی ئەوتۆ لە خاوەن نامەکانی بەنو قورەیزە یارمەتی تاقمە بێ باوەڕەکانیان دابوو لە قەڵاو کۆشکەکانی خۆیان هێنانیانە دەرەوەو، ترسی فرەدایە دڵیانەو بیم و خەفەت دایگرتن .

﴿ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴾ ئێوە تاقمێکتان لە بەنوقورەیزیەکان کوشت کە بریتی بوون لە پیاوەکانیان و، ئێوە تاقمێ ترتان لەوان دیل کردن کە بریتی بوون لە مناڵەکانیان و ژنەکانیان. کوژراوەکانیان گەیشتنە حەوت سەد کەس.

﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَارَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَأَرْضًا لَمْ تَطَئُوهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا﴾ وەخوا ئێوەی موسڵمانانی داناو کردی بە میرات بۆ ئێوە کشت و کاڵ و کۆشك و قەڵاکان و دارایی بەنوقورەیزەو، زەوێکی تر ئێوە دانەنیشتوون لەناویا لەمەوبەر خوای ئێوەی لەناودا وەك زەوی خەیبەر لە ساڵی حەوتی کۆچیدا، دواتریش زەوی فارس و ڕۆم و، خوا دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکا.

بۆ زانین: وەك لەمەوبەر باسمان کرد هۆزی بەنو قورەیزەی جوەکان دانیشتوی مەدینەو ئەم لاو ئەو لای مەدینە بوون و هاوپەیمانی موسڵمانان بوون، بەڵام کاتێ تاقمە بێ باوەڕەکان لە ساڵی چواری کۆچیدا هاتنەسەر مەدینە بۆ بنەبڕکردنی موسڵمانان، بەنو قورەیزیەکان پەیمانەکەیان شکاندوو بەڕاشکاوی یارمەتی بت پەرستەکانیانداو دەستیان گرتن لە ژدی موسڵمانان، کاتێ خوا جەنگی تاقمە بێ باوەڕەکانی لادا لە موسڵمانان، پێغەمەر (د.خ) فەرمانی دەرکرد بۆ موسڵمانان بچنە دەرەوە بۆسەر هۆزی بەنو قورەیزە، کاتێ لەشکری ئیسلام گەیشتە لایان چونە ناو قەڵاکانیانەوە دەرگایان لە خۆیان پێوەدا. پێغەمەر فەرمووی: یا ئەبێ موسڵمان بن، ئەو کاتە وێنەی موسڵمانانن لە قازانج و لە زیاندان، یا پێویستە خۆیان بدەن بە دەستەوە یا جەنگ بکەن لەگەڵ موسڵماناندا، سەرۆکی بەنو قورەیزە کەعبی کوڕی ئەسەد بەوانی ووت: موسڵمان بن و باوەڕ بە پێغەمەرایەتی موحەمەد بهێنن و، ووتیشی سوێندم بەخوا: بەڕاستی ڕون بویەوە بۆ ئێوە کە پێغەمەر نێرراوی خوایەو، ئەو پێغەمەرەیە لە تەوراتا باسی نیشانەکانی کراوە. بەڵام ئەوان وازیان نەهێناو ووتیان: ئێمە واز لە ئاینی خۆمان ناهێنین و بەردەوام ئەبین لەسەر ئایینی خۆمان .

ئابڵوقەکەیان (٢٥) ڕۆژی خایاند، ئەو هۆزە نزیکبونەوە لەناوچون و ترس و بیمیان پەرەی سەند، بۆیە لەو کاتەدا داوایان لە پێغەمەر کرد بە ئازادی و سەربەستی خۆیان بەبێ زۆر لێ کردنیان بچنە ژێر فەرمانی سەعدی کوڕی مەعاز سەرۆکی هۆزی ئەوس، هەرشتی ئەو بیکا ئەمان پێی ڕازین، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەو کارە ڕازی بوو، سەعدی بانگ کرد فەرموی:

بەڵێ سەعد فەرمانی دا بە کوشتنی پیاوە جەنگەکەرەکانیان و داراییان بەش بکرێ و ژن و منداڵیان دیل بکرێن، جێگەو زەوی و زاریان بدرێ بە کۆچ کەران و نەدرێ بە یاریدەران.

دوایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا بە کوشتنی پیاوە جەنگ کەرەکان و ئەو پیاوانەیش هاندەر بوون بۆ جەنگ کردن، وێنەی حویەی کوڕی ئەختەب سەرۆکی بەنوقورەیزە، لە پاشا داراییان بەش کراو ژن و منداڵیان دیل کران .

ئایا پێغەمەری خوا ﴿ﷺ﴾ ستەمی کرد لە هۆزی بەنوقورەیزە بەو کارەی کردی لەگەڵیان: زۆر ئاشکرایە ستەم لەلایەن پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕوی نەدا، خۆیان بوون بە هۆی ئەو کارانە بەوان کرا، لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە:

١– لە کاتێکی زۆر ناسکدا پەیمانی دۆستایەتی خۆیانیان لەگەڵ پێغەمەردا شکاند، پێویستبوو نەیان شکاندایە بە گوێرەی یاسای ئاین و مرۆڤایەتی.

٢– پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: هیچ جۆرە ئازارێکیان نادرێ بە مەرجێ بڵێن: (لا إله إلاّ الله محمد رسولَ الله) لەلایەترەوە کەعبی سەرۆکی خۆیشیان ئامۆژگاری کردن و ووتی: خۆتان ئەزانن موحەمەد ئەو پێغەمەرەیە تەورات باسی کردووە. بەلام ئەوان موسڵمان نەبوون و بەگوێ سەرۆك و گەورەی خۆیشیان نەکرد.

٣– بەنو قورەیزە نەچونە ژێر فەرمانی پێغەمەرەوە ﴿ﷺ﴾، بە فەرمانی پێغەمەر ڕازی نەبوون، بە کارو بە فەرمانی سەعد ڕازی بوون، بە خۆشحاڵی و بە ئارەزوی خۆیان بەبێ زەبرو زەنگ .

٤– بە ڕاستی فەرمانی سەعد ڕاستەوخۆ فەرماندان بوو بە یاسای ئەو ئایینە ئەوان ئەیان پەرست وەك (عەقاد لە نامەی (كتاب العبقرية الأسلامية) دا چاپی (دار الفتوح) لە قاهیرەدا باسی کردوە ئەڵێ: (الأصحاح)ی (٢٠) لە تەوراتا لە (التقفية) ئەڵێ: (کاتێ تۆ نزیکی شارێ بویتەوە لەبەر ئەوەی جەنگیان لەگەڵ بکەی، تۆ بانگیان بکە بۆلای ئاشتەوایی، دوایی ئەگەر وەلامیان دایتەوە بۆلای ئاشتەوایی و، شارەکەیان گیرا، دوایی هەموو ئەو گەلەی لەناویدایە ئەبن بە ڕیژەی دەستەی تۆ بیانکە بە بەندەی خۆت، ئەگەر ئاشتەوایان لەگەڵ تۆ نەکردو جەنگیان لەگەڵ تۆ نەکرد، دوایی تۆ ئابلۆقەیان بدەو، کاتێ خوای ئەو شارەی خستە ژێر دەستی تۆ نێرەکانیان بەشمشێر بکوژە. بەلام ژن و منداڵ و ئاژەڵەکانیان و هەموو شتێ لەو شارەدایە دەست کەوتی تۆیە، ئەو دەست کەوتەی دوژمن خوا پێی بەخشیویی بیان خۆ).

موحەمەد جواد موغنیە لە تەفسیری (الكاشف) دا بەرگی شەش لاپەڕە (٢٠٩) ئەڵێ: (ئەلاصحاحی)، (١٣) لە (التثنية) لە تەوراتا ئەڵێ: (دوایی بەڵێندان بدە لە دانیشتوانی ئەو

شارە بە تیژایی شمشێر بە خۆیان و بە ئاژەڵیانەوە، هەموو کەل و پەلیان کۆ بکەرەوە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی شاردا، ئەو شارە بە تەواوی بسوتێنەو، کەل و پەلەکانیان بە تەواوی بۆ خوایە، ئەو شارە هەتا هەتایە تەپۆلکەبێ و چاك نەکرێتەوە). ئایا دوای ئەوانە هەموو: موحەمەد ستەمی کردوە، سەعدیش لە ڕاستی لایداوە لە فەرمانی خۆیا؟ فەرمانی دادپەروەری ئەوەیە هەموو ئادەمیزادێ گیرۆدەی بکرێ بە شتێ خۆی بۆ خۆی دای ئەنێ و، فەرمان بدرێ بەسەریانا بە گوێرەی یاسای ئاینی خۆیان و بیروباوەڕی خۆیان. بێگومان ئەو کارەی بە جوەکانی بەنوقورەیزە فەرمانی تەوراتی خۆیانە و بە گوێرەی یاسای خۆیانە .

ژنەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سکالایان برد بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە ژیان و گوزەرانیان تەنگە داوایان لە پێغەمەرکرد لەو شتانەی بەدەست کەوت ئەگیرێن و، لە دارایی بەیتولماڵ گوزەرانیان فراوانتر بکرێ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو ڕوداوەی زۆر لاگران و نارەوابوو، بۆیە خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ یەك بە یەك ژنەکانی خۆی بانگ بکاو سەربەستیان بکا، یا داوای تەلاق بکەن و ئەوەی پێویستە بدرێ بە ژنی تەلاقدراو، وەری بگرن بە گوێرەی یاسای ئیسلام، یا بژین لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و ئارام بگرن بە هەژاری لە جیهاندا، خوای مەزن لە پاشە ڕۆژدا پاداشتی گەورەیان ئەداتەوە. لەو بارەوە خوا فەرموی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾

﴿ يا أيها النبيُ قُلْ لأزواجِكَ إنْ تُردْنَ الْحَياةَ الدُنيا وَزينَتَها فَتعالَيْنَ أمَتِعْكُنَ وَأسرُحُكُنَ سَراحاً جَميلاً ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ بە ژنەکانی خۆت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیان و گوزەران و ڕابواردن و ئارایشتی جیهانتان ئەوێ، دوایی ئێوە وەرن: من بە ئێوەی ئەبەخشم شتێ خوا پێویستی کردووە لەسەر پیاوان بدرێ بە ژنان دوای تەلاقدانیان و، من ئێوە تەلاق ئەدەم بە تەلاقدانێ زیانی تیدا نەبێ و ڕێگەتان بۆ بەرەلائەکەم.

بۆ زانین: موتعە بە شتێ ئەبێژرێ بەژن بدرێ دوای تەلاقدانی، بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێ هەتا ماوەی عیدەکەی تەواو ئەبێ. موتعە پێویستە بدرێ بە ژنێکی تەلاقدراو بەمەرجێ پێویست نەبوبێ بۆ ئەو ژنە نیوەی مارەیی، یانێ پێوست بوبێ بۆی هەموو مارەیی یا درابێتەوە دەستی ژنە تەلاقدانی خۆی و مێردەکە نەچوبێتە لای و مارەیشی بۆ دیاری نەکرابێ. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: بەخشینی موتعە پێویس نی‌یە بدرێ بە ژنی تەلاقدراو بەڵکو سونەتە.

﴿ وَإِنْ كُنْتُنَ تُرِدْنَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدارَ لأخِرَةَ فَأنَ اللهَ أعَدَ لِلْمُحْسِناتِ مِنْكُنَ أجْراً عَظِيماً﴾ وەئەگەر پەرستن و ڕەزامەندی خواو پەیڕەویی کردنی پێغەمەری خواو پاداشتی ڕۆژی دوایتان ئەوێ، دوایی خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەتان چاکە بکا لە ئێوە پاداشتێکی زۆر گەورە لە ڕۆژی دووایدا، کە ڕابواردنی جیهان نرخی بۆ دانەنرێ بەرانبەر بەوەی لە دوارۆژدا پێتان ئەدرێ.

﴿ يا نِساءَ النَبِي مَنْ يَأتِ مِنْكُنَ بِفاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ يُضاعَفْ لَها الْعَذابُ ضِعْفَيْنِ وَكانَ ذٰلِكَ عَلَى اللهِ يَسيراً ﴾ ئەی ژنانی پێغەمەر: هەرکەسێ لە ئێوە گوناهێکی ئاشکراو خراپ بکا لە ئێوە، ئیتر ئەو گوناهە هەر گوناهێ‌بێ، دوو چەنانە ئەکرێتەوە بۆ ئەو ژنە سزای ئەو گوناهەی بە دوو ئەوەندەی سزای جگەی ژنانی پێغەمەرو، ئەو دوو چەنانەی سزای ژنانی پێغەمەر ئاسانە لەسەر خوا.

هەموو ژنەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بێوە ژن بون جگەی عائیشە، زۆر هێنانی ژن لەلایەن پێغەمەرەوە دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە، بە زۆری لەکاتی جەنگی نێوان پێغەمەرو بت پەرستاندا بوەو بە هۆی کوشتن زۆربوون، لە ساڵی دووهەمی کۆچی هەتا ساڵی هەشتەمی کۆچی کۆتایی پێ هات بەسەرکەوتنی موسڵمانان، لە هەموو ژن هێنانی پێغەمەردا، سودێکی زۆر گەورەی تێدابووە بۆ بڵاوکردنەوەی یاسای ئیسلام بە تایبەتی لەناو ژناندا، مرۆڤایەتی و مەبەستی بەرزی پێغەمەری تێدا ڕوون بوەتەوە، بە پێچەوانەی بوختانی دوژمنانی ئیسلام کە کوێرای درابوو بەسەرچاویاناو ڕاستیان نەئەبینی، ئەگەر پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەوەس بازبوایە ئەو ژنە تەمەن درێژانەی نەئەهێنا.

بۆ زانین: پێغەمەرو سودی ژن هێنانی زۆری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەر لەوەی باسی ژنەکانی پێغەمەرو سودیان بکەین. واچاکە باسی کینەو ڕقی دوژمانانی ئیسلام بکەین کە زۆرجاران هەوڵیان داوە تانەو تاوانج بگرنە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، درۆو بوختانی زۆریان دروست کردووە. بەڕاستی هەر لە کۆنەوە دوژمنانی ئیسلام نەوەستاون و ناش وەستن بۆ ئەوەی گومان درۆو دووڵی پەیدا بکەن بۆ پێغەمەری خواو تانە بدەن لە پەیامی خواو پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەوەی ڕێزی پێغەمەر کەم بکەنەوە، بە بڵاوکردنەوەی درۆو دەلەسەی پروپوچ، بۆ ئەوە گومان

بخەنە دڵی باوەڕداران بەرانبەر بە ئایینی پاكی خۆیان و، ئـادەمیزادی تریـش دوربخەنـەوە لـە باوەڕهێنان بە پەیامی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. جێگەی سەرسوڕمان نیە كە ئێمەی بـاوەڕداران وێنـەی ئەو جۆرە بوختان و درۆو دەلـەسەو لێ تێكدانەی دانیشتوان دەربارەی پێغەمەر ببیســتن. ئـەو جۆرە كارانە پیشەو ڕەوشتی ناپاكانە هەر لە كۆنەوە..

هەروەها پێــش ئـەوەیش باسـی سـوودی ژن هێـنانی پێغەمـەر بكـەین: پێویسـتە وەڵام و بەربەرچی هەندێ گومانی نەزۆكی بـێ ئـەنجام بدەینەوەكـە بـە زۆری لـە لایـەن دوژمنـانی ئیسلامەوە بڵاو ئەكرێنەوە. بە تایبەتی لـەلایەن خاچ پەرسـتان و جوەكـان و دڵ نەخۆشـانو ڕەگەز پەرستانەوە دروست ئەكرێن و ئەڵێن: موحەمەد پیاوێكی ئـارەزو پەرسـت بـووە، بـە دوای خۆشی و رابواردندا گەڕاوە، ژنی زۆری هێناوە زۆرتر تر لــە چـوار ژن، كـەچی بـۆ پەیڕەوانی لە چوار ژن زۆر تری قەدەغە كردوەو، زۆر تر لـە (١٠) ژنی هێناوە بۆ رابورادنی خۆی.

خاچ پەرستان ئەڵێن : جیاوازی زۆر گەورە هەیە لــە نێـوان عیسـا موحەمـەدا، كەسـێ دوای هەوەسی خۆی بكەوێ وەك موحەمەد بەراوردی لـەگـەڵ عیسـادا نـاكرێ كـە خـۆی ماندو كردووەو كۆششی بۆ رابواردن نەكردوە، گەورەتر وشەی ناڕەوایی تر بە درۆبوختان لەدەمیان دەر ئەچێ.

بەراستی ئەو كەسانە دڵ پیسو درۆزنن، موحەمەد ئارەزو باز نـەبوە، بـەڵكو فروسـتادەی مەزنی مرۆڤایەتی بوە، ژنی هێناوە هەر وەك ئادەمیزادێ، بۆ ئەوەیش ببێ بەپێشەوایان لـە كارو كردەوەی پەسەندا، موحەمەد نە خوایە نە كوڕی خوایە، هەروەك خاچ پەرستان بڕوایان وایە عیسا خوایە یا كوڕی خوایە، موحەمەد مرۆڤە و بەندەی خوایە وێنەی ئادەمیزادی تـر، خـوا ڕێزی داوە بەسەر ئادەمیزادا و سروشی بۆ ناردوەو كردویەتی بە نێراوی خۆی.

ئێمەی موسڵمانی داد پەروەر،دوو خاڵی سەرەكیمان هەیە بۆ لابـردن و پـەرچ دانـەوەی ئەو گومانانە ئەدرێنە پاڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەو دوو خاڵە بەردی ڕەقن، ئەدرێن بــە كـەڵوەی ئەو بوختان چی و گوناهبارانەدا كە بیانەوێ لـە ڕێزی پەیامی موحەمەدی كـوڕی عـەبدوڵا كەم بكەنەوە، پێویستە ئێمە بێ ئاگا نەبین لەو دوو خاڵانە، وبیان خەینە بەرچاوی خۆمان لــە كاتێكا باسی باوەڕداران ئەكەین و، باسی ژن هێنانی زۆری پێغەمبەر ئەكەین ئەمــە ئـەو دوو خاڵانەن.

١-پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ژنی زۆری نەهێناوە هەتا تەمەنی پیرۆزی نەگەیشـتووەتە كـاتی پـیری، واتە پاش پەنچا ساڵەی تەمەنی، ئەگەر هەوەسـن بازبوایـە لـە تەمـەنی جوانیـدا ژنـی زۆری ئەهێنا.

٢-هەمو ژنەكانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بیوە ژن بوون جگەی عائیشــەی كـە كـچ بـوە لــەناو هەمویانا، ئەگەر ئارەزو خواز بوایە كچی ئەهێنا نەك پیرەژن و بیوەژن.

بەهۆی ئەو دوو خاڵانەوە زۆر بە ئاسانی و سادەیی بۆمـان دەرئەکـەوێ بـێ نرخـی ئـەو گومانانەی پێشو پوچیـان ئەکەنـەوە، ئـەو پڕوپاگندەیـە دەسـت هەڵبەسـتانە دراونەتـە پـاڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پوچ ئەبنەوە. کەواتە ئەگەر پێغەمبـەر ئـارەزو پەرسـتو هـەوەس بـاز بوایـە ومەبەستی رابواردن بوایە لـە بارەی ژن هێنانی زۆرەوە لـە تەمەنی لاویدا ژنی زۆری ئەهێناو ، کچە جوانەکانی بەناو بانگی ئەهێنا نەك بێوە ژن لـە کاتی پیریدا.

بەراستی هاوڕێکانی پێغەمبەر بە ژن و بە پیاویانەوە بە گیان بە دارایی خۆیـان ئـەکرد بـە قوربانی بۆی و، داوای ژنی لـە هەر کەسێ بکردایە بۆ خواسـتنی هـەر کچـێ یـا هـەر ژنـێ بیویستایە بەبێ پەردە ولاٌمیان ئەدایـەوە، زۆر بـە شـانازیەوە. کەواتـە بـۆ ئـەبێ ژنـی زۆری نەهێنابێ لـەسەردەمی لاویدا؟ بۆ ئەبێ کچی نەهێنابێ و بیوە ژن و بە ساڵا چوی هێنابێ.

بەراستی ئەو شتانە بەبێ گومان چەنە بازی و بوختانی دوژمنانی ئیسـلام پـەرچ ئەدەنـەوە کە ئەیانەوێ لـە ڕێزی پێغەمەر کەم بکەنەوە. کەواتە ژن هێنانی پێغەمەر بۆ مەبەستی هـەواو هەوەسی جیهانی نەبوەو، لـەبەر سودی تایبەتی ئایین بوە، ئەگـەر دوژمنـانی ئیسـلام واز لـە کینە و ڕەگەزپەرستی بهێنن و، کەمێ مرۆڤایەتی داد پەروەریان تێـدا بـێ سـەری نـەوازش و بچوکی بۆ پێغەمبەردا ئەنەوێنن.

بەبێ گومان سود لـە ژن هێنانی زۆری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەلای کەمەوە لـەبەر چـوار شـت بوە:

١-بۆ فێر کردنی دانیشتوانە بەیاساو دەستوری ئیسلام، بەتایبـەتی بـۆ ژنـان کـە نیـوەی کۆمەڵن، بۆ ئەوە بوە بەدەیان مامۆستا و زانا لـە ژناندا پەیدا ببێ دانیشتوان فێری یاسای ئایین بکەن. بە تایبەتی زۆر شت هەن لـەلایەن ژنانەوە نەبێ نـازانرێن و کۆمـەڵگای ژنـان نیـوەی کۆمەڵگای گەورەی ئادەمیزادن، پێویست کراوە لـەسەریان ئـەو شـتانەی پێویسـت کـراون لـەسەر پیاوان، ژنان بە زۆری شەرمیان کردووە پرسیاری فەرمانی خوا بکەن لـە پێغەمبـەر و لە پیاوان، بەتایبەتی ئەو شتانەی بە زۆری شەرمیان کردوە پرسیاری فەرمانی خوا بکـەن لـە پێغەمەرو لـە پیاوان، بەتایبەتی ئەو شتانەی پـەیوەندیان هـەبوە بـە ژنانـەوە، وێنـەی حـەیز و منالبون و خوێنی پاش منال و لـەش پیسی و ژن و مێردی ، چەندە دەسـتوری تـر پـەیوەندی داربە ژنانەوە، زۆر ئاشکرایە پێغەمەریش ئەو پەڕی شەرمی هەبوە، بە ژنانەوە، وێنەی حـەیز و منالبون و خوێنی پاش منال و لـەش پیسی و ژن و مێردی، چەند دەسـتوری تـر پـەیوەندی دار بە ژنانەوە، زۆر ئاشکرایە پێغەمبەریش ئەو پەڕی شەرمی هەبوە، بۆی نەکراوە راستەوخۆ ولاٌمی هەندێ پرسیاری ژنان بداتەوە. بەڵکو زۆر بە هێمـای بـۆی باسـکردوون ، بـە زۆری ژنان لـەمەبەستەکەی نەگەیشتوون، ئەوەتە عایشە ئەی گێڕێتەوە: ژنێکی یاریدەران پرسـیاری

لە پێغەمبەر کرد لەبارەی خۆشۆردنی پاش حەیز، پێغەمبەر فەرمووی: خۆت بشۆرە بە تەواوی، دوایی پارچە لۆکەیەکی بۆن خۆش هەڵگرەو خۆتی پی پاك بکەرەوە، ژنەکە ووتی: چۆن خۆمی پی پاك بکەمەوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: (سبحان الله)! خۆتی پی پاك بکەرەوە!! عائیشە ووتی: لۆکەکەم لە دەست سەندوو پێم ووت:

بیخەرە سەر ئەو جێگەیە، زۆر ژنیش هەن شەرم ئەکەن ئەو جۆرە پرسارانە بە راشکاوی بکەن لە پێغەمبەر و پیاوانی تر، بۆ نموونە: ئوموسولەیمی ژنی ئەبوتەلحە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ووتی: ئەی فروستادەی خوا: شەرم لەراستی ناکرێ، ئایا ژن شەیتانی ئەبێ؟ ئایا لەش پیسی دەرکردنی لەسەر پێویستە؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ. ئەگەر ئاوی هاتەوە، ئوموسەلەمەی ژنی پێغەمبەر بەو ژنەی ووت: هاوار بۆ تۆ چۆن ژن شەیتانی ئەبێ ، دوایی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ووڵامی دایەوە، ئەگەر شەیتانی نەبێ چۆن منال بە وێنەی دایکی ئەبێ. مەبەستی پێغەمبەر ئەوەبو کە منالٚ لە ئاوی ژن و پیاو دروست ئەبێ، ئەو جۆرە پرسیارانە بەو گرانیە ژنانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ووڵامیان ئەدایە کە بەزوربەی پیاوان ووڵامیان پی نەئەدرایەوە، بۆیە عائیشەی ئەیووت: میهرەبانی خوا لەسەر ژنانی یاریدەرانبێ شەرمیان نەئەکرد بۆ فێربونی فەرمانەکانی ئایین. ژنان ئەهاتن بۆ لای عائیشەی لە تاریکی و نهێنیدا هەتا پرسیاری لێ بکەن لەبارەی حەیز و خوێنی پاش منالٚ و لەش پیسی و جگەی ئەوان. کەواتە ژنانی پێغەمبەر چاکترین مامۆستان بۆ ژنان بۆ کاروباری ئایینی، زۆر ئاشکرایە رەوشتی پێغەمبەر بۆ فێربوونی یاسای ئیسلام تەنها گفتوگۆ نی‌یە. بەڵکو کردار و بێدەنگیشە لە کردنی شتێ لەلایان ئەبێ چ کەسێ جگەی ژنانی پێغەمبەر بۆ موسڵمانانی بگێڕنەوە هەواڵی کرداری پێغەمبەر لە خانوودا و لەگەڵ ژنانی پێغەمبەر گەورەترین رێزیان بۆ دانراوە لەو بارەیەوە، ئەو ژنانە مامۆستان بۆ باوەڕداران کە دایکی باوەڕدارانن گەورەترین رێزیان بۆ دانراوە لەو بارەیەوە، ئەو ژنانە مامۆستان بۆ باوەڕداران لە گێڕانەوەی فەرموودەو کرداری پێغەمبەر (د.خ) لە خانوو شوێنانی نهێنیدا کە ئەبنە یاسا بۆ موسوڵمانان.

٢-سودێ تری ژن زۆر هێنانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سودی یاسای تێدابو بۆ موسڵمانان، ئەو سودەیش زۆر بەئاسانی ئەزانرێ. یەکێ لەو سودانە هەندێ رەوشت و نەریتی بێزارو هەبون پێش ئیسلام باوبون. بە هۆی ژن هێنانی پێغەمبەرەوە پوچ کرانەوە. بۆ نمونە: کوڕی جگەی خۆیان ئەکرد بە کوڕی خۆیان، پیێ ئەووترا:

(التبنی) ئەو کارەش زۆر نارەواو نا پەسەند بو کوڕی جگەی خۆیان بکەن بە کوڕی خۆیان لە هەمو رویەکەوە لە میرات پێدانی و شتی ترەوە، ئەو جۆرە پیشەیە ئایینی ئیسلام لای رەوانە نەبوو وازیشی لێی نەهێنا بەردەوامبێ ئەو کارە خراپە، بۆیە خواخستبیە دڵی

عەرەبەکانەوە کە زەیدی کوڕی حاریسە دیل بکەن و بیکەن بەبەندە، هەتا دوا ڕۆژ ئەو کارەو ئەو ڕەوشتە خراپەی بەهۆی زەیدەوە پوچ بکرێتەوە، لەپاش ماوەیە زەید بو بە بەندەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمەر ئازادی کرد و کردی بە کوڕی خۆی، بەزەیدی کوڕی موحەمەد و ناو بانگی دەرکرد، هەتا سروش لە لای خوای مەزنەوە هات بۆ لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە زەید بەناوی باوکی خۆیەوە بانگی لێ بکرێ، دوایی پێغەمەر فەرمووی، تۆ زەیدی کوڕی حاریسی و کوڕی من نیت، کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زەینەبی کچی جەحشی پورزای باوکی خۆی لێ مارەکرد، ئەو کوڕەی جگەی خۆ کردنە بە کوڕی خۆ پوچ بوەیەوە، زیدو زەینەب ماوەیە بەیەکەوە ژیان. بەڵام لە ناوەڕۆکا پەیوەندی ژن و مێردیان زۆر ناخۆشبو، زەینەبە ووتەی ڕەق و ناخۆشی بەزەید ئەووت، ئەیووت: من گەورەترم لە تۆو هاوسەری تۆ نیم، تۆ بەندەی ئازاد کراوی ومن بنەماڵە وبەرێزم.

بۆ سودێکی تری تایبەت دار بەیاسای ئیسلامەوە خواویستی کە زەید زینەبە تەڵاق بداو دوایی تەڵاقی دا، دوای پێغەمەر بە فەرمانی خوا زەینەبەی کرد بە ژنی خۆی و ڕاستەوخۆ خوای مەزن زینەبەی مارەکرد لە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو ڕەوشتە بێزراوە پوچ بویەوە کە کوڕی بێگانە بکرێ بە کوڕیەکێ تر.

بەڵام لە پیشەوە لە زمانی پیسی دو رووان ئەترساو پێغەمەر سستی ئەکرد لە خواستنی زەینەبە، ئەیزانی دوو رووان گفتوگۆی نارەوا ئاراستەی ئەو ئەکەن و ئەڵێن: موحەمەد ژنی کوری خۆی هێناوە، هەتا خوای گەورە بەهەرەشەوە سەر زەنشتی پێغەمبەری کرد بەهۆی سروشەوە فەرمووی بە پێغەمەر لە ئایەتی (٣٧)م ئەم سورەتەدا : (تۆ لە خوا بترسە، خوا شایستە ترە بەوەی کە تۆ لێی بترسی) هەر بەو جۆرە ڕۆیشتو نەریتی (التبنی) کۆتایی هات و خوا فەرمووی: (موحەمەد باوکی هیچ کەسێ لە ئێوەی پیاوان نییە. بەڵکو نێرراوی خوایە خواستنی زەینەبە بەفەرمانی خوا بو بە هۆی لابردنی ئەو پیشە خراپە. نەك ئارەزوبازری و هەوەسی ڕابورادن پاڵی بە پێغەمەرەو نابێ، وەك ئەوەی دوژمنان بوختان چی و درۆزن و دوو ڕوان و بێ باوەڕان بڵاوی ئەکەنەوە بۆ دابەزینی پلەی بەرزی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەر پوچ کردنەوەی ئەو ڕەوشتە بوو، بۆیە زەینەبە بە شانازییەوە خۆی هەڵئەکێشا و ئەیووت: ئێوە کەسو کارتان مارەی کردون، من لە ژورەوەی حەوت ئاسمانەوە مارەی بڕیوم لە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. کەواتە ئەو کارە پێغەمەر نەی کردووە مەگەر بە فەرمانی خوا.

٣- زۆر هێنانی ژن لەلایەن پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ سودی کۆمەڵایەتیشی تێدایە، ئەو سودە بە ڕاشکاوی بەمارەکردنی کچی ئەبو بەکرو لە پاشا بە مارەکردنی کچی عومەر دەرئەکەوێ، هەروەها بۆ پەیوەندی و خزمایەتی بەهۆی ژن هێنان لە هۆزەکانی تری عەرەب و قورەیش پەسندترو ئاشکراترە هەتا بەو بۆنەوە پێغەمەر باشتر تێکەڵاویان بکات .

٤- سودی ڕامیاری (السیاسە) هەبووە لە ژن زۆر هێنانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. بەڕاستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەندێ ژنی هێناوە بۆ ئەوەی دانیشتوانی پێ ڕاکێشێ بۆلای ئیسلام.

وە بۆ کۆکردنەوەی هۆزەکان بۆلای خۆی. بێگومان ژن وژنخوازی ئەبێتە هۆی دۆستایەتی و یاریدانی ئادەمیزاد بۆ یەکتری. بۆ نموونە: پێغەمەر جوەیرەی کچی (ئەلحاریسی) سەرۆکی هۆزی (ئەلموستەلیقی) هێنا کە دیل کرابو لە نێو هۆز و خزمەکەیا، دوای دیل کردن ئەیویست خۆی بکڕێتەوە، چو بۆ خزمەت پێغەمەر کە یارمەتی بدا، پێغەمەر ووتی خۆ کڕینەوەت لەسەر لائەبەم و مارەت ئەکەم، ئەویش بەفەرمودەی پێغەمەر ڕازی بو، دوایی موسڵمان بو، موسڵمانان ووتیان چۆن ئەبێ خەزورانی پێغەمەر لە ژێردەستی ئێمەدا بن و دیل بکرێن و بەبن بەبەندە، هەموو دیلەکانیان ئازاد کرد، بەهۆی ئەو کارەوە هۆزی ئەلموستەلیق هەموویان موسڵمانبون، مارەکردنی ئەو ژنە بو بەهۆی بەختیاری هەردوو جیهانی خزم و هۆزەکەی.

دووبارە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ سەفیەی کچی حوبەی کوڕی ئەختەبی جولەکەی مارەکرد کە بەدیلی گیرابو لە دوای کوشتنی باوکی. خاوەن ڕاوێژ و پرس پێکراوانی موسڵمانان ووتیان: ئەم کچە کچی سەرۆکی بەنوقورەیزەیە و بەڕێزە، بۆ جگەی پێغەمەر شایستە نی‌یە، ئەو مەبەستەی خۆیانیان بە پێغەمەر ڕاگەیاند، فەرموی، یا ئازادی ئەکەم یا ئەی‌خوازم، یا بەرەڵای بکەن بچێتەوە بۆلای خێزانەکانی خۆی، ئەویش ژنیەتی پێغەمەری هەڵبژارد.

هەروەها پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئوموحەبیبە = (ڕەملەی کچی ئەبوسوفیان) کە لەگەڵ مێردەکەیا کۆچی کردبوو بۆ حەبەشە و مێردەکەی مردبو، بەبێ یارمەتی دەرێ مابووەوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەواڵی نارد بۆ نەجاشی پادشای حەبەشە خوازبێنی بکا بۆی، ئەویش زۆر بەخۆشیەوە خوازبێنی کرد بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چوارسەد دینار و چەند دیاری تری کرد بە مارەیی بۆی، کاتێ گەڕایەوە بۆ مەدینە مارەی کرد، ئەگەر ئەو کارەی نەکردایە لەوانە بوو لە ئایین وەرگەڕایە. ئەبوسوفیانی باوکی ئەو ژنە دڵخۆش بو لەنهێنی‌دا و بەو خزمایەتیە سەربەرزبو کە ئەوپەڕی دوژمنی پێغەمەربو لەو کاتەدا هەتا موسڵمان بوو.

پاش ئەوەی باسی ژنهێنانی زۆری پێغەمەر کرا، لەمەودوا باسی ناوی هەمو ژنەکانی پێغەمەر و دایکی باوەڕداران و هۆی هێنانیان ئەکەین لەگەڵ سودی هێنانیان: ژمارەیان لە یازدە ژن زۆرترن.

١- خەدیجەی کچی خوەیلید: یەکەمین ژنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ مارەی کرد بەرلەوەی بکرێ بەپێغەمەری خوا، لەو کاتەدا تەمەنی پێغەمەر لە (٢٥) ساڵیدا بوە، تەمەنی خەدیجە

(٤٠) ساڵ بوە، بەر لە پێغەمەر دوو شوی تری کردوە کە ناویان(ئەبوهالەی کوڕی زوراره بوە، دووهەمیان: عەتەبەی کوڕی عامیر) بوە، لەبەر ڕێز و زیرەکی ئەو ژنە پێغەمەر مارەی کرد. (١٠) ساڵ دوای بوونی بە پێغەمەر، خەدیجە کۆچی دوایی کردوە، جگە لە ئیبراهیم هەمو منالەکانی پێغەمەر لە خەدیجەن، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەتا خەدیجە کۆچی دوایی نەکردوە ژنی تری نەهێناوە.

٢- سودە کچی زەمعە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پاش کۆچی دوایی خەدیجە خواستویەتی، بەر لە پێغەمەر ژنی (ئەلسەکرانی)کوڕی عەمری ئەنساری بوە، لەتەمەندا زۆر لە پێغەمەر گەورەتر بوە، یەکێ بوە لە کۆچکەران مێردەکەی بە موسڵمانیەتی مردبو لە دوای کۆچکردنی بۆ حەبەشە، بەبێ ئەوەی کەسێ بەخێوی بکا مابووەوە، ئەگەر بچوایەتەوە بۆلای خزمەکانی ئەیانکرد بەبت پەرست، یا توشی سزای زۆر گران ئەبو، بۆیە پێغەمەر مارەی کرد، ئەگەر پێغەمەر ئارەزۆبازبوایە ئەو ژنە کەتەمەنی (٥٥) ساڵ بوە نەیئەهێنا و کچێکی ئەهێنا.

کەواتە با دوژمنانی ئیسلام چاکی بزانن و بوختان و درۆ نەکەن.

٣- عائیشەی کچی ئەبوبەکر: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەکچی مارەی کردوە، جگەی ئەو کچی تری نەهێنا، عائیشە زۆر زیرەك و زاناتربوە لە زۆر زانایانی تر، زۆر جار گەورە پیاوان و هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پرسیاری شتی وایان لێ ئەکرد خۆیان نەیانئەزانی و ئەو وولامی ئەدانەوە، پێغەمەر عائیشەی زۆر خۆشویستوە لەبەر زانایی و بەڵەدی لە قورئاندا و لەفەرمودەی خۆی، زۆر لێهاتووبوە لە فەرمانەکانی خوای مەزندا.

٤- حەفسەی کچی عومەر: لە پێشا ژنی ئەنیسی کوڕێ حەزافەی ئەنساری بوە لە غەزای بەدردا شەهید کراوە، کە یەکێ بوە لە پاڵەوانەکانی ئیسلام، دوای کۆچی دوایی ڕوقیەی کچی پێغەمەر بە عوسمانی ڕاگەیاند حەفسە مارەی بکا، لەپاشا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ مارەی کرد، بەو کارە ڕێزێکی تایبەتی بەخشرا بە عومەر باوکی حەفسە.

٥- زەینەبەی کچی خوزەیمە: لە پێشا ژنی پاڵەوانی ئیسلام عوبەیدەی کوڕی حاریس بوە لە جەنگی بەدردا شەهید کرابو، زەینەبە بەتیمارکردنی بریندارانی موسڵمانەوە خەریکبوو لەکاتی شەهیدکردنی مێردەکەیا تەمەنی زەینەبە ئەو کاتە (٦٠) ساڵ بوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ئازایی و بێکەسی ئەو ژنە ئاگادار بو، دوای حەفسەی کچی عومەر مارەی کرد. ئایا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەگەر هەوسبازبوایە ئەو ژنەی ئەهێنا، کەواتە با دوژمنانی ئیسلام نەختێ ژیریان هەبێ، تەماشا بکەن بەچاوی دادپەروەری و بێلایەنی.

٦- زەینەبەی کچی جەحش: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ مارەی کردوە بەبێوەژنی پاش ئەوەی زەیدی کوڕێ حاریسە تەلاقیداوە و، پورزای باوکی پێغەمەر بوە، لەبەر پوچ کردنەوەی

نەریت و ڕەوشتی کۆنەپەرستی بت پەرستان کە کوڕێ جگەی خۆیانیان ئەکرد بەکوڕێ خۆیان لەهەموو ڕوەیەکەوە وەك لەمەوبەر باسکرا. لە مارەکردنی زەینەبەدا دڵپیسان و دوژمنانی ئیسلام ڕێگەیان بۆ خۆیان خۆش کرد کە تاوانج بگرنە ئاینی پاکی ئیسلام ، درۆ و دەلەسەی زۆریان بۆ دروستکرد، بەگومانی ژەهراوی خۆیان ئەیان ووت: جارێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕۆیشتوە بەلای خانووی زەیدا کە زەید لەوێ نەبوە، چاوی بەزەینەبە کەوتوە، خۆشەویستی زەینەبە کەوتوەتە دڵی، دوایی وتویەتی: (پاکی بۆ خوایە دڵان ئەگۆڕێ) زەینەبە گوێی لەو ووتەیە بوە کە زەید هاتوەتە ئەو باسەی بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە دڵی خۆیا وای زانیوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئارەزۆی لە زەینەبە، هاتە خزمەت پێغەمەر و ویستی زەینەبە تەڵاقبدا. پێغەمەر بەزەیدی ووت بەسەر زارەکی: خێزانەت ڕاگرە لای خۆت. بەڵام زەید تەڵاقی داو پێغەمەر مارەی کرد.

زانایان ئەڵێن: ئەو گفتوگۆیە پوچ و بوختانە کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەدڵەوە ئارەزۆی لە زەینەبە بوبێ، چونکە بەر لەوەی خوا فەرمانی داوە بە داپۆشینی ژنان زەینەبە لەزۆر کات و لەزۆر جێگەدا لەگەڵ پێغەمەر دانیشتوە، چۆن ئەچێتە دڵەوە و ئارەزۆی لە زەینەبە کردبێ هەتا شوی نەکردبێ، پێغەمەر زۆر بەباشی زەینەبەی دیوە لە پێشا، زۆر دوورە لە دڵی پاکی پێغەمەرەوە بە ئاگاداری دوژمنانی ئیسلامیش شتی وا خراپ بە دڵێ پێغەمەردا بێت، ئەو دەنگ و باسە لەو کاتەدا بە هیچ جۆرێ لە ناو دانیشتوانی مەدینەدا بگرە لای دوورەکانیش گفتوگۆی لەسەر نەکراوە وە هەرگیز ئەو بوختانە بە دڵیانا نەهاتوە هەتا دوای ماوەیە جوەکان و شاگردەکانیان ئەو کارەیان پێکهێنا بۆ کەم کردنەوەی پاکی و ڕێزی پلەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

بۆ زانین: کەمێ تەماشای مێژووی ڕابردووی نێوان زەینەبە و زەیدی مێردی بکەین هەتا بۆمان ڕوون ببێتەوە ڕاستی ناکۆکی نێوانیان بە ئاشکرایی و ڕوونتر، ئەوەبو زەینەبە لە بنەماڵەیەکی بەڕێز و گەورەبوە، زەید بەندەی ئازادکراو بو، زەینەبە خۆی بەهاوسەری زەید دانەئەنا، خوای گەورە ویستی سەرەتای ڕەگەزپەرستی و چینایەتی بنەماڵەیی و ڕێزی بێ ئەقڵانەی پێش ئیسلام پوچ بکاتەوە، خواپەرستی و ئایینی ئیسلام بکا بە بنچینەی ڕێز بەتەنها، دوایی بۆ ئەو مەبەستە پێغەمەر بە زەینەبەی ڕاگەیاند شو بکا بەزەید.

هەتا شانازیی بەرەگەزەوە نەمێنێ و بنەبڕبکرێ، بۆ ئەو مەبەستە خوای مەزن لە ئایەتی (٣٦)ە ئەم سورەتەدا دەفەرموێ ﴿ وە بۆ هیچ پیاوێکو ژنێکی باوەڕدار نیە هەرکاتێ خوا فەرمانی دا بەشتێ ئەوان شتێ تر هەڵبژێرن بۆ خۆیان دوایی زەینەبە سەری شۆڕکرد بۆ فەرمودەی خوا و لەشی خۆیدا بە دەست زەیدەوە بە ڕواڵەت. نەك بەگیان و بەدڵ کە لەژێرەوە بە ئازارەوە ئەتلایەوە، زەیدی بە هاوسەری خۆی دانەئەنا، موحەمەد ﴿ﷺ﴾

زەینەبەی لە منالّییەوە ئەناسی؛ چونكە پورزای باوكی بوە، چۆن ئەچێتە دلّەوە ئارەزۆی زەینەبە نەكات هەتا شو نەكا و نەبێ بە بێوەژن. بەڕاستی دوژمنانی پێغەمەر وەئاین شتێ ئەلّێن نایزانن بوختان چین، بەدرۆ و بەكوێرانە ئەو شتانە ئەدەنە پالّ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە پاشا ئەلّێن: لە دلّی موحەمەدا بوە، ئارەزۆی لە زەینەبە بوە؛ بۆیە سەرزەنشت كراوە لە لایەن خواوە، چۆن ئەبێ و ئەچێتە دلّە و كەسێ سەرزەنشت بكرێ لەسەر شتێ لە دلّیابێ و ئاشكرای نەكا، چۆنیان زانیوە بەبێ ئەوەی ئاشكرای بكا ئەو شتە لە دلّیابوە؟.

لە پاشا خوا بەزەقی ئەو كارەی لە ئایەتی (٣٧)ی ئەم سورەتەدا ڕون ئەكاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿ تۆ ئەشارێتەوە لە دەروونی خۆتا شتێ خوا ئاشكرای ئەكا ﴾ ئایا خوا خۆشەویستی پێغەمەر بۆ زەینەبە ئاشكرا ئەكا یا نە؟ بەلّكو خوا شتێكی ئەوتۆ ئاشكرا ئەكا پێغەمەر ئاواتە خواز بوە كە خوا فەرمان بدا بە پوچكردنەوەی یاسای كوڕی جگەی خۆ بەكوڕی خۆكردو. بەلاّم لە دلّدا ئەترسا لە زمانی دوڕووان بلّێن: موحەمەد ژنی كوڕی خۆی هێناوە، ئەوەبو خوا ئەو شتەی لە دلّی پێغەمەردا بۆ ئاشكراكرد و فەرموی لە ئایەتی (٣٦)ی ئەم سورەتەدا: ﴿ دوایی كاتێ زەید جێبەجێكرد لە زەینە پێویستی خۆی چوە لای و تەلاقیدا وعیدەی بەسەر چو ئێمە زەینەبەمان لە تۆ مارەكرد، هەتا نەمێنێ بەسەر موسلّمانانەوە خراپەی مارەكردنی ژنی كوڕێ جگەی خۆ بەكوڕی خۆكرد و بەزمانی خۆتان ﴾.

٧- ئوموسەلە: هیندی مەخزومی: ژنی عەبدولاّی كوڕی ئەلئەسەد، لە پیاوچاكانی هاوڕێكانی پێغەمەر بو ﴿ﷺ﴾ لە جەنگی ئوحودا شەهید كرا، چوار منالّی هەتیوی بێ كەسی هەبوو، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەبەر بەخێوكردنیان ئوموسەلەمەی مارەكرد، كاتێ پێغەمەر خوازبێنی لێكردو ووتی: ئەی پێغەمەری خوا من بەسالاّچووم و هەتیو بارمو لەهەوێی بێزارم داوای لێبوردن ئەكەم. پێغەمەر ووتی: پیری تۆ زیانی نیە، چونكە من مەبەستم ئەو هەتیوانەیە، هیوام وایە خوا بێزاری هەوێی لەدلّتا لابا، پێغەمەر لەبەر ژیری ئوموسەلە زۆر جاران بۆ كردنی كاروكردار پرس و ڕاوێژی پێئەكرد، بەتایبەتی لە ئاشتەوای كردن لەگەلّ بت پەرستان لەو كاتەدا كە موسلّمانان لایان خۆش نەبو كە بۆ ماوەی (١٠) سالّ جەنگیان لەگەلّ نەكرێ بەگوێرەی بڕیاری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

٨- ئومو حەبیبە: ڕملیەی كچی ئەبوسوفیان: لە سالّی (٧)ی كۆچی، بەبۆنەی مردنی عوبەیدی كوڕی جەحشی مێردی لەحەبەشە بە بێوەژنی مایەوە. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەوالّی نارد بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە خوازبێنی بكا بۆی، نەجاشی چوار هەزار درەهەمی كرد بە مارەیی بۆی و لەگەلّیا ناردیەوە بۆلای پێغەمەر، لەمەوبەر باسی ژن هێنانی پێغەمەر و سودی مارەكردنی ئەم ژنەمان كرد.

٩- جویرەی کچی حاریس: پێغەمەری خوا مارەی کرد دوای مردنی موسافیحی کوڕی سەفوانی مێردی کە کوژرابو. زۆریش دوژمنی سەرسەختی پێغەمەر بو، جویرە بەدیلی کەوتە دەست موسڵمانان، پێغەمەر مارەی کرد، سودی مارەکردنی ئەو ژنە لەمەوبەر ڕون کرایەوە. هەروەك سودی سەفیەی کچی حوبەی بو.

١٠- مەیمونەی کچی ئەلحاریسی هیلالی: دووا ژنی پێغەمەرە ﴿ﷺ﴾ عائیشە لەباسیا ئەڵێ: لە هەموومان لەخواترس بوە، لەهەمووومان باشتر بوە بۆ خزمانی، دوای مردنی ئەبو ڕەهمی کوڕی عەبدولعوزای مێردی لەبەر ڕێزگرتنی هۆزەکەی؛ چونکە یاریدە و پشتیوانی پێغەمەریان کرد مارەی کرد.

١١- مارییەی قیبتی: کە هیرقەل بەدیاری ناردی بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەم ژنەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمەر پەیدابوە.

ئەوەی لەمەوبەر باسکرا، چاوپیاخشاندنێ بو لەسەودو چۆنیەتی ژن هێنانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە خوای مەزن ڕێزی گرتوون و کردوونی بەدایکی باوەڕداران. هەرلەبەر ڕێز و نرخاندنی ئەوانە، خوای مەزن بە ئایەتەکانی (٢٨-٢٩-٣٠)ی ئەم سورەتە ڕوویان تێئەکا. لەمەودوایش بە ئایەتەکانی (٣١) هەتا (٣٤)ە ئەم سورەتە.

**کۆتایی بە ماناکردنی ئەم جزمە هات، ڕۆژی چوارشەممە (٥)ی مانگی ڕەبیعول ئەوەڵ. ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی بەرانبەر بە (٢٠٠٠/٦/٧)**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان . سوپاسی بێپایان بۆ پەروەردگاری هەموو بونەوەران درودی زۆر لەسەرگیانی پاکی پێغەمەر و یارویاوەران و پەیڕەوانی بێبەگشتی.

وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾

﴿ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحًا نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴾ وە هەرکەسێ لە ئێوەی ژنانی پێغەمەر فەرمانبەرداری خوا و پێغەمەری خوابێ و بەردەوامبێ لەسەرپەرستنی خوا و پەیڕەوی پێغەمەر و، کردەوەی چاك بکا ئێمە ئەبەخشین بەو کەسانە پاداشتی کارەکەی دووجار: جارێ لەبەر ئەوەی فەرمانبەرداری ئەوا نیوە، جارێ لەبەر داوای ڕەزامەندی پێغەمەری کردوە و هاوڕێیەتی ئەوی پێخۆش بوە و، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ ئەوان لە ڕۆژی دواییدا و لەبەهەشتا خواردەمەنی بەرێز و پاداشتی زۆرترە.

﴿ يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ ﴾ ئەی ژنانی پێغەمەر: ئێوە وێنەی جگەی خۆتان نین لە ژناندا ئەگەر ئێوە لەخوابترسن و خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا؛ چونکە ئێوە ڕێزی تایبەتیتان دراوەتێ لە لایەن خوای مەزنەوە.

﴿ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ ﴾ دوایی ئێوە گفت وگۆی نەرم و ناسك مەکەن لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا، دوایی بەوبۆنەوە کەسێکی ئەوتۆ لەناو دڵیایەتی نەخۆشی و

ڕەوشتی خراپ ئومێدی خراپە بکا لە ئێوە، چونکە گفت وگۆی نەرم و ناسك ڕێگە ئەکاتەوە بۆ تاوانباران و ئەبێ ئێوە بەجۆرێ گفت وگۆ بکەن دوربێ لە گومان و هیوای پیاوخراپان.

﴿ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ وە ئێوە گفت وگۆ بکەن بەجۆرە گفت وگۆیە یاسای ئیسلام پەسەندی بکا و زۆرتر لە پێوست گفت وگۆ مەکەن و خۆتان بەیادی خواوە خەریك بکەن.

﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى ﴾ وە ئێوە لە خانوەکانی خۆتانا دانیشن و ئارام بگرن و، ئێوە جوانی خۆتان دەرمەخەن بۆ پیاوانی بێگانە بە وێنەی دەرخستنی پێش ئیسلام و نەزانینی یاسای ئایینی خوای مەزن، مەچنە دەرەوە بۆ جگەی سەردانی باوك و دایك و خزمان و سەردانی نەخۆش و نوێژکردن و پرسە و حەج کردن بەبێ دەستوورپێدانتان.

بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا هیچ ڕەوشتێکی ناپەسەند نەماوەتەوە ژنان بیکەن لەخۆ دەرخستن و سوڕدان و سەرنج ڕاکێشانی پیاوانی بێگانە بەتەقەی قۆندەرەکانیان، مەگەر بەدەگمەن هەندێ لە ژنانی بەناموس هەبن، ئەوانەش بەلای زۆربەی دانیشتوانی بێباوەڕ بەکۆنەپەرستی ئەژمێررێن، نازانن کۆنەپەرستی و بەرەڵایی و ڕەوشتی پێش ئیسلامە و، ئێستا گەڕاوەتەوە بۆلای ئەوان.

﴿ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ وە ئێوە نوێژەکانتان بکەن بە گوێرەی یاسای دیاری کراوی خۆیان کە بەردی بنچینەی پەرستنە و، ئێوە زەکاتی پێویستی دارای خۆتان ببەخشن بە هەژاران کە گەورەترین پەرستنی داراییە بۆ خواو، ئێوە فەرمانبەرداری خوا و فروستادەخوابن.

﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ بە ڕاستی خوا فەرمانی دا بەئێوە بەکردنی ئەو کارانە لەبەر ئەوەی خوا ئەیەوێ لاببا لە ئێوە گوناهی شتێ ناموسی ئێوە بڕووشێنێ، ئەی ژنان و خانەوادەی پێغەمەر، خوا ئەیەوێ ئێوە پاك بکاتەوە بە پاك کردنەوە لە هەمو گوناهێ، بە جۆرێ ئێوە بن بە پێشەوای هەموو ژنان لە ڕەوشتی بەرز و بەنرخدا، هەموویان چاو لە ئێوە بکەن. زانایان بیریان جیاوازە لەمەبەست لە ڕستەی (أهل البيت) زۆربەی زۆریان لایان وایە مەبەست هەموو ژنانی پێغەمەر و هەندێ کەسی تریش وەك: حەسەن و حوسەین و فاتیمە و عەلی. هەندێ تری کەمیان لایان وایە مەبەست حەسەن و حوسەین و فاتیمە و عەلیە، بەتەنها. ئەوەی ڕاستیبێ بریتین لەهەمو ژنانی پێغەمەر و ئەو چوار کەسانەیشن. بەڵگەیش فەرمودەی پێغەمەر و ئایەتەکانی پێشەوە و ئایەتەکانی دوایی ئەم سورەتەن کە هەموویان لەبارەی ژنانی پێغەمەرەوە هاتوونەتەخوارەوە.

﴿ وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ وە ئێوەی ژنانی پێغەمەر یادی خوا بکەن و ئامۆژگاری وەرگرن بەشتێ بخوێنرێ لەناو خانوەکانی خۆتانا لە ئایەتەکانی قورئان و لەفەرمودەی پێغەمەر، سوپاسی خوا بکەن کە ئێوەی گێڕاوە بەهاوڕێی گەورەترینی هەموو بونەوەران و ئێوەی کردوە بەخانەدانی پێغەمەرایەتی. بەڕاستی خوا ئەزانێ بەدۆستان و خواپەرستان، ئاگادارە بە هەموو بونەوەران.

إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٣٥﴾

دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانەی پێشوو ژنانی موسڵمانان ووتیان: جارێ لەبارەی ئێمەوە ئایەتێ نایەتە خوارەوە، خوای مەزن دڵخۆشی کردن و فەرموی:

﴿ إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ ﴾ بەڕاستی پیاوانی موسڵمان و ژنانی موسڵمان پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار، پیاوانی بەردەوام لەسەرپەرستنی خوا و ژنان بەردەوام لەسەر پەرستنن.

﴿ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ ﴾ وە پیاوانی ڕاستگۆ لە باوەڕدار و ژنانی ڕاست لەباوەڕهێنانا و پیاوانی ئارام گر لەسەر ئازار و پەرستنی خوا و ژنانی ئارام گر، پیاوانی لەخواترس و ژنانی لەخواترس بەدڵ و بەئەندامییانەوە.

﴿ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ ﴾ وە پیاوانێ دارای خۆیان ئەبەخشن و بەهەژاران و ژنانێ دارای خۆیان ئەبەخشن، پیاوانی خۆیان ئەپارێزن لە داوێن پیسی و ژنانێ خۆیان ئەپارێزن لە داوێن پیسی.

﴿ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ وە پیاوانێ بەدڵ و بەزمان یادی خوا ئەکەن بە زۆری لە نوێژەکانیانا و ژنانێ یادی خوا ئەکەن بەزۆری، خوا ئامادەی کردوە بۆیان لێخۆشبوون لە گوناهەکانیان و بۆیشیان ئامادەکراوە پاداشتێکی زۆر گەورە لەبەهەشتا، ئیتر پیاوبن یا ژن.

وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا

مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾

﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴾ وە شایستە نی‌یە بۆ هیچ پیاوێکی باوەڕدار بۆ هیچ ژنێکی باوەڕدار هەرکاتێ خوا و پێغەمەر فەرمانیاندا بەهەر کارێ بۆ ئەوان هەبێ هەڵبژاردنی کارێ تر جگەی ئەو کارەی ئەوان فەرمانیان پێ‌درابێ.

﴿ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴾ وە هەرکەسێ بێ فەرمانی خوا و پێغەمەری خوا بکا، دوایی ئەو کەسە بە ڕاستی لایداوە لە ڕێگەی ڕاستی ئایینی ئیسلام بەلادانێکی ئاشکرا، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبوە: کاتێ پێغەمەری خوا خوازبێنی زەینەبەی کچی جەحشی پورزای خۆی کرد بۆ زەیدی کوڕی حاریسەی ئازادکراوی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەهۆی فەرمانی خواوە زەینەبە و عەبدوڵڵای برای زۆریان پێ‌ناخۆشبو، چونکە هاوسەری ئەوان نەبو، ئەوان بنەماڵەی ناودار و زەید بەندەی ئازادکراو. بەڵام دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە عەبدوڵڵا و زەینەبە سەریان بۆ فەرمانی خوا و پێغەمەر شۆڕکرد، زەینەبە مارە بڕدرا بۆ زەید و کاری ژن ومێردی نێوانیان تەواو بوو. بەڵام ژیانی نێوانیان زۆر ئاڵۆز بو، زەینەبە ئازاری زۆری زەیدی ئەدا و خۆی بە هاوسەری ئەو دانەئەنا. بۆ ئەو مەبەستە خوای مەزن فەرموی:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە نێوانی زەید و زەینەبە ئەو پەڕی ئاڵۆزی و ناخۆشییان گرتە خۆیـان، زەینەبـە ئازاری زۆری زەیدی ئەدا، بەجۆرێ زەید چەند جارێ چوە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ تەڵاقدانی زەینەبە: هەموو کاتێ تۆ ئەتووت بە کەسێکی ئەوتۆ خوا چاکەی لەگەڵ کرد بە ئیسلام بوونـی و بە هاوڕێی تۆ، تۆیش چاکەت لەگەڵ کرد بو بە ئازادکردنی لەبەندایەتی و بەخێوت کردبـو، ئەو کەسە زەیدی کوڕی حاریسە بو: ژنەکەی خۆت ڕاگرە و تەڵاقی مەدە، لە خوا بترسە لـەو بارەوە.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەموو کاتێ ئامۆژگاری زەیـدی ئـەکرد کـە تـەڵاقی نـەدا. بـەڵام پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بەهۆی سروشەوە خوای مەزن ئاگاداری کردبو کە زەید زەینەبە تەڵاق ئـەدا و تۆیـش دوای تەڵاقدانی و تەواوبوونی عیدەی مارەی ئەکەی لەبەر بنەبڕکردنی ڕەوشتی کوڕی جگـەی خۆ بەکوڕی خۆکردن. بەڵام پێغەمەر ئەو کارەی لە زەید و دانیشتوان پەنهاندا بو، لەبەر تانە و تاوانجی بێباوەڕان کـە موحەمـەد چۆن ژنـی کـوڕی خـۆی مـارە ئـەکا، خـوا بـەو بۆنەیـەوە سەرزەنشتی پێغەمەری کرد و فەرموی:

﴿ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ ﴾ وە تۆ لە دەروونی خۆتا شتێ ئەشاریتەوە خوا ئاشکرای ئـەکا، ئـەو شـتەیش مـارەکردنی زەینەبـەی ژنـی زەیـدی ئازادکراوی خۆتە کە لە لای خوا ڕەوایە و، تۆ ئاشکرای ناکەی و لـە ئـادەمیزاد ئەترسـی کـە بڵێن: موحەمەد ژنی کوڕی خۆی مارەکردوە و، خوا شایستە ترە لە هەموو کەسێ کە تـۆ لێـی بترسی، ڕۆژ هات ڕۆیشت و، زەید زەینەبەی تەڵاقدا و خوای مەزن هەموو شتێکی ئاشکراکرد، وەك ڕوونی ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ دوایی کاتێ زەید پێویستی خۆی جێبەجێ کرد بو لەزەینەبە و ژن و مێردی لەگەڵ کردبوو، تەڵاقی داو موتعەی دایە و عیدە کۆتایی پێهات ئێمە زەینەبەمان مارەبڕی لەتۆ، لەبەر ئەوەی هیچ خراپەیە بەسەر باوەڕدارانەوە نەمێنێتـەوە لـەبارەی مارەکردنی ژنانی کوڕێ جگەی خۆ بەکوڕی خۆ کـردوو هـەرکاتێ ئـەو کـوڕە بەخۆکردوانـە ژنەکانی خۆیانیان تەڵاق داو پەیوەندییان پێیانەوە نەما و موتعەیان دانێ و عیدەیان ڕۆیشت ڕوایە مارەرکردنیان، فەرمانی خوا پێویستە جێبەجێ بکرێ و گەڕانەوەی نابێ، ئەوەبوو زەید زەینەبەی تەڵاقدا ، دوای چونە لایی و موتعەدایە و عیدەی ڕۆیشت و لە پێغەمەرمان مارەی کرد،خوا ئەو کارەی ڕوون کردەوە بۆ باوەڕداران و هەموو ئـادەمیزادێ بـۆ نەهێشـتنی خراپـەی مـارەکردنی کوڕی جگەی خۆ کرد بەکوڕی خۆ، سەرزەنشتی پێغەمەری کرد لەسەر بڵاونەکردنەوەی ئـەو کارە لەبەر ترسی دانیشتووان . ئایا پێغەمەر هەوسـبار بـوو ئەگـەر فـەرمانی خـوای جێبـەجێ بکردایە؟ وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ ﴾ هیچ خراپە و گوناهێ لەسەر پێغەمەر نی‌یە لەجێ‌بەجێ‌کردنی شتێ خوا بۆی ڕەوا کردبێ کە مارەکردنی ژنی کوڕی بەدەم بانگکراو بۆی هەتا ڕەوشتی نارەوای کۆن پوچ ببێتەوە، دوایی خوا فەرمانی دا بە پێغەمەر کە زەینەبە مارەبکا بۆ ئەوەی خراپەی مارەکردنی ژنی کوڕی جگەی خۆ بە کوڕێ خۆ کردوو بەسەر باوەڕدارانەوە نەمێنێ و گوێی لەتانە و تاوانج نەگیرێ کە خوای مەزن بیکا.

﴿ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴾ خوا یاسا و دەستووری کەسانی ئەوتۆ لە پێغەمەران لە پێش تۆ بوون کردویەتی بەدەستوور بۆ تۆ لە ئایینا و، فەرمانی خوا فەرمانێکە پێویستە جێ‌بەجێ‌بکرێ، یانی هەموو پێغەمەران بۆ ئەوە نێرراون بانگی ئادەمیزاد بکەن بۆلای ڕێگەی ڕاست و قەدەغەکردنی خراپە و پوچ کردنەوەی ڕەوشتی خراپ و یاسای کۆنەپەرستی. لە پاشا خوای مەزن چاکەی پێغەمەرانی پێشوو ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

﴿ الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ پەیامەکانی خوا ڕائەگەینن بە ئادەمیزاد و لەخوا ئەترسن و لەهیچ یەکێ ناترسن مەگەر هەر لە خوا ئەترسن و بەسە خوا بۆ پرسیارکردن و لەشتێ بونەوەران بیکەن.

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ موحەمەد باوکی هیچ کەسێ نی‌یە لە پیاوانی ئێوە، هەتا لاتان وابێ زەید کوڕی موحەمەدە، هەرچەندە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ باوکی قاسم و عەبدوللا و ئیبراهیمە، دوایی هیچ یەکێ لەوان نەژیاون هەتا بگەنە کاتی پیاوەتی، قاسم و عەبدوللا بەر لە کۆچی پێغەمەر لەمەکە مردوون، ئیبراهیم لەساڵی هەشتی کۆچیدا لە دایکبوە، ڕووداوی زەینەبە لە ساڵی پێنجی کۆچیدا بوە، هەموو کوڕەکانی پێغەمەر هەموویان بە مناڵی مردوون و نەگەیشتوونەتە پلەی پیاوەتی. حەسەن و حوسەین کوڕی عەلی کوڕێ ئەبوتالیبن، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوایی کردوونی بەکوڕی خۆی لەبارەی ڕێزدانان بۆیان و، بەڵام موحەمەد فروستادەی خوایە و نێراوە بۆلای هەموو ئادەمیزاد، باوکی ڕاستەقینەی ئێوە نی‌یە و، کۆتایی هێنەری هەموو پێغەمەرانە و دەرگای پێغەمەرایەتی بەو مۆرکراوە و دوای ئەو پێغەمەرێ تر نانێررێ،یاسا و دەستووری ئەو کۆتایی بەهەموو یاسایە تر ئەهێنێ کار بە هیچ دەستوورێ تر ناکرێ، خوا بەهەموو شتێ ئەزانێ و ئەزانێ چ کەسێ شایستەیە بەوەی کۆتایی بە ناردنی پێغەمەرایەتی بهێنێ و ئەزانێ پێغەمەری تر نانێرێ دوای ئەو.

هەرکەسێ داوای پێغەمەرایەتی بکا دوای پێغەمەر ئەو کەسە بێ‌باوەڕە و پێویستە بکوژرێ، هەرکەسێکیش بڵێ: لەوانەیە ئەو کەسە ڕاست بکا کە ئەڵێ: پێغەمەرم ئەویش بێ‌باوەڕە. هەرشتێ پێویست بێ بۆ بەندەکانی خوا لە یاسای ڕۆژانەیاندا و بیکەن بە دەستوور بۆخۆیان لە قورئاندا هەیە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستیە ئەو کەسانەی زانستی تایبەتییان هەیە بۆ قورئان

ئەتوانن لە قورئان ووردبینەوە لەسەرەوە هەتا خوار، ئەو کاتە بەراوردی قورئان بکەن لەگەڵ نامەکانی تر و هەمو یاسای تر، ئەو کاتە بۆیان دەرئەکەوێ کە قورئان لەسەر هەموویانەوەیە، کەس ناتوانێ وێنەی دابنێ و دەستیان ئەکەوێ قورئان هەمو پەیڕەو یاسای گونجاوی تێدایە بۆ پێویستی ژیانی ئادەمیزاد، سود و پێشکەوتنی ئەوانی تێدایە هەتا ڕۆژی دوایی، هیچ ڕاپەڕینێ بۆ پەرەپێدانی زانیاری هیچ شۆڕشێ بۆ سەرکەوتن نەبوە و نابێ قورئان داوای نەکا و پیرۆزبایی لێ نەکا. کەواتە پێغەمەر هەرماوە هەتا قورئان بمێنێ. پێغەمەران هەموویان بەرێزن و خاوەنی پلە و پایەن. بەڵام جیاوازی لە پلەیانا هەیە، پێغەمەری ئیسلام خوا لە هەموویان زۆرتر پلە و پایەی پێبەخشیوە کە لە پاش ئەو پێغەمەرێ تر ڕەوانە ناکرێ، قورئانیش هەموو یاسای ژیانی ڕۆژانەی ئادەی‌میزادی تێدایە، هەمو بۆشایی ژیان بە قورئان و بە موحەمەد پڕکراونەتەوە، جیهانیان پێ ڕوونکراوەتەوە زۆرتر لە ڕووناکی خۆر و کارەبا،

بۆ زۆرتر شارەزابوون لە ڕوداوی زەید و زەینەبەدا جارێ تر ئەم باسانەی خوارەوە پێشکەشی باوەڕداران و هەموو ئادەمیزادێ ئەکەین:

زەید کوڕی حاریسەیە لە دیل کراوی شامە، کۆمەڵێ لە توهامە بە منداڵی دیلیان کرد،دوایی حەکیمی کوڕی خوازام کڕی و بەخشیوێتی بە خەدیجەی کچی خوەیلید، کە شوی کرد بە پێغەمەر بەخشی بە پێغەمەر بەر لەوەی بکرێ بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە بست و پێنج ساڵ، پێغەمەر ئازادی کرد و کردی بە کوڕی خۆی و ناوبانگی دەرکرد بە زەیدی کوڕی موحەمەد و یەکێ بو لەو کەسانە بەر لە زۆر کەس باوەڕی هێنا بە پێغەمەر و پێغەمەر خۆشی ئەویست و پێشی ئەخست لەزۆر کەس و هاوڕێکانی، بەنیازی پاکە و کۆششی کردبو بۆ بەرزی ئایینی ئیسلام، لەبەر ئەوەی زۆری خۆش ئەویست لە ساڵی (٥)ی کۆچیدا خوازبێنی زەینەبەی کچی جحشی کرد بۆی کە پورزای باوکی خۆی بو ناوی پورەکەی ئومەیمە کچی عەبدولموتەلیب، زەینەبە و عەبدولاّی برای هەرچەندە لایان خۆش نەبو، چونکە ئەوان قورەیشی و لە بنەماڵەیەکی ڕێزدار بوون، زەیدیش بەندەی ئازادکراو بوو، لەبەر ئایەتێ لە قورئان هاتە خوار، زەینەبە شووی کرد بە زەید هەرچەندە لە دڵدا لای گرانبوو عەبدولاّی برایشی ڕازی نەبوو بەو شووکردنە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ شەست درەم و (١٠) دیناری لەگەڵ هەندێ کەل و پەل و خواردەمەنی تری دا بەزەینەب لە مارەییدا.

دوای شووکردنی زەینەبە بە زەید، چونکە بە هاوسەری خۆی نەئەزانی ئازاری دڵی زەیدی زۆر ئەدا هانای بردە خزمەت پێغەمەر چەند جارێ کە زەینەبە زۆر ئازاری ئەدا، هەموو جارێ پێغەمەر ئەیفەرموو تەلاقی مەدە و لە خوا بترسە. بەڵام زەید توانای هاوڕێیەتی زەینەبەی نەما و تەلاقی دا. ئەوەی یاسای ئیسلام پێویستی کردبوو زەید دای بە زەینەبە.

بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام عەرەبەکان کوڕی جگەی خۆیانیان ئەکرد بە کوڕی خۆیان و لەهەمو ڕویکەوە وەك کوڕ مامەڵەی بۆ ئەکرا و میراتیان لەیەکتری ئەگرت، خوای مەزن

ویستی ئەو ڕەوشتە بنەبڕبکات ئەگەر ئایینی ئیسلام بەو جۆرە بڕۆشتایە دروست نەئەبو ژنی کوڕێ جگەی بەکوڕی خۆ کردو مارەبکا دوای تەلاقدانی. بەلاَم خوای گەورە جگە لە ژنی کوڕی پشتی ڕەوا کرد، بەو بۆنەیەوە ڕەوای فەرمو مارە کردنی ژنی کوڕی بەدەم کراو بەکوڕی خۆ.

بۆ بنەبڕکردنی ئەو ڕەوشتە و، بۆ ڕاگەیاندنی ڕەوابوونی ئەو کارە خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەر زەینەبەی ژنی زەیدی بەکوڕکراوی پێغەمەر مارە بکا بۆ پوچ کردنەوەی ئەو کارەی کە دروست نەبو مارە کردنی ئەو جۆرە کوڕانە بەدەم کراوان بە کوڕ نەك بە پشت، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانەکەی خوای مەزنی بەجێهێنا و بەیەك جاری ئەو ڕەوشتە نەما وە زەینەبەی دوای تەلاقدانی زەید و کۆتایی عیدە پێغەمەر زەینەبەی مارەکرد. لەبەر گرنگی ئەو کارە چەند جارێ ئەو باسە دوو پات کراوەتەوە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: یادی خوا بکەن بە یادێکی زۆر بەدڵ و بە زمان و بەهەمو ئەندامەکانتان بە هەموو جۆرە ستایشێ، بەو جۆرەی شایستەی خوا بێ.

﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ وە ئێوە خوا دووربخەنەوە لە شتێ شایستەی گەورەیی ئەو نەبێ لە بەیانیانا بەهۆی کردنی نوێژی بەیانیەوە و لە ئێوارانا بەهۆی کردنی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشاوە، لەبەر ئەوەیادی ئادەمیزاد بۆ پەروەردگاری خۆی لەو دوو کاتانەدا ئاماژەیە بۆ گەورەیی خوا کە بە میهرەبانی خۆی ئەو دووکاتەی دروست کردوە بۆ سوودی ئادەمیزاد ئەگینا پێویستە یادی خوا بکرێ لە هەموو کاتێکا نەك هەر لەو دوو کاتەدا.

﴿ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ وە خوا کەسێکی ئەو تۆیە لە ئێوە خۆش ئەبێ و میهرەبانە بۆتان فریشتەکانی داوای لێخۆشبوون ئەکەن بۆ ئێوە لە خوا; لەبەر ئەوەی خوا ئێوە لەتاریکیەکانی بێباوەڕی و گوناه و دۆزەخ دەربهێنێ بۆلای ڕووناکی باوەڕ و پەرستن و بەهەشت، خوا میهرەبانە بۆ باوەڕداران و لێیان خۆش ئەبێت و ڕێزیان ئەگرێت.

﴿ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴾ خۆش و تەوازەی خوا بۆ باوەڕداران لە لایەن خوا و ڕۆژی بە خزمەت خوا ئەگەن هەواڵدانی خوایە بەوان کە دوورن لە هەمو خراپەیە و، خوا ئامادەی کردوە بۆ ئەوان و پاداشتێکی بەنرخ و بەرێز کە چوونیانە بۆ بەهەشت.

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾ ئەی پێغەمەر: ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە بۆلای ئەو کەسانەی تۆ ڕەوانەکراوی بۆلایان شایەتی بدەی لەسەریان پەیامی خۆتت بەوان ڕاگەیاندوە و، موژدە بدەی بە بەهەشت بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بەتۆ هێناوە و، ئەو کەسانە بترسێنێ باوەڕیان بەتۆ نەهێناوە.

﴿ وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ وە بانگی ئادەمیزاد بکە بۆلای پەرستنی خوا بەتەنها و، چرایەکی خاوەن ڕووناکی بۆیان بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست و وەرگرتنی ڕێگەی ڕاست بەگوێرەی دەستووری خوا.

﴿ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ اللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴾وە تۆ موژدە بدە بە باوەڕداران کە بۆ ئەوان هەیە لە لای خوای مەزن پاداشتێکی گەورە و ڕێزێکی بەنرخ زۆرتر لە نەتەوەکانی تر لەبەر ئەو کارە گرانەی بەوان سپێردراوە.

﴿ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ وَدَعْ أَذَاهُمْ ﴾ وە تۆ پەیڕەوی بێباوەڕان و دووڕووان مەکە لەو شتانەی کە دژی دەستووری ئایینی ئیسلامن و، تۆ واز لە ئازاردانی ئەوان بهێنە بۆ تۆو، وولامی ئەوان مەدەرەوە.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴾ وە تۆ پشت هەر لەسەر یاریدانی خوا ببەستە و هەموو کارێکت هەواڵەی خوا بکە و، بەسە خوا تۆ بپارێزێ لە ئازاری بێباوەڕان و دوو ڕووان.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ ئێوە ژنانی باوەڕدارتان مارەبڕی لەپاشدا ئێوە ئەو ژنانەتان تەڵاق دا پێش ئەوەی ئێوە بچنە لایان و ژن و مێردایەتی‌یان لەگەڵ بکەن، لەلای حەنەفیەکان دانیشتنی تەنهایی لەگەڵ ئەو ژنانە وەك چوونە لایان وایە.

﴿ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ بۆ ئێوە نی‌یە بەسەر ئەو ژنانەوە عیدەیە ئەوان بژمێرن بەچەند ڕۆژێ یان بەچەند حەیز و پاکیەوە بەگوێرەی یاسای دیاریکراو، دوایی ئێوە شتێ بدەن بەو ژنانە و پێ ڕابوێرن بۆ ئەو ماوەیە و ڕێگەیان بۆ چۆڵ کەن و بەرەڵایان بکەن بەبەرەڵاکردنێکی بێ‌ئازار و ئەتوانن عیدە نەژمێرن و شوبکەن. موتعە پێویستە بدرێ بەو ژنانە ئەگەر ناوی مارەییان بۆ نەبڕابێ، ئەگەر مارەییان بۆ دیاریکرابو نیوەی مارەییان ئەدرێتێ و موتعە پێدانیان پێویست نی‌یە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِيٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِيٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾

۞ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ

مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ ﴾ ئەی پێغەمەر ئێمە بۆ تۆمان ڕەواکردوە ئەو ژنانەی ئەوتۆی خۆت بەخشیوتە پێیان مارەیی‌یەکانیان لەهەرکاتێکا بێ. بەڵام وا چاکە لە پێشەوە مارەی‌یەکانیان بدرێتێ، ناوبردنی مارەیی و دیاریکردنی سونەتە. ژنێ ناوی مارەیی‌یەکەی نەبرابێ لە کاتی مارەبڕیندا هەرکاتێ ژن و مێردی لەگەڵ کرا پێویستە مارەیی بدرێتێ بە وێنەی مارەیی ژنێ وێنەی ئەو بێ لە پلەوپایەدا. مارەیی ژنەکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ پێنج سەد دراو بوە، لەو ڕستەوە وا دەرئەکەوێ دروستبوە بۆ پێغەمەر بەبێ ژمارە ژن بهێنێ، ئەو کارەیش تایبەتی بوە بە پێغەمەرەوە لەبەر چەسپاندنی یاسا تایبەتی‌یەکان بەژنانەوە و پەرەپێدانی یاسای ئیسلام بەناو نیوەی کۆمەڵدا.

﴿ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ ﴾ وە بۆیشمان ڕەوا کردووی ئەو ژنانەی تۆ بووی بەخاوەنیان لە جەنگدا بوە بەدەستکەوتی تۆ و خوا پێی بەخشیوی باژمارەیشیان زۆربێ، لەو ژنانەی سەربەستن، وە ئەو کارەکەرانەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کردوونی بە ژنی خۆی ئەمانەن:

١. سەفیەی کچی حوبەی کوڕی ئەختەب پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەدیل گرتی لەخەیبەردا ساڵی حەوتەمی کۆچی، موسڵمان بوو پێغەمەر ئازادی کردو، ئازادکردنەکەی کرد بە مارەیی بۆی.

٢. جوەیرەی کچی حاریس: لە غەزای بەنولموستەلیقدا بەدیل گیرا و بو بەشی سابیتی کوڕی قەیس و خۆی پێ‌فرۆشت بە پارە و پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾پارەکەی بۆ داو کردی بەژنی خۆی دوای ئازادکردنی.

٣. ماریەی قیبتی هیرقەل بەدیاری ناردی بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمەر لەو پەیدابوە.

﴿ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ ﴾ وە ئێمە بۆ تۆمان ڕەوا کردوە مارەبڕینی کچەکانی مامی خۆت و کچانی خوشکی باوکت و کچەکانی خاڵت و کچەکانی خوشکی دایکت ئەوانەی ئەوتۆیان کۆچیان کردوە لەگەڵ تۆ بۆ مەدینە.

بۆ زانین: ئەوەی شایستەی پلەی پێغەمەربێ ئەوەیە : ئەو ژنانەی خزمی خۆی مارەبکا کە بە باوەڕداری کۆچیان کردوە لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەڵام دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەو ژنانەی کۆچیان نەکردوە مارەبڕینیان قەدەغەکرا لەسەر پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾.

پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ خاڵ و خوشكی دایكی نەبوە، مەبەست لەوان هۆزی بەنوزوهرەیە كە ئەیان ووت: ئێمە خاڵوانی پێغەمەرین. پێغەمەر (٩) مامی هەبوە: عەباس. حەمزە. زوبەیر. ئەبوتالیب. حاریس. مەجلا. ئەلوقەویم. ئەبولەهەب. شەش خوشكی باوكی هەبوە: سەفیە. ئوموحەكیم. عاتیكە. ئومەیمە. ئەروا. بەرە.

﴿ وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە ئێمە بۆ تۆمان ڕەوا كردوە مارەكردنی ژنێكی باوەڕدار كە خۆی ببەخشێ بە پێغەمەر ئەگەر پێغەمەر ویستبووی كە مارەی بكا، ئەو بەخشینە بە تایبەتی بۆ ئەو دروستە نەك بۆ باوەڕدارانی تر، بەڵام ئەبێ مارەیان بكا. دوای خۆبەخشین.

زۆربەی زانایان لایان وایە مارەبڕینی ژنان بە ووشەی هیبە دروست نیە. لای هەندێ لە زانایان مارەبڕینی ژنان بە ووشەی هیبە و تەملیك دروستە . ئەو ژنانەی خۆیان بەخشی بە پێغەمەر و داوای مارەییان نەكرد ئەمانەن: مەیمونەی كچی حاریس كە دواهەمین ژنی پێغەمەرە. زەینەبەی كچی خوزەیمەی ئەنساری كە بەر لە ئایینی ئیسلام ناوبرابوو بە دایكی هەژاران. چونكە خواردنی ئەدانێ و ئەو لە ژیانی پێغەمەردا مردوە. ئومو شورەیكی ئەزدی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نەچوە لایی و تەڵاقیدا.

﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ ﴾ وە ئێمە زانیومانە و پێویستمان كردوە لەسەر باوەڕداران شتێ لەبارەی ژنەكانیانەوە نابێ لە چوار ژن زۆرتر بهێنن جگەی پێغەمەر و ئەبێ لە كاتی مارەكردنیاندا دوو شایەت ئامادەبن، خەوتن لایان یەكسانبێ، بەخشینی ژنان خۆیان بەجگەی پێغەمەر قەدەغەیە و دیاریمان كردوە بۆ باوەڕداران لەبارەی ئەو ژنانەی بەندەی ئەوانن بەكرین و جگەی كرین دروستە گەورەكانیان بچنە لایان.

﴿ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ ئێمە پلەی تایبەتیمان بەخشیوە بەتۆ ئەی پێغەمەر: كە بۆ تۆ دروستە ژنان خۆیان ببەخشن بەتۆ، زۆرتر لە چوار ژن بۆ تۆ دروستە، لەبەر ئەوە هیچ خراپی و گرانی نەكەوێتە سەرتۆ لەو فەرمانانەی خوا پێویستە پەرەیان پێبدرێ و، هیچ كەسێ گومان نەبا كە تۆ بەو كارانە گوناهبار ئەبێ و خوا خۆش ئەبێ لە شتێ گرانبێ خۆپاراستن لەو شتە، میهرەبانە بۆ ئەو كەسەی زۆرتر ڕێزی بگرێ و چاكەی بداتێ.

﴿ تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ﴾ خوای مەزن لە ئایەتی پێشوودا پێغەمەری سەربەست كردبوو بۆی لە ژمارەی ژناندا، لەم ئایەتەدا سەربەستی كردوە لە خەوتن لەلای هەر ژنێ ئارەزۆی هەبێ و نەخەوێ لای هەر ژنێ ئارەزۆی ئەفەرموێ: تۆ دوابخە هەر ژنێ ئارەزۆت هەیە لە نۆرەی خۆیا لە ژنەكانت و بیهێنە بۆلای خۆت هەرژنێ ئارەزۆت هەیە لە ژنەكانت لە جگەی نۆرەی خۆیاو بۆت هەیە ئەو ژنەی لای نەخەوتوویی بیگێڕیتەوە بۆیلا خۆت و، واز لەوی تریان بهێنێ لای خەوتویی، دوایی هیچ گوناهێ لەسەر تۆ نیە لەو كارانەدا تۆ ئەیكەی.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: خەوتنی پێغەمەر لای ژنەکانی بە یەکسانی بووە هەتا هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە. هەندێ تریان لایان وایە هەر بۆ ئەو ژنانەی پێغەمەرە داوای گوزەرانی خۆشیان ئەکرد، پێغەمەر ماوەی مانگێ ئامۆشۆی نەکردن هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە سەربەست کرا کە هەواڵ بدا بەژنەکانی: من سەربەستم کامتان گوزەرانی خۆشی جیهانتان ئەوێ لێتان جوێ ئەبمەوە، هەرکامتان خوا و نێرراوی خواتان ئەوێ ئەتان هێڵمەوە و، لەمەوپاش ژنی تر ناهێنم و، سەربەستەم خەوتن بە یەکسانی بێ یا نە، ئەو فەرمانانە بۆ پێغەمەر ڕەوا بوە. بەڵام پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەگەڵ ئەو سەربەستی‌یەدا هیچ کەسێ لە ژنەکانی خۆی بێبەش نەکرد لە خەوتن لەگەڵیان جگە لە سودەکەی بەشی خۆی بەخشی بە عائیشە.

﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَا آتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ﴾ ئەو سەربەستیە خوا بەخشی بەتۆ نزیکترە بۆلای ڕەزامەندی و پێخۆشبوونی ژنەکانت و خەفەتبار نەبن و هەموویان ڕازی بن بەشتێ تۆ بیکەی لەگەڵیان لەخەوتن لەگەڵیان کەمبێ یا زۆر; چونکە ئەوان ئەزانن هەرشتێ تۆ ئەیکەی لەگەڵیان چاکەی خۆتە و پێویست نی‌یە لەسەرت، لەگەل ئەوەیشدا پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ هەر یەکسانی ئەخستە ناو ژنەکانی.

﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴾ وە خوا ئەزانێ بە شتێ لە ناو دڵی ئێوەدایە لەوەی مەیلتان بۆلای هەندێ لە ژنەکانتانە و، خوا سزای ئێوە نادا لە خۆشویستنی هەندێکیان جگەی ئەوانی تر لە دڵدا و، خوا ئەزانێ بەشتێ لە دڵتانایە، پەلە ناکا لە سزادانا، هەر ئەو شایستەیە لە سزادانا.

﴿ لَّا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ ﴾ لەمەودوا بۆ تۆ ڕەوا نی‌یە مارەکردنی هیچ ژنێ لە جگەی ئەو (٩) ژنانەی ئێستا: عائیشە کچی ئەبوبەکر، حەفسەی کچی عومەری کوڕی خەتاب، زەینەبەی کچی جەحشی ئەلئەسەدی. ئوموسەلەی کچی ئومەیەی ئەلمەخزوومی. ئومو حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان. سەفیەی کچی حوبەی کوڕی ئەلئەختەب. مەیمونەی کچی حەرسی ئەلهیلالی. سودە کچی زەمعەی کوڕی ئەلئەسوەد. جوبرەی کچی حەرسی ئەلموستەلیقی. ئەو نۆ ژنانە بەتەنها هەر بۆتۆ دروستە، بە وێنەی چوار ژن بۆ جگەی تۆ.

﴿ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا ﴾ وە بۆ تۆ ڕەوا نیە جگەی ئەم ژنانە بگۆڕی بە ژنانی تر. یانێ ئەگەر یەکێکیان مرد یا تەڵاقت دا ڕەوانیە بۆ تۆ ژنی تر بێنی و، باوەکو سەرنجی تۆ ڕاکێشێ جوانی جگەی ئەم ژنانە مەگەر ژنێ بەندەبێ و تۆ ببی بەخاوەنی بەکڕین یا بەجگەی کڕین، دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە هیرقەل فەرمانڕەوای میسر ماریەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئیبراهیم لەو پەیدابوە و، خوا ئاگاداری هەموو شتێکە ئاگاتان لە خۆتانبێ و لەسنور دەرمەچن.

زانایان ئەڵێن: جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب شەهیدکرا پێغەمەر ویستی ئەسمائی کچی عەمیسی و ژنی جەعفەر مارەبکا، بەو ئایەتە قەدەغەکرا. هەروەها ئەڵێن: ڕستەی ﴿ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کاتێ ئادەمیزاد ویستی خوازبێنی ژنێ بکا دروستە تەماشا کردنی.

عەرەبەکان لەکاتی زەماوەند و شایی و شیرینی خواردنەوەدا دانیشتوانیان بانگ ئەکرد بۆ نان خواردن و دائەنیشتن و چاوەڕوانی پێگەیشتنی خواردەمەنیان ئەکرد، دوای نانخواردنیش دائەنیشتن و دەستیان ئەکرد بەگفت وگۆکردن. کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ زەینەبەی پورزای خۆی هێنا خواردەمەنی دروست کرد و بانگی هاوڕێکانی خۆی کرد بۆ نانخواردن، ئەوانیش تاقم تاقم ئەهاتن و نانیان ئەخوارد.تاقمێکیان لە پێشا چاوەڕوانی پێگەیشتنی خواردنیان ئەکرد، هەندێ تریان دوای نانخواردن دانیشتن و دەستیان ئەکرد بە گفت وگۆکردن و درێژەیان ئەدا بە دانیشتن، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەیەویست هەڵسێ و ئەوان نەئەچوونە دەرەوە، دوایی هەڵسا و چوو بۆلای ژنەکانی و خۆشی و تەوازەی لەگەڵ کردن سێ کەسیان هەرمابوونەوە، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ شەرمی کرد و گەڕایەوە، لەپاشا هەواڵیاندا هەڵساون، لەبارەی ئەو ڕووداوەوە خوای مەزن فەرمووی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِىٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ إِخْوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبْنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ

أَيْمَـٰنُهُنَّ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە مەچن بۆ ناو خانوەکانی پێغەمەر مەگەر کاتێ بچنە ژوورەوە دەستوور بدرێ بە ئێوە بۆلای خواردنی خواردەمەنێ پێگەیشتبێ، بچنە ژوورێ بەجۆرێ ئێوە چاوەڕوانی پێگەیشتنی خواردەمەنی نەکەن.

هەرەیەکە لە ژنەکانی پێغەمەر هۆدەیەکی تایبەتییان هەبوو لەم لا و ئەولای مزگەوتەوە کاتێ کۆچی دواییان کرد خرانە سەر مزگەوت.

﴿ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ ﴾ وە بەلاّم هەرکاتێ ئێوە بانگ کران بۆ نان خواردن، دوایی ئێوە بچنە ژوورەوە، دوای ئەوەی ئێوە نانتان خوارد بچنە دەرەوە بۆلای کاری خۆتان، ئێوە دامەنیشن و لەگەل یەکتری ڕابوێرن بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتری.

﴿ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ ﴾ بەڕاستی دانیشتنی ئێوە ئازاری پێغەمەر ئەدا، دوایی پێغەمەر شەرم ئەکا لە ئێوە کە بڵێ: ئێوە بچنە دەرەوە و، خوا شەرم ناکا لە ووتنی کاری ڕاست و ئامۆژگاری ئێوە ئەکا بۆ فێربوونی ڕەوشتی بێئازاری و کۆمەلاّیەتی.

هەرچەندە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستانەی پێشوو لەبارەی خانوەکانی پێغەمەرەوە هاتوونەتە خوارەوە بەلاّم ناوەڕۆکەکانیان خانووی هەموو کەسێ ئەگرێتەوە.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جارێ لەگەڵ عائیشەدا نانی ئەخوارد، عومەری کوڕی خەتاب بەلایاندا ڕۆیشت، پێغەمەر بانگی کرد نانیان لەگەڵدا بخوات، لەکاتی نانخواردندا پەنجەی عومەر کەوت لە پەنجەی عائیشە و عومەر ووتی: ئەی وەی بۆ من: لەپاشا ووتی: ئەی پێغەمەر: واچاکە پێغەمەر پەردەیەك دابنێ لە نێوان ژنەکانت و دەرەوەدا، بەڕاستی پیاوی چاك و خراپ ئەچنە خانوەکانی ئەوانەوە. خوای مەزن لەوبارەوە فەرمووی:

﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ﴾ وە هەرکاتێ ئێوەی ئادەمیزاد داوای شتێ لە کەل پەلی ناو خانوەکانتان کرد لە ژنانی پێغەمەر، دوایی ئێوە داوای ئەو شتانەیان لێبکەن لە پشتی پەردەوە، قەدەغەیە تەماشاکردنی ژنانی پێغەمەر بەهەموو شێوەیە. ئەوەی باسکرا چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە ودڵی ژنانی پێغەمەر و، دوورترە لە گومان بردن و هاتوچۆی خراپە بەدڵتانا، کەواتە تێکەلاّوبوونی پیاوان و ژنانی بێگانە

قەدەغەیە، یا چاکتر وایە بەلای کەمەوە وازی لێبهێنرێ؛ چونکە تێکەڵاوی ئەبێتە هۆی وورووژاندنی خراپە لە دڵدا.

ئامۆزای یەکێ لە ژنەکانی پێغەمەر گفتوگۆی ئەکرد لەگەڵ ژنێکی پێغەمەردا، پێغەمەر فەرمووی: لێرە مەوەستە. ئەو پیاوە ووتی: ئەو ژنە ئامۆزای منە و گفتوگۆی خراپمان نەکردوە، پیاوەکە ڕۆیشت و وتی: بەڕاستی دوای پێغەمەر ئەم ژنە مارە ئەکەم لە خۆم، خوای مەزن لەو بارەوە فەرمووی:

﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ﴾ وە شایستە نی‌یە بۆ ئێوە ئازاری فروستادەی خوا بدەن بەکارێ یا بەگفتوگۆیە و، ڕەوانیە بۆ ئێوە کە ژنەکانی پێغەمەر مارەبکەن لە دوای مردنی پێغەمەر.

﴿ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا ﴾ بە ڕاستی ئازاردانی پێغەمەر لە کاتی ژیانیدا و، مارەکردنی ژنەکانی دوای مردنی گوناهێکی زۆر گەورەن بەلای خواوە، بێڕێزیە بۆ پلەی بەرزی پێغەمەر، مانی پێغەمەر و نەمانی یەکسانە پێویستە ئازاری نەدرێ لە هەموو کاتێکا.

﴿ إِن تُبْدُوا شَيْئًا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ ئەگەر ئێوە هەرشتێ ئاشکرابکەن لە نیازی مارەکردنی یەکێ لە ژنەکانی پێغەمەر یا بیشارنەوە لە دڵتانا دوایی خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ، سزاتان ئەدا.

دوای ئەوەی خوای گەورە فەرمانی دا بە پیاوان لە پشتی پەردەوە گفتوگۆ بکەن لەگەڵ ژنانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کاتێ داوای کەل و پەلی ناو خانوەکانیان لێبکەن، فەرمووی:

﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ ﴾ وە هیچ گوناهێ نیە لەسەر ژنانی پێغەمەر و جگەی پێغەمەر لە تێکەڵاوی نێوان ئەوان و نێوان باوك و كوڕ و براو كوڕی براو كوڕی خوشك و ژنانی موسڵمان و بەندە و کارەکەرەکانیان، دوایی بۆ ژنانی پێغەمەر ڕەوایە چاویان بەوان بکەوێ و گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن بەبێ پەردە. بەڵام ژنانی بێباوەڕ پێوستە خۆیان داپۆشن لەوان بەوێنەی پیاوانی بێگانە.

﴿ وَاتَّقِينَ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴾ وە ئەی ژنانی پێغەمەر ئێوە لە خوا بترسن لەشتێ فەرمانتان پێدراوە. بەڕاستی خوا ئەزانێ بەهەموو شتێ، هیچ کەسێ لە خوا پەنهان نی‌یە.

إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا

مُّهِينًا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾

﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ﴾ بەڕاستی خوا خۆشەویستی و ڕەزامەندی و میهرەبانی خۆی ئەڕێژێ بەسەر پێغەمەردا و، فریشتەکانی لە خوا ئەپاڕێنەوە و داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەکەن لە خوا هەتا بەتەواوی خوا چاکە بڕێژێ بەسەر پێغەمەردا. کەواتە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خوا لەکاتی ژیانی پێغەمەر و لەدوای مردنیدا ڕێزی لێ گرتوە و، پلەی بەرزی پێغەمەری ڕوون کردوەتەوە لە نامەی خۆیا.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە دروود بنێرن تەنها بۆ سەرپێغەمەر جگەی پێغەمەرانی تر لەبەر پلەی پێغەمەرێتی بەسەر ئەواندا و، ڕێز لە هەموویان بگرن و، ئێوەی باوەڕدار داوای ئاشتی و بێ وەیی بکەن بۆ پێغەمەر. بڵێن: ﴿اللهم صل على محمد السلام عليك أيها النبي﴾ بە ئاشییەکی گەورە.

بۆ زانین: سەڵەوات دان لەسەر پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێویستە پێنج جار لە شەو و ڕۆژێکا لە نوێژەکانا، هەموو زانایان پێك هاتوون لەسەر پێویستی سەڵەوات، لە پاشا جیاوازییان هەیە لە ئەندازەییدا لای زۆربەی زۆری زانایان لە هەموو تەمەنی ئادەمیزاددا پێویستە یەك جار سەڵەوات بدا لەسەر پێغەمەر، هەندێ تریان ئەڵێن: پێویستە لەهەموو تەحیاتی کۆتایی نوێژدا، ڕستەکەیشی بەم جۆرەیە: ﴿ اللهم صل على محمد وَسَلِّم تسليما﴾ هەندێ تریان لایان وایە هەمو کاتێ ناوی پێغەمەر برا پێویستە سەڵەواتی لەسەربدرێ. سەڵەواتدان لەسەر ئالی پێغەمەر لە دوای پێغەمەرەوە چاکە. بەلام بەتەنها سەڵەواتدان لەسەر ئالی پێغەمەر چاك نییە.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ شتێ ئەکەن خوا و فروستادەی خوا پێیان ناخۆشە لەبێباوەڕی و بێفەرمانی خوا ئەڵێن: خوا کوڕو ژن و هاوبەشی هەیە و، پێغەمەر شێتە و شاعیر و پۆشەوێژە، جادوگەرە و، موحەمەد پێغەمەرنییە.

﴿ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ خوا دووری خستوەتەوە لە هەردوو جیهاندا لە میهرەبانی خۆی و یارمەتیان نادا بۆلای ڕێگەی ڕاست و، خوا ئامادەی کردوە بۆیان سزایەکی خاوەن ئازار و ئابڕووبەریان.

﴿ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ئازاری پیاوان و ژنانی باوەڕدار ئەدەن بەجگەی شتێ ئەوان کردوویانە بە گفتوگۆ و کرداری خراپ بەبێ ئەوەی ئەوان تاوانێکیان کردبێ، دوایی ئەو کەسانە هەڵیان گرتوە بوختانێکی گەورە و گوناهێکی ئاشکرا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِي ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ﴾ ئەی پێغەمەر: تۆ بڵێ بە ژنەکانت و کچەکانت و ژنانی باوەڕداران ڕومەت و لەشی خۆیان داپۆشن بەسەرپۆش و کراسەکانیان کاتێ چوونە دەرەوە بۆ جێبەجێکردنی پێوستیەکانی خۆیان و، تەنها یەك چاویان بەدەرەوە بێ لەبەر ئەوەی ڕێگەی پێبدۆزنەوە.

﴿ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ ئەو خۆداپۆشتنەیان نزیکترە کە بناسرێن ژنانی سەربەستن و جوێ ببنەوە لە کارەکەرەکان و، دوایی ئازارییان نەدرێ بەهۆی ڕێگە پێگرتنیان لە لایەن داوێن پیسانی لە سنوور لادەری یاسای پاکی ئیسلام و ڕەوشتی بەرز و، بە ئاواتی خراپی خۆیان نەگەن و، خوا لە گوناهی ڕوتی لەمەوپێشمان خۆش ئەبێ، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ بەندەکانی خۆی و، چاودێری سوودیان ئەکا و ئەیانپارێزێ.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەبوە، عەرەبەکان جێگەی تایبەتییان دروست نەکردبوو بۆ ئەوەی پێویستی خۆیان جێبەجێبکەن و، ژنانی سەربەست و کارەکەرە بەندەکان بۆ جێبەجێکردنی پێویستیان ئەچون بۆ ناو باخ و درەختی خورما، داوێن پیس و بێناموسەکان ڕێگەیان بەکارەکەرە شۆخەکان ئەگرت.

﴿ لَئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ ﴾ بە ڕاستی ئەگەر دوو ڕووەکان و ئەو کەسانەی باوەڕیان لاوازە لە دڵیانا و، وێنەی داوێن پیسەکان و لادەران لە سنووری ئایین و، ئەو کەسانەی درۆ و بوختان بڵاو ئەکەنەوە بۆ لەشکری ئیسلام و واز لەو خراپانەی خۆیان نەهێنن و، کۆتایی بەو کارانە نەهێنن لە شاری مەدینەدا.

﴿ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا ﴾ بە ڕاستی ئێمە هانی تۆ ئەدەین و، فەرمان بە تۆ ئەدەین لەبارەی دیاریکردنی کاری ئەوان، لە پاشا ئەوان لەگەڵ تۆ دانەنیشن لە مەدینەدا مەگەر ماوەیەکی کەم بەو ئەندازەیە تۆ پێویستیت لێ هەبێ هەتا لە مەدینە دەریان ئەکەی.

﴿ مَلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا ﴾ ئەو کەسانە بێبەشن لە میهرەبانی خوای مەزن و، دوورخراونەتەوە لە بەزەیی خوا و، کاتێ دەرکران لاوازی و بێتوانان و پەنایە بۆ ئەوان نابێ، لەهەر جێگەیە بوون ئەگیرێن بە دیلی ئەکوژرێن بە خراپترین کوشتن.

﴿ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾ بە ڕاستی ئەو شتانەی باسکران دەستورێکە خوا دایناوە لە ناو کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش ئێستاوە بوون، ئەو کەسانەی ئەوتۆ دووڕوویان بەکارهێنابێ لە خزمەت پێغەمەرەکانیان و گاڵتەیان بەخواکەی کردبێ و، گفتوگۆی خراپیان لە ناو ئادەمیزادا بڵاوبکردایە ئەکوژران و، هیچ کەسێ ناتوانێ دەستورێ خوا دایبنابێ بیگۆڕێ لە ناو بوونەوەراندا، چونکە ئەو دەستوورانە لەسەر زانست دانراون بەجۆرێ سوودی ئادەمیزاد لەسەر ئەو دەستوورانە ئەسوورێ.

يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَـٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾

﴿ يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ ﴾ بێباوەڕانی ئادەمیزاد پرسیار لە تۆ ئەکەن لەبارەی ڕۆژی دواییەوە، دووڕووەکان پرسیاریان لێ ئەکرد، بڕوایان بە هاتنی ڕۆژی دوایی نەبو، جوەکان بڕوایان بەهاتنی هەبو بۆ تاقیکردنەوە پرسیاریان لێ ئەکرد، تۆ بڵێی لە وڵامیاندا بە ڕاستی زانینی کاتی ڕۆژی دوایی هەر لای خوایە و جگەی خوا نایزانێ، نەفریشتەکان و نە پێغەمەران، کەس ئاگاداری کاتی هاتنی نیە.

﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴾ وە چ شتێ بێ بەتۆی ڕابگەیەنێ کاتی هـاتنی ڕۆژی دوایی؟ ئەگەر ئێمە بە تۆی ڕانەگەیەنین، شایستەیە ڕۆژی دوایی نزیکبـێ هـاتنی. خـوا پەنـهانی داوە، بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە و چالاك بن بۆ کردنی فەرمانی خوا، پەلـەمەکەن بۆ هاتنی.

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴾ بەڕاستی خوا بێبـاوەڕانی دوورخستوەتەوە لـە میهرەبانی و بەزەیی خۆی و، بۆیانی ئامادەکردوە ئاگرێکی سەختی کلّپەداری زۆر گەرم.

﴿ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ ئەو بێباوەڕانە بەردەوامن لـەناو ئەو ئاگرەدا هەتا هەتایە، دەستیان ناکەوێ هیـچ کەسـێ ئاگایـان لـێیانبـێ و، هیـچ کەسـێ سـزای خوایـان لێبگێڕێتەوە.

﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە ڕومەتی بێباوەڕان لـەناو ئاگردا ئەم دیودیوی پێئەکرێ، وەك پارچە گۆشتێ ببرژێنرێ، ئەو کاتە سەرۆکی بێباوەڕان ئـەڵێن: ئـەی دانیشـتووان: خۆزگایـە ئێمـە باوەڕمـان بهێنایـە و، پەیڕەوی فەرموودەی خوا و فروستادەی خوامان بکردایە، خەفەت ئەخۆن و پەشیمان ئەبنەوە.

﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴾ وە بێبـاوەڕە ژێـر دەسـتەکان بەناخۆشییەوە ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: بەڕاستی پەیڕەوی پاشا و گەورەکانی خۆمانمـان کردوە، دوایـی ئـەوان ئێمـەیان لـە ڕێگـەی فـەرمانی تـۆ لادا و، بێفـەرمانی تۆیـان بـۆ ئێمـە ئەڕازاندەوە.

﴿ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴾ ئەی پـەروەردگاری ئێمـە: تـۆ سـزای ئەوان بدە بەدوو چەندانەی سزای ئێمە؛ چونکە ئەوان خۆیان گومڕابوون و ئێمـەیان لـە ڕێگـە لاداوە و، تۆ ئەوان دوور بخەرەوە لـە میـهرەبانی و بـەزەییخۆت بـە دوور خسـتنەوەیەکی زۆر گەورە.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێـوە وێنـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ مـەبن ئـازاری موسایان دا، دوایی خوا موسای ڕزگار کرد لـە شتێ کە ئەوان ووتیـان بـە موسـا و، موسـا لای خوا خاوەنی ڕێزێکی زۆر گەورەیە.

ئەو فەرموودەیەی خوای مەزن لەوەوەە هـاتووە : بـەنو ئیسـرائیلیەکان بـە ڕووتـی خۆیـان ئەشۆرد و، موسا زۆر بە شەرم و ڕەوشت بەرز بوو، بەتەنها خۆی ئەشۆرد و خۆشی دائەپۆشی، ووتیان: بۆیە خۆی دائەپۆشێ خراپەیەیە لـە شـیایەتی، ڕۆژێ مووسـا ڕۆیشـت خـۆی بشـۆرێ، بەرگەکانی خۆی لـەسەر بەردێ داناو، بەردەکە بەبەرگەکانییەوە ڕۆیشـت، موسـا بـە ڕووتـی دوای کەوت هەتا گەیشتە تاقمێ لــە بـەنو ئیسـرائیلیەکان، دوایـی تەماشـای موسـایان کـرد بەوجۆرە نییە ئەوان گومانیان ئەبرد. کەواتە ئێوەش ئازاری پێغەمەری خۆتان مـەدەن بـە شـتێ لای خۆش نەبێ.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ﴿٧٣﴾

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە. ئێوە خۆتان بپارێزن بەهۆی ترسی خواوە لە هەموو شتێ ئێوە ئەیکەن و لە هەموو شتێ ئێوە وازی لێئەهێنن و، ئێوە گفت و گۆی ڕاست بڵێن و، ئاگاتان لە زمانی خۆتان بێ، بۆختان و درۆ مەدەنە پاڵ فروستادەی خوا لە بارەی کاری زەینەبەوە بە تایبەتی، ئەگەر ئێوە ئەو کارانە بکەن خوا یارمەتی ئێوە ئەدا بۆلای هەموو کارێکی چاك و، لێتان وەرئەگرێ و، گوناهەکانتان ئەشۆرێتەوە.

﴿ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ وە هەرکەسێ پەیرەوی خوا و فروستادەی خوا بکا لە هەموو شتێ ئەوان فەرمانی پێئەدەن و، لە هەموو شتێکا ئەوان قەدەغەیان کردوون، دوایی بە ڕاستی ڕزگاریان بووە بە ڕزگاربوونێکی گەورە، لە جیهاندا بەچاکی ئەژین و، لە پاشەڕۆژدا بە بەختیاری ئەژین.

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ ﴾ بەڕاستی ئێمە پەرستن و خۆ بەختکردمان نومایش کردوە بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکاندا کە بیان گرنە ئەستۆی خۆیان و جێبەجێیان بکەن.

زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە لە ووشەی ﴿ الْأَمَانَةَ ﴾ هەندێکیان ئەڵێن: بە مانا داواکاری و پەرستنی خوایە، هەندێ تریان ئەڵێن: مەبەست ووشەی ﴿ لا إلهَ الا الله ﴾ هەندێ تریان لایان وایە مەبەست ئەندامەکانی ئادەمیزادە کە پێویستە لەسەری هەریەکەیان بەکاربهێنێ لە شتێکا بۆی دروستکراوە. هەندێ تریان لایان وایە بە مانای دەست پاکی‌یە لە بەکارهێنانی دارایی.

ئەو مانایانە هەموویا شایستەن بـەلام خۆبـەخت کـردن بـۆ سـوودی گشـتی شایسـتە تـرە لـە هەموویان.

﴿ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ﴾ دوایـی ئاسمـان و زەوی و کێوەکـان لەبـەر گرانـی جێبەجێهانانی ئەو ئەمانەتە بیانوویان هێناوە بۆ وەرگرتنی و، ترسـان لـەوەی بیانگرنـە ئەسـتۆی خۆیان تووشی سزای خوا بین.

﴿ وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ وە ئـادەم ئـەو پەرسـتنەی هـەڵگرت خسـتی‌یە ئەستۆی خۆی. بەڕاستی ئادەم ستەمی لـە خۆی جگەی خۆی کرد ئەگەر ئەو ئەمانەتە جێبەجێ نەکەن و، نەیزانی ئەگەر جێبەجێی نەکەن تووشی پاشەڕۆژێکی خراپ ئەبن. کەواتە مەبەسـت لـەناوبردنی ئاسمانەکان و زەوی و کێوەکان ئاماژەیە بۆلای گـەورەیی ئـەو خۆبـەخت کردنـە و دووا ڕۆژی ئەو هەڵگرتنە و ، هەر بەتەنها ئادەمیزادە بتوانێ ڕووبەڕووی نیازی خراپەی خۆیـان بوەستن و کاری چاك بکەن و خراپە نەکەن.

﴿ لِيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ ﴾ بـۆ ئـەوەی دوارۆژ سزای پیاوان و ژنانی دووڕوو بدا لـەسەر ئەوەی بە ڕواڵەت ئەو ئەمانەتە جێبەجێ ئەکەن و لـە ژێرەوە دڵ پیس و بێباوەڕان، بۆ ئەوەی سزای پیاوان وژنانی بت پەرست بدەین، چونکـە تاوانـەکانیان زۆر گەورەیە و هیچ چاکە و خۆبەخت کردنیان گوناهەکانیان ناشۆرێتەوە.

﴿ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ وە بـۆ ئـەوەیش خـوا پەشیمان بوونەوە وەرگرێ لـە پیـاوان و لـە ژنـانی بـاوەڕدار لـەسـەر ئـەو هەڵانـەی لـەوانـەوە پەیدابوون و، بۆ ئەوە دوایی چاکەکان بکەن و ئەمانەتەکـە بەجێبـهێنن و، خـوا لێخۆشـبوونی زۆرە بۆ کەسانێ پەشیمان ئەبنەوە و، خاوەنی بەزەیی و میهرەبانی‌یە بۆ باوەڕداران.

**بەیاریدەی خوای مەزن کۆتایی هات بە ماناکردنی ئەم سورەتە لە ڕۆژی دوو شەممە (٩)ی ڕەبیعول ئەوەڵ، ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی بەرامبەر ١٢-٩-٢٠٠٠ی زایینی**

# ﴿ سورەتی سەبەأ ﴾

لە مەكە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٦) لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە . ژمارەی ئایەتەكان (٥٤) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٣﴾ لِّيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوۡ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٦﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾ هەموو سوپاسێ بەهەرشتێ بكرێ، هەركەسێ بیكا، بۆ هەركەسێ بكرێ، لەسەرهەرشتێ بێ، هەموویان بۆ خوایەكی ئەوتۆیە،

هه‌رشتێ له‌ ناو ئاسمانه‌كان و زه‌وی‌دایه‌ هه‌ر بۆ ئه‌وه‌. هه‌مو بوونه‌وه‌ران، خوا درووستی كردوون، له‌ ژێر ده‌سته‌ڵاتی ئه‌ودان. كار و گوزه‌رانی هه‌موویان و، خوارده‌مه‌نی بۆ گیانداره‌كانیان ساخته‌ ئه‌هێنێ.

﴿ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴾ وه‌ سوپاسی دانیشتوانی به‌هه‌شت له‌ ڕۆژی دوایی هه‌ر بۆ خوایه‌ و، هه‌موو شتێ له‌ جێگه‌ی شیاوی خۆیا دائه‌نێ له‌ هه‌ردوو جیهاندا، ئاگاداری نهێنی‌یه‌كانه‌.

﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ ﴾ خوا ئه‌زانێ به‌شتێ ئه‌چێته‌ ناو زه‌وی له‌ تۆیی دانه‌وێڵه‌ دانه‌وێڵه‌ دره‌خت و له‌ باران و سه‌رچاوه‌ی ئاو و مردوانی ئاده‌میزاد، ئه‌زانێ به‌شتێ دێته‌ ده‌ره‌وه‌ له‌ زه‌وی، له‌ گیاو ڕووه‌ك و دره‌خت و سه‌رچاوه‌ی ئاو و نه‌وت و، له‌ زێڕ و زیو و ئه‌ڵماس و شتی تر، ئه‌زانێ به‌شتێ دێته‌ خواره‌وه‌ له‌ ئاسمان، له‌ باران و به‌فر و ته‌رزه‌و هه‌وره‌ گرمه‌، ئه‌زانێ به‌شتێ به‌رز ئه‌بێته‌وه‌ له‌ ناو زه‌وی بۆ ئاسمان له‌ هه‌وا و ته‌م و دوكه‌ڵ و له‌ فریشته‌كان و له‌ كار و گیانی ئاده‌میزاد و دوای مردنیان و، هه‌ر خوا میهره‌بان و خاوه‌ن به‌زه‌ییه‌، خۆش ئه‌بێ له‌ هه‌ڵه‌و گوناهی به‌نده‌كانی خۆی.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ ﴾ وه‌ كه‌سانێكی ئه‌وتۆ باوه‌ڕیان نه‌هێناوه‌ ئه‌ڵێن: ڕۆژی دوایی نایه‌ بۆلای ئێمه‌ و نازانین ڕۆژی دوایی چ شتێكه‌، تۆ بڵێ: به‌وان : سوێند به‌ په‌روه‌ردگاری خۆم ئه‌خۆم ڕۆژی دوایی به‌ڕاستی دێت بۆلای ئێوه‌. به‌ڵام كاتی هاتنی هه‌ر خوا ئه‌یزانێ.

﴿ عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾ په‌روه‌ردگاری من ئه‌زانێ به‌ هه‌موو شتێكی نهێنی و نادیار له‌ هاتنی ڕۆژی دوایی و شاراوه‌ی هه‌موو بونه‌وه‌ران، كێشانه‌ی بچووكترین مێروله‌یه‌ له‌ ئاسمانه‌كان و زه‌وی‌دا و، بچووكترینن له‌ كێشانه‌ی ئه‌و مێرووله‌یه‌ و گه‌وره‌تریش له‌ په‌روه‌ردگاری من وون نابێ، مه‌گه‌ر هه‌موویان له‌ نامه‌یه‌كی ئاشكرادا كه‌ له‌وحه‌ل مه‌حفوزه‌ تۆماركراوه‌، هه‌موو شتێ لای ئه‌و نهێنی نی‌یه‌.

﴿ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ ڕۆژی دوایی دێت بۆلاتان، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگاری من پاداشتی چاكه‌ی كه‌سانێكی ئه‌وتۆ بداته‌وه‌ باوه‌ڕیان هێناوه‌ و، كرده‌وه‌ چاكه‌كانیان كردوه‌، ئه‌و كه‌سانه‌ بۆیان هه‌یه‌ لێ خۆشبوون له‌ هه‌ڵه‌كانیان و، خوارده‌مه‌نی به‌رێز به‌بێ ماندووبوون.

﴿ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾ وه‌ كه‌سانێكی ئه‌و تۆ خۆیان ماندوو ئه‌كه‌ن بۆ پوچكردنه‌وه‌ی ئایه‌ته‌كانی قورئانی ئێمه‌ ڕه‌وانه‌مان كردوه‌ بۆلای فروستاده‌ی ئێمه‌، پێشبركێ ئه‌كه‌ن بۆ ڕزگاربوون و گومانیان وایه‌ له‌ ده‌ستی ئێمه‌ ده‌رئه‌چن، ئه‌و كه‌سانه‌ بۆیان هه‌یه‌ سزایه‌ له‌ خراپترین سزا و ئازارده‌رترین سزاله‌ هه‌ردوو جیهاندا، چونكه‌ گومانیان وایه‌ زیندوو بوونه‌وه‌ و سزا نی‌یه‌.

﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ خاوەنی زانیارین لە هاوڕێکانی تۆ و وێنەی ئەوان لە خاوەن نامە ڕاستەکان ئەزانن بە شتێکی ئەوتۆ نێردراوە بۆلای تۆ لە لایەن پەروەردگاری خۆتەوە هەر ئەوەی نێردراوە بۆلای تۆ ڕاستە.

﴿ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴾ وە هەر ئەوەی نێردراوە بۆلای تۆ ئادەمیزاد ئەگەیەنێ بۆلای ئایینی خوای زۆر بەدەستەلات، تۆڵەسێنەرە لە کەسێ دژی پێغەمەری من بێ، خوایە هەموو سوپاسێ لەسەرچاکەکانی ئەو ئەبێ بکرێ، ئەم ئایەتە لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَى رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و بەگاڵتەپێکردنەوە هەندێکیان بە هەندێ تریان ئەڵێن: ئایا ئێمە شارەزایی ئێوە بکەینلەسەر پیاوێ گفتوگۆی سەیر و سەمەرە ئەکا هەواڵ بدا بە ئێوە: هەرکاتێ ئێوە مردن و ئەندامەکانتان هەموویان پارچە پارچە کران و ڕزان و بوون بە تۆز و چوون بە ئاسماندا. بەڕاستی ئێوە زیندوو ئەکرێنەوە سەر لەنوێ و ئەبنەوە بە بوونەوەرێکی تازە بە وێنەی ئێستا.

﴿ أَفْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِ جِنَّةٌ ﴾ ئەو پیاوە یا بوختان و درۆ درووست ئەکا و ئەیدا بەسەر خوادا یا شێتە و بەبێ بنچینە دێت بەدەمیدا ئەو بوختانە ئەکا.

﴿ بَلِ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ فِي الْعَذَابِ وَالضَّلَالِ الْبَعِيدِ ﴾ بەڵکو ئەو کەسانە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناکەن و لە ناو سزای ڕۆژی دواییدان و، لە ناو ڕێگەی گومڕایی دان زۆر

دوورن لە ڕاستی لە جیهاندا کە ئەڵێن: موحەمەد یا بوختان ئەکا یا شێتە. ئەوان خۆیان باش موحەمەد ئەناسن، ئەزانن دوورە لەوانەی ئەوان ئەیڵێن.

﴿ أَفَلَمْ يَرَوْا إِلَى مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴾ ئایا دوایی ئەو کەسانەی باوە‌ڕیان بە زیندوو بوونەوەی دوای مردن نی‌یە، بۆ نەیان ڕوانیوە بۆلای شتێ چواردەوری ئەوانێ داوە لە نیشانەکانی توانای خوا لە ئاسمان و لە زەوی‌دا و، واز لە خراپە بهێنن و شەرم بیانگرێ بەهۆی ئەو شتانە لەسەریانەوەیە و لە ژێریانە.

﴿ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ ﴾ ئەگەر ئێمە ئارەزۆ بکەین زەوی ئەبەینە خوارەوە بەوانەوە، یا ئێمە پارچەیە لە ئاسمانەوە ئەخەین بەسەر یانا و بنەبڕ ئەبن و لەناو ئەچن.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴾ بەڕاستی هەیە لەبیرکردنەوە و تەماشاکردنی نیشانەکانی توانای خوا بەڵگەی ئاشکرا و گەورە بۆ بەندەیە بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری خۆی و بە نیازی پاکە و بپەرستێ.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلًا يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە لە لایەن خۆمانەوە ڕێزێکی زۆر گەورەمان بەخشیوە بە داوود: لە پێغەمەرایەتی و نامەی زەبور، پاشایەتی، دەنگی زۆر خۆش. ئێمە ووتمان بە کێوەکان و بەباڵندەکان: ئێوە لەگەڵ داوودا پاك و خاوێنی دەرببڕن بۆ خوا و، پاکی‌یەکەی خوای لەگەڵدا بلێنەوە ئێمە ئاسنمان بۆ داوود نەرم کرد بەبێ ئاگر و چەکوش بەدەستی خۆی بەکاری ئەهێنا.

داوود پیاوێکی پیاوێکی ئازا و دلێر و زیرەك و ژیر و دادپەروەر، دەنگ و ئاواز خۆش، بەجۆرێ هەموو گیانداران گوێیان لە دەنگی داوود بووایە ئەوەستان، کێوەکان دەنگەکەیان دووپات ئەکردەوە، زۆربەی زۆری شارەکانی شام و عومانی داگیرکرد، بەهێزترینی پادشای ئەو سەردەمە بوو، خوای گەورە ئاسنی بۆ نەرم کردبوو، کراس و تاس کڵاو خەنجەر و شمشێری قەشەنگی درووست ئەکرد، بە ئارەقی ناوچەوانی خۆی ئەژیا، دارایی بەیتولمالی نەخوارد، لەخوا ترس بوو.

﴿ أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ ئێمە فەرماندا بە داوود کە تۆ زرێی پان و فراوان دروست بکەی و بیانفرۆشی و خۆت و خێزانەکەتی پێ بەخێو بکەی و بیشی‌بەخشی لە ڕێگەی ڕەزامەندی خوادا و، تۆ بەرێك و پێکی زرێکان بچنە و بازەنەکانیان شیاوی یەك بن، بزمارەکانیان نە ئەوەندە بچووك بن بشکێن، نە ئەوەندە گەورە بن پارچەکانیان بپچڕێنن. تۆ و خێزانەکانت و پەیڕەوانت کاری چاك بکەن . بەڕاستی خوا بەشتێ ئەزانێ ئێوە بیکەن لە چاك و خراپ.

داوود کاتەکانی خۆی بەش کردبوو بەسێ بەش: بەشێکی بۆ پەرستنی خوا. بەشێکی بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی کاری ئادەمیزاد. کاتێکیش بۆ ژیانی خۆی و خێزانی و پشوودانی.

﴿ وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ﴾ وە ئێمە بامان ڕام کرد بۆ سولەیمان بەهۆی توانای خۆمان، تاقی بەیانی هەتا نیوەڕۆ بە ئەندازەی ڕۆیشتنی ئاسایی مانگە ڕێگەیەکی ئەبڕی، تاقی ئێوارە لە نیوەڕۆوە هەتا مەغریب مانگە ڕێیەکی ئەبڕی لەیەك ڕۆژدا، خۆی و پێویستی خۆی هەڵئەگرت لە هەمو شتێ.

﴿ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ ﴾ وە ئێمە توانەوەی سەرچاوەی ئاسن و پۆڵا و مسمان فێری سولەیمان کرد، بە وێنەی ئاو ئەڕۆیشتن بە ڕووی زەویدا، هەتا دروست بکا هەرشتێ ئارەزۆی بکا.

﴿ وَمِنَ الْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِ ﴾ و ئێمە هەندێ لە جنۆکەکانمان ڕام کردبو بۆ سولەیمان کەسێ کار بکا لای سولەیمان بەهۆی دەستووری پەروەردگاری خۆیەوە کە کۆشکێکی بۆ درووست بکەن.

﴿ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴾ وە هەرکەسێ لەو جنۆکانە لابدەن لەو کارەی ئێمە فەرمانمان پێداوە ئێمە بەو کەسە ئەچێژین سزایە لە ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ كَالْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَاتٍ ﴾ ئەو جنۆکانە درووست بکەن بۆ سولەیمان هەرشتێ ئارەزۆی بکا لە کۆشکی نایابی پەرستن و، لە پەیکەری جوان لە مس و شوشە و مەرمەڕ لە شێوەی شێر و جگەی شێر. پەیکەر دروستکردن لە یاسای ئەواندا قەدەغە نەبوو، دوایی کورسییەکیان دروست کرد بۆ سولەیمان پێچکەکانی پێشەوە دوو شێربوون، لەسەریەوە دوو هەڵۆ باڵیان ڕاکێشابوو، بۆیشیان دروستکرد چەندین تەشتی گەورە وەك حەوزی ئاو، بۆیشیان دروستکرد چەندین دیزەی نەجوولاو لە جێگەی خۆیانا لەبەر گەورەیی و قورسییان بۆ دروستکردنی چێشت و ئامادەکردنی خواردەمەنی و، سەرەڕای ئەوانە کاسە و کەوچك و شتی نایابی لە مەنجەڵ و قاپ و قاچاغ.

﴿ اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾ ئێمە ووتمان: ئەی خێزانی داوود: ئێوە سوپاسی خوا بکەن لە سەر چاکەکانی خوا بۆتان و، سوپاس کەری خوا کەمن لە بەندەکانی من، بەنیازی پاکەوە سوپاسم بکەن گێڕراوەتەوە داوود دەستی بە دروستکردنی بەیتولموقەدەس لە جێگەی کەپری موسادا، دوایی داوود کۆچی دوایی کرد بەر لە تەواو کردنی، ڕای سپاردبوو بە سولەیمان تەواوی بکا، دوایی سولەیما فەرمانی دا بە جنۆکەکان بەتەواوکردنی بەیتولموقەدەس، بەر لە مردنی بەساڵێ داوای لە خوای مەزن کردبو جنۆکەکان بە مردنی نەزانن هەتا تەواوی ئەکەن و، بۆ ئادەمیزاد ڕوون ببێتەوە کە جنۆکە ئەوەی نهێنی بێ نایزانن، وەك خۆیان ئەیان ووت، تەمەنی سولەیمان (٥٣) ساڵ بوە، لە تەمەنی (١٣) ساڵیدا بوە بە پاشا،(٤٠) ساڵ پاشایەتی کردوە، دولیی چوار ساڵی پاشایەتی فەرمانی داوە بەدرووستکردنی بەیتولموقەدەس. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوانەی پێشوو خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ ﴾ دوایی کاتێ ئێمە فەرمانمان دا بەسەر سولەیماندا بە مردنی و، فەرمانی مردنیمان جێبەجێ کرد، سولەیمان بەردەوامبو لەسەر ڕاوەستان و، خۆیدا بوو بەسەر داردەستەکەی خۆیا و، جنۆکەکانیش بەردەوامبوون لەسەر بەجێهێنانی ئەو کارە گرانانە داوایان لێکرابوویانکەن و هەستیان بە مردنی سولەیمان نەکردبو، هیچ شتێ جنۆکەکانی ئاگادار نەکرد لەسەر مردنی سولەیمان مەگەر دارەخۆرەکە داردەستەکەی سولەیمانی خوارد و سولەیمان کەوت بەدەمدا.

﴿ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾ دوایی کاتێ سولەیمان دوای تەنکبونی داردەستەکە کەوت بەدەما، ڕوون بویەوە کە ئەگەر جنۆکەکان شتێ نهێنیان بزانیایە ئەیانزانی سولەیمان مردوە، بەردەوام نەئەبون لەسەرکردنی ئەو کارە گرانانە ئازاری ئەوانی ئەدا.

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ

فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ ۖ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ ۖ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ ۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾

یەکەمین پاشای یەمەن ناوی عەبدوشەمسی کوڕێ یەشجوب کوڕێ یەعروب کوڕی قەحنات، نازناوی سەبەئە، چونکە ئادەمیزادی دیل ئەکردن، لە کاتی ئەوا یەمەن شارستانی و پێش کەوتنی زۆری بە خۆیە پەیداکردبوو، خاك و زەوی یەمەن بە پیت و سامانی زۆری تێدا بوو، بەرلەوەی بەنداوی مەئرەب دروست بکرێ ساڵانە لە کاتی بارینی باراندا لافاو و کشت و کاڵی لە ناوئەبردن و خانوەکانیانی ئەڕوخاند، دوایی پاشاکەیان زانایانی ئەو کاتەی کۆکردەوە، لەبارەی ئەو لافاوە ڕاوێژی لەگەڵ کردن، بیروڕایان هاتە سەر ئەوەی لەنێوان دوو کێودا بەنداوێ دروست بکەن و، پاشا ڕاوێژەکەی پەسەند کردن، بەنداوی مەئرەبیان درووست کرد؛ بۆ ئەوەی ئاوی تێدا کۆبکەنەوە و بەکاری بهێنن بۆ پێویستی خۆیان و، بەجۆرێکی ئەندازیاری

نەخشەیان بۆ کێشا بە بەرد و بەقیر بەنداوەکەیان درووستکرد، ناونرا بەنداوی شاری مەئرەب، دوای ڕۆیشتنی چەند ساڵێ بەنداوەکە ڕووخا؛ چونکە چاودێریان نەکرد و، ئاوەکە باخ و بێستان و خانوەکانی لەناوبردن و، دانیشتوان کۆچیان کردو، بڵاوبوونەوە بە ناو زۆربەی جێگەکاندا. خوای مەزن لەو بارەوە و بۆ ئەو ڕووداوە ئەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾ بە ڕاستی بۆ هۆزی سەبەأ هەبوو لە جێگەی دانیشتنی خۆیانا بەڵگەیەکی زۆر ئاشکراً لەسەر توانای خوای خاوەن دەسەڵات: ئەو بەڵگەیە بریتی بو لە دوو کۆمەڵ باخ و بێستانی پڕ لە میوە و دانەوێڵە: کۆمەڵێکیان لەلای ڕاستی بەنداوی مەئرەبەوە بوون، تاقمێ تر لەو باخ و بێستانانە لەلای چەپیەوە بوون، هەردووولایان ئەوەندە نزیکتربوون لە یەکتری، وەك یەك باخ و بێستان وابوون. لەناوخۆیانا بەیەکتریان ئەووت:

﴿ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ ﴾ ئێوە بخۆن لە میوەی ئەو باخانەی ئەوتۆ پەروەردگاری ئێوە،بە ئێوەی بەخشیوە و، ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەریان.

﴿ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴾ ئەم شارە شارێکی چاك و هەوایێکی خاوێنی هەیە و، زەویەکی بە پیتە و، پەروەردگاری ئێوە لێخۆشبوونی بۆ ئێوە زۆرە ئەگەر سوپاسی چاکەکانی بکەن و داوای لێبووردنی لێبکەن، ئەو شارە ئەوەندە پاکبو، مێشولە و کێچ و مار و دوپشکی نەبو ئیتر چۆن سوپاسی خوا ناکەن.

﴿ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ ﴾ دوایی ئەو تاقمە وازیان لە سوپاسی خوا هێنا و، دارایی خۆیانیان لە بێفەرمانی خوادا بەکارهێنا و، وازیان لە خوا پەرستی هێنا و، دوایی ئێمە لافاوێکی سەختمان لەو ئاوەی لە بەنداوەکەدابو و لە بارانی تریش ناردە سەریان و، بنەوانەکەمان ڕوخاند، خانوەکانیانی ڕووخاند، زەوی و زاری هەمووی لەناوبردن.

﴿ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴾ وە ئێمە ئەو دو باخ و بێستانەی ئەوان جۆرەها میوە و خواردەمەنی چاکی تێدابوو گۆڕیمان بۆ دوو باخی وا خاوەنی خواردەمەنیە بون لە میوەی تاڵی درەختی ئیرات و درەختی بیو، بەشێکی کەم لە درەختی مۆرد، مەگەر گیاندارێکی برسی یا ئادەمیزادێ هیچ شتێ تریان دەست نەکەوێ بیخۆن، ئەو کاتە بە ناچاری ئەیخۆن.

﴿ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴾ بەهۆی ئەو شتەوە بو، ئەوان سوپاسی ئەو چاکانەی خوایان نەکردو، بێفەرمانی خوایان کردو، ئێمە پاداشتی هیچ کەسێ نادەینەوە بەو جۆرە پاداشتە مەگەر کەسێ سوپاسی خوا نەکا و بێباوەڕبێ.

﴿ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً ﴾ وە ئێمە دروستمان کردبو لە نێوان دانیشتووانی یەمەن و لە نێوان ئەو گوندانەی ئەوتۆ ئێمە پیت و فەڕمان دانا بو لە ناویانا، بە وێنەی شام و ئوردون و فەلەستین - چەند گوندێ بەچاو ئەبینران و ئەوەندە نزیکبوون لە یەکتری لە گوندێکەوە ئەو گوندەکەی تر ئەبینرا بە ئاشکرایی و، هیچ شتێ ڕێگەی لە بینینیان نەگرتبوو.

﴿ وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴾ وە ئێمە لەبەر سودی دانیشتووانی یەمەن چەندین گوندمان دروستکرد لەسەر ئەندازەیەکی دیاریکراو لە نێوانیانا بۆ ڕۆیشتن، ئەوەندە نزیکبوون لەیەکتری ئەگەر بەیانی کەسێ بڕۆیشتایە بۆ شام نیوەڕۆ لە گوندێ پشووی ئەدا و، کاتێ دەربچوایە ئێوارە ئەگەیشتە گوندێ تر و شەوێ پشووی ئەدا و ئەخەوت، هەروەها بەوجۆرە هەتا ئەگەیشتە شام بە بێ ئاو و خواردەمەنی هەڵگرتن. ئێمە بەوانمان ووت: ئێوە بڕۆن بەناو ئەو گوندانەدا ئەگەر ئارەزۆتان کرد چەند شەو و ڕۆژێ بەبێ ئەوەی ئێوە بترسن لە هیچ خراپە و ئازارێ و برسی و تینوتان نەبێ، هەرچەندە ماوەی ڕۆیشتنەکەتان دوورودرێژبێ.

﴿ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ﴾ دوایی خاوەن سامانەکانی یەمەن ووتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ ماوەی ڕۆیشتنی ئێمە بۆ شام دوور بخەرەوە و نێوانیان بکە بە دەشتێکی چۆڵی بێئاو و خواردەمەنی، ئەو سامانداراانە کە تەماشایان کرد ئەوان جیاوازییان نییە لەگەڵ هەژاراندا هەردوولایان بەبێ ترس هاتوچۆ ئەکەن، داوایان لە خوا کرد ئەو کارانە بکا بۆ ئەوەی ئەوان دەست درێژی بکەنە سەر هەژاران، بەخۆیان و پاسەوان و بەندەکانیانەوە بە سواری چاوەڕێ بڕۆن بۆ شام، بە نان و ئاوو خواردەمەنییەوە، ئەو سامانداراانە ستەمیان لە خۆیان کرد و یاخی بوون و سوپاسی خوایان نەکرد.

﴿ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ ﴾ دوایی ئێمە ئەوانمان گێڕا بە جۆرێ ئادەمیزادی دوای خۆیان بیانکەن بە جێگەی گفتوگۆ بۆ خۆیان و سەریان سوڕبمێنێ لە کردەوەیان و تەمێ وەربگرن و ئێمە ئەوانمان پارچە پارچەکرد و پەراگەندەی جێگەکانی ترمان کردن بە هەژاری و بە هەموو جۆرە تێشکانێ، دوای ڕووخانی بنەوانی مەئرەب و پەیوەندییان بەیەکەوە نەما، هەندێکیان چون بۆ یەسریب و ئەوانی تریشیان بۆ شام و جێگەکانی تر.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بەڕاستی هەیە لە پەراگەندەیی دانیشتوانی یەمەن بە ڕوی زەویدا چەندین بەڵگە و تەمێ کردن بۆ هەموو کەسێ ئارام بگرێ لەسەر ئازار و سەختیدا و خۆیان بپارێزن لە گوناهو سوپاسی خوا بکەن لە کاتی خۆشی و هەرزانیدا لەسەر چاکەکانی خوا.

بۆ زانین: لە تەفسیری مەراغیدا هاتووە کە دانیشتووانی ئەم سەردەمە تازەیە گومانیان هەبو لەبارەی بوونی بنەوانی مەئرەب. هەتا کاتێ زانای خۆرهەڵات ناسی فەڕەنسا، بەناوی (ارنو) لە ساڵی (١٨٤٣) زایینی چو بۆلای جێگەی بنەوانی مەئرەب و نیشانەکانی دەرخست و نەخشەی بۆکێشا و شوێنەکەی دیاریکرد، لە گۆڤاری فەڕەنسادا لە ساڵی (١٨٧٤)ی زاییندا بڵاوی کردەوە.

﴿ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە بەڕاستی شەیتان داینا لەسەر دانیشتوانی یەمەن گومانی خۆی و، ئامادەی کردن بۆ لادان لە خواپەرستی، کاتێ لە خزمەت خوادا ووتی: (من ئادەمیزاد لا ئەدەم لە پەرستنی تۆ مەگەر بەندە پاکەکانی تۆ لەوان نەبێ) دوایی ئەوان دوای شەیتان کەوتن مەگەر تاقمێ لەوان نەبێ دوای نەکەوتن لە باوەڕداران.

﴿ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴾ وە شەیتان هیچ دەستەلاتێکی نەبو بـە سـەریانا و، زۆری لێ نـەکردن لـەسـەر باوەڕنەهێنانیان. بەلام ئێمە ئەوانمان تاقی کردەوە بە خۆشی و ناخۆشی؛ لەبەر ئەوەی ئێمـە دەری بخەین بۆ ئادەمیزاد کەسێ باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ئـەهێنێ و، جوێـی بکەیەنـەوە لـە کەسێ لـە گوماندایە بۆ ڕۆژی دوایی و، پەروەردگاری تۆ ئاگای لە هەمو شتێ هەیـە، پاداشـتی بـاوەڕدار ئەداتەوە بە بەهەشت، سزای ئەوانە ئەداتەوە گومانیان لە بوونی ڕۆژی دوایی‌دا هەیە بە ئاگری دۆزەخ.

قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ حَتَّىٰ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِيَ الَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِ شُرَكَاءَ كَلَّا بَلْ هُوَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَأْخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾

دانیشتووانی مەکە فریشتە و بتەکانیان ئەپەرست خوای مەزن، ئەو کارەی لێ قەدەغـەکردن و ئەوان وازیان نەهێنا لـەو کارەی خۆیان فەرمووی بە پێغەمەر:

﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ ﴾ تۆ بلێ بەوان: ئێوە بانگی کەسانێکی ئەوتۆ بکەن ئێوە گومان ئەبەن خوان لـە جگەی خوا، ئـەو کەسانە خاوەنی ئەندازەی کێشانەی بچوکترین مێرولـەنین لـە ناو ئاسمانەکان و زەوی‌دا. خـاوەنی سود نین نەبۆ خۆیان نە بۆ جگەی خۆیان.

﴿ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴾ وە بـۆ ئـەو بـت پەرستانە نیـە لـە نـاو ئاسمانەکان و زەوی‌دا هیچ جۆرە هاوبەشێ بۆ خـوا و، هیـچ یـاریدەدەر و پشـتیوانێ بـۆ ئـەوان کاروباریان هەڵسورێنێ لـە جیهاندا.

﴿ وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ ﴾ وە پاڕانەوەی ئەو خوایانەی ئێوەلای خوا سودی نی‌یە، پەرستنی ئێوە بۆ ئەوان بێ‌سوودە، پاڕانەوەی لای خوا بۆ کەسێکە خوا دەستوری‌بدا بـەو کەسانە بپاڕێنەوە، ئەو خوایانەی ئێوە بێ‌نرخترین شتێکن لـە بۆ پاڕانەوە. پێغەمەران و فریشـتە و پیاوچاکان چاوەڕوان ئەکەن خوا دەستووریان بداتێ بپاڕێنەوە و، خوا ڕێگەی پاڕانەوە بەڕەڵابکا. بەڵام ئەوان لـە خوا ئەترسن:

﴿ حَتَّىٰ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ﴾ هەتا کاتێ خوا ترس لائەبا لـە دڵـی ئـەو کەسانە ئەپاڕێنەوە و لـە دڵی ئەو کەسانە پاڕانەوەیان بۆ ئەکرێ و، ترسیان نامێنـێ و، دەسـتوور ئەدا بپاڕێنەوە، ئەو کاتە ئەو کەسانەی پێویستیان هەیە بۆیان بپاڕێنەوە ئەڵێن: پەروەردگاری ئێوە چ شتێکی فەرموە بۆ پاڕانەوە.

﴿ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴾ ئەو کەسانەی ڕاستەوخۆ دەستووریان پـێ‌دراوە بپاڕێنـەوە ئەڵێن: خوای مەزن فەرمودەی ڕاستی خۆی فەرموە و، کە پاڕانەوە بکـرێ بـۆ ئـەو کەسـانەی شایستەن پاڕانەوەیان بۆ بکرێ و، خوا خاوەنی گەورەیی و بەرزی بێ وێنەیە، کەس ناتوانێ هیچ شتێ بکا بەبێ دەستووری ئەو لـە ڕۆژی دوایی‌دا.

﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ تۆ بلێ بەو بتپەرستانە هەتا بۆیان دەربکـەوێ خـاوەنی هیـچ شـتێ نـین: چ کەسێکە خـواردن

ئەدا بەڕاستی بەئێوە لە ئاسمانەکانەوە بە بارینی باران و گەرمایی خۆر و ڕووناکی مانگ و، لە زەویدا بە ئاو و دانەوێڵە، ئەگەر نەیان توانی وولامی تۆ بدەنەوە؛ چونکە ناتوانن بڵێن: خواکانی ئێمە ئەیکەن تۆ بڵێ لە وولامدا هەر خوایە بە تەنها ئەو شتانە بکا بە ڕاستی یا ئێمەی باوەڕدار یا ئێوەی بت پەرست لەسەر ڕانووماین یا لەسەر گومڕایین، زۆر ڕوونە ئێوە لەسەر ڕێگەی ڕاست نین؛ چونکە ئێوە ناتوانن بڵێن : خواکانمان خواردن ئەدەن بە ئێمە.

﴿ قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ تۆ بڵێ: ئێوەی بت پەرست پرسیارتان لێناکرێ لە شتێ ئێمە کردوومانە لە تاوان و، ئێمەی خوا پەرست پرسیارمان لێناکرێ لە شتێ ئێوە بیکەن، دوایی من بانگی ئێوە بۆ لای چاکە ئەکەم، بێ باوەڕی ئێوە زیان بەمن ناگەیەنێ.

﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ ﴾ تۆ بڵێ پەروەردگاری ئێمە لە ڕۆژی دواییدا ئێمە کۆ ئەکاتەوە لە نێوان خۆمانا، لە پاشا خوا فەرمان لە نێوانمانا بە جۆرێکی دادپەروەری و بەبێ لایەنی ئەدا.

دوای دەرکەوتنی کاری ئێمە ، ئەوەی ڕاستی کردبێ ئەچێتە بەهەشت، ئەو کەسەی خراپەی کردبێ ئەچێتە دۆزەخ و، هەر خوا فەرمان بدا بە دادپەروەری، ئەزانێ بەوەی پێویستە و شایانە بکرێ.

﴿ قُلْ أَرُونِيَ الَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِ شُرَكَاءَ كَلَّا بَلْ هُوَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ تۆ بڵێ: ئێوە نیشانی منی بدەن کەسانێکی ئەوتۆ ئەتان کردن بە هاوبەشی خوا لە پەرستندا و، ئەتانکردن بەخوای خۆتان، هەتا من بزانم ئێوە چۆن ئەو پایە بەرزەتان داونەتێ، ئایا ئەو خوایانەی ئێوە هاوبەشی خوان لە درووستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، ئەوانە هاوبەشی خوا نین، بەڵکو ئەبێ واز بهێنن لەو کارە، هەر خوایە خاوەنی دەسەڵات و شایستەیە بۆ پەرستن، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی دائەنێ و ئەیانبا بەڕێوە.

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وە ئێمە تۆمان بەتایبەتی ڕەوانە نەکردوە بۆلای تاقمی خزمانی خۆت، بەڵکو ئێمە تۆمان ڕەوانەکردوە بۆلای هەموو ئادەمیزاد بەعەرەب و جگەی عەرەبەوە، بەڕەش و سور و جگەی ئەوانیشەوە، موژدە ئەدا بە باوەڕداران بەبەهەشت لە ڕۆژی دواییدا، بێباوەڕان ئەترسێنێ لە سزای دۆزەخ و، بەڵام زۆربەی ئادەمیزاد بەو ڕاستییە نازانن.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ وە ئەوەندە نەزانن ئەڵێن: چ کاتێ ئەو بەڵێنەی ئێوە دێتە دی کە ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن پەیدا ئەبێ.

﴿ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَأْخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴾ تۆ بڵێ: بۆ ئێوە بەڵێندانی ڕۆژێ کە ڕۆژی دواییە، کاتێ ئەو ڕۆژە یەخەی گرت بە ئێوە لەناکاودا پێش کەوتن بۆ ئێوە کەمترین کات و، دواکەوتنی ئێوە بۆلای ئەو ڕۆژە نییە ونابێ و، مۆڵەتی دواکەوتن و پێشکەوتنتان نادرێ.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ بِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٣﴾

**﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَن نُّؤْمِنَ بِهَذَا الْقُرْآنِ وَلَا بِالَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و ئەڵێن: ئێمە باوەڕ بەم قورئانە هاتوە بۆ موحەممەد و، بەو نامانەی تر ناهێنین بەر لەم قورئانە هاتونەتە خوارەوە، وەك تەورات بۆ موسا وئینجیل بۆ عیسا و، کە ئەڵێن: لە نامەکانی ئێمە باسی شێوەی موحەممەد کراوە و، باوەڕیشمان بە ڕۆژی دوایی نیەیە.**

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبو: بێباوەڕانی مەکە نوێنەری خۆیان نارد بۆلای خاوەن نامەکان پرسیاریان لێبکەن لە بارەی پێغەمەرایەتی موحەممەدەوە. ئەوان وتیان: بەڕاستی ئێمە لە ناو نامەکانی خۆمانا باسی شێوەی موحەممەد کراوە، دوایی بت پەرستان توڕەبوون و وتیان، باوەڕمان بەم قورئانە و بەنامەکانی پێشویشمان نیە.**

**﴿ وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ الْقَوْلَ ﴾ وە ئەگەر تۆ ستەمکاران ئەبینی لە خزمەت پەروەردگاری خۆیانا بەندکراون بۆ پرسیارکردن لەوان لەناو چ ئازارێکدان، ئەو کاتە هەندێکیان ئەچن بۆلای هەندێ تر لە خۆیان بەم جۆرە ئەکەونە ووت وویژ لەگەڵ یەکتری:**

﴿ يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لَوْلَا أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئەچەوسێنرانەوە و بەبێدەستەلاٌت دانرابون ئەڵێن بە کەسانێ داوای گەورەییان ئەکرد ئەگەر ئێوە ڕێگەتان لە ئێمە نەگرتایەبۆ باوەڕهێنان بەڕاستی ئێمە لە جیهاندا باوەڕمان ئەهێنا بە خوا و پێغەمەرانی خوا.

﴿ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَدَدْنَاكُمْ عَنِ الْهُدَى بَعْدَ إِذْ جَاءَكُم بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴾ ئەو کەسانەی سەرۆکبون و خۆیان بە گەورە دانابو ئەڵێن بەو کەسانەی بچوك و بێدەستەلاٌت بون: ئایا ئێمە ئێوەمان لادا ئەوەی باوەڕبهێنن لە دوای ئەوەی هاتبو بۆلای ئێوە پێغەمەرێ ڕانموی ئێوەی کرد بۆلای ڕێگەی ڕاست. بەڵکو ئێوە تاوانبارن و، دوای بیروباوەڕی باوباپیرانمان کەوتن و، ئەو بتانە ئەپەرستن لە جگەی خوا؟

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ لە جیهاندا بێچارە و بێنرخبوون و ژێردەستەبون ئەڵێن بە کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان بەگەورە دائەنا: بەڵکو فێڵ و فریودانی شەو ورۆژی ئێوە بو، ئێمەوازمان هێنا لە باوەڕهێنان کاتێ ئێوە فەرمانتان ئەدا بە ئێمە کە ئێمە باوەڕ بەخوا نەهێنین و، ئەتان ووت: موحەمەد جادوگەر و درۆزنە.

﴿ وَنَجْعَلَ لَهُ أَندَادًا ﴾ وە ئێوە فەرمانتان ئەدا بە ئێمە هەتا ئێمە چەندین هاوبەش دابنێین بۆ خوا و، باوەڕ بە خواو پێغەمەر و ڕۆژی دوایی نەهێنین.

﴿ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ﴾ وە هەردوو لا لە ژێر دەستە و لەسەرۆکەکانیان پەشیمان بوونەوەی خۆیان دەرئەبڕن کاتێ ئەوان سزای ئاگری دۆزەخ ئەبینن. هەندێ لە زانایان مانای ئەو ڕستانەیان بەم جۆرە کردوە: (لە دڵی خۆیانا کاتێ سزای ئاگری دۆزەخ ئەبینن، پەشیمان بوونەوە پەنهان ئەدەن).

﴿ وَجَعَلْنَا الْأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ و ئێمە زەنجیر ئەکەینە ناو گەردن و ملی ئەو کەسانە باوەڕیان نەهێناوە بە خوا و ئایینی خوا، بەو زنجیرە دەستییان ئەبەستین بە ملیانەوە. ئەو بێباوەڕانە بەگەورە و بچووکیانەوە پاداشتیان نادرێتەوە مەگەر بەشتێ ئەیکەن لە جیهاندا.

وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَـٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ

لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ۚ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴾ وە ئێمە هیچ پێغەمەرێکمان ڕەوانە نەکردوە لەناو هیچ گوندێکا دانیشتوانی ئەو گوندە بترسێنێ لەبێ فەرمانی خوا و ئاگری دۆزەخ مەگەر کار بەدەستە خۆش گوزەرانەکەیان و خەڵەتا و بەڕابواردنی جیهان ئەیانووت: ئێمە باوەڕ بەو شتە نابەرین ئێوە بۆی نێرراون و، گاڵتەیان بەو کەسانە ئەکرد وێنەی ئەوان نەبون.

﴿ وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ وە ئەیان ووت: دارایی و منالّمان زۆرترە لەو هەژارانە باوەڕیان بە ئێوە هێناوە، ئەگەر ئێمە لای خوا چاکتر لەوان نەبووینایە لە جیهاندا سامانی بە ئێمە نەئەدا و، ئێمە سزامان نادرێ ئەگەر ڕۆژی دوایی ببێ، چونکە ئەو کەسەی ڕێزی ئێمەی گرتوە لە جیهاندا بێ‌نرخمان ناکا لە پاشەڕۆژدا، ئەگەر ئێمەی خۆش نەویستایە و ڕێزمان نەبوایە بۆلای ئەو دارایی و منالّی زۆری نەئەدانێ.

﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ تۆ بڵێ: بە ڕاستی پەروەردگاری من ڕۆزی و سامانی زۆر و فراوان ئەبەخشێ بەهەرکەسێ ئارەزۆی بکا و، کەم ئەبەخشێ بەهەرکەسێ ئارەزۆ بکا. دارایی و ماڵی زۆر پەیوەندی بە باوەڕ و بێباوەڕیوە نیيە، وائەبێ باوەڕداران هەژار و بێدەرامەتن و، وایش ئەبێ سامانی زۆریان ئەبێ و، بەڵام زۆرترینی ئادەمیزاد نازانن بە ویستی خوای مەزن، گومان ئەبەن دارایی زۆر هۆی ڕێزی خاوەنەکەیەتی و، کەم دەرامەتی و بێسامانی هۆی بێنرخیە. بێگومان سامانداری وا هەیە هەموو مرۆڤێکی ژیر بێزی لێ ئەکاتەوە و، پێی شەرمە ببێ بەو کەسە و، خاوەنی ئەو سامانەبێ، هەژاری لای ئەو بەنرخترە.

﴿ وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُم بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَى إِلَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ لَهُمْ جَزَاء الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ ﴾ وە دارایی و ماڵی ئێوە شتێکی ئەوتۆ نین ئێوە نزیکی ئێمە بخاتەوە بە نزیکبوونەوەیە سودی ئێوی تێدابێ. بەڵام کەسێ باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێ، دوایی ئەو کەسانە بۆیان هەیە پاداشتی دووچەنانە بەهۆی شتێکەوە کردوویانە لە جیهاندا و، ئەوان لەناو چەندین کۆشکی بەهەشتدان.بەبێ ترس و دوورن لە ئازار و نەخۆشی و خەفەت و هەژاری و سزا و مردن. چاکەو ڕێز لای خوا بە دارایی زۆر و پلەو پایە و بنەماڵە بەراورد ناکرێ، بە کرەوەی چاك و باوەڕ بەراورد ئەکرێ.

﴿ وَالَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُوْلَئِكَ فِي الْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ کۆشش ئەکەن و هەوڵ ئەدەن بۆ پوچ کردنەوەی ئایەتەکانی نامەی ئێمە، بەگومانی خۆی ئەیەوێ ڕێگە لە ئێمە بگرێ لە دەستی ئێمە دەرچێ، ئەو کەسە لە لایەن فریشتەکانەوە ئامادەکراون بۆ ناوسزای دۆزەخ لە پاشەڕۆژدا.

﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴾ تۆ بڵێ: بە ڕاستی خوای پەروەردگاری من ڕۆزی و خواردەمەنی فراوان و زۆر ئەبەخشێ بەهەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ لە بەندەکانی خۆی و، کەم ئەبەخشێ ڕۆزی بۆ کەسێ ئارەزۆ بکا، ئێوە نابەخشن هیچ شتێ لە دارایی خۆتان لە ڕێگەی ڕەزامەندی خوادا، دوایی خوا ئەو شتە دا ئەنێتەوە لە جێگەی خۆیا و، بۆشایی بەخشراوەکەی پڕ ئەکاتەوە لە جیهاندا و، ئەیکا بە توێشوی پاشەڕۆژ بۆتان و، خوا چاکترین کەسێکە هەموو شتێ ببەخشێ بە بەندەکانی خۆی و بەخێویان بکا، ئەگەر کەسێ شتێ ببەخشێ بە ئێوە، ئەوەی ئەویش هەرخوای مەزن بەوی بەخشیوە و، ئەوی کردوە بەهۆی بەخشینی بە ئێوە.

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَؤُلَاء إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە خوای مەزن گەورە و بچووکیان کۆ ئەکاتەوە هەمویان، باوەڕدار و بێباوەڕان بە هەژار و سامانداریانەوە، بە جوان و بە پیریانەوە، لەپاشا خوا ئەفەرموێ بە فریشتەکان: ئایا ئەو بێباوەڕانە ئێوەیان پەرستوە لە جگەی من و، لەبەر چ شتێ ئێوەیان پەرستوە بە تایبەتی و منیان نەپەرستوە.

﴿ قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴾ فریشتەکان ئەڵێن: پاك و دوری بۆ تۆیە ئەی پەروەردگاری ئێمە لەوەی هاوبەشت هەبێ لە پەرستندا، هەرتۆ کەسێکی ئەوتۆی ئێمە بە تەنها بت پەرستین، تۆ گەورە و دۆستی ئێمەی، هیچ دۆستایەتی‌یە لە نێوان ئێمە و ئەواندا نیە و، ئێمە بێزارین لەو پەرستنەی ئەوان. بەڵکو ئەو بت پەرستانە شەیتانیان پەرستوە و، ئەوانیان وا لێ‌کردوە جگەی تۆ بپەرستن، خستویەتی‌یە دەرونیان ئێمە فریشتەین و بمان بپەرستن، زۆر تر لەو بت پەرستانە باوەڕیان بە شەیتان کردوە کە فریشتەکان بپەرستن، هەرچەندە کەمێ لەوان ئەستێرە و ئاگر و شتی تریان پەرستوە لە بتەکان و جگەی بتەکان.

﴿ فَالْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾ دوایی ئەمڕۆ کە هەمو فەرمانێ بەدەستی خوایە هەندێ لە ئێوە خاوەنی هیچ سودێك و هیچ زیانی نیە بۆ هیچ یەکێ لە ئێوە، نە فریشتە و نە ئادەمیزاد و نەجنۆکە خاوەنی سود نین بۆ خۆیان، چ جای بۆ جگەی خۆیان، هەر خوا خاوەنی سود و زیانە بۆ هەموو کەسێ.

﴿ وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ وە ئێمە ئەڵێین بەو کەسانە ستەمیان لە خۆیان کردوە و، گومانیان وابوە بەهەشت و دۆزەخ نی‌یە: ئێوە بچێژن سزای ئاگرێکی ئەوتۆ ئێوە بە درۆتان ئەخستەوە و بڕواتان بەبونی نەبوە.

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَٰذَا إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُكُمْ وَقَالُوا مَا هَٰذَا إِلَّا إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَا آتَيْنَاهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَا أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا مِعْشَارَ مَا آتَيْنَاهُمْ فَكَذَّبُوا رُسُلِي ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾

قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾ قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِي وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾

﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُكُمْ﴾ وە هەرکاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر بت پەرستانی دانیشتوانی مەکە دا ئایەتەکانی ئاشکرای نامەی ئێمە، بت پەرستان ئەیان ووت: ئەو مەحەممەدە هیچ کەسێ نیە مەگەر هەر پیاوێکە ئەیەوێ ئێوە وەرگێڕێ لە شتێ باوباپیری ئێوە ئەیپەرستن و، ئەیەوێ ئایینی ئێوە بگۆڕێ هەتا بتانکا بە بچوکی خۆی.

﴿ وَقَالُوا مَا هَذَا إِلَّا إِفْكٌ مُّفْتَرًى ﴾ وە بت پەرستان ئەڵێن: ئەو نامەیە ئەو پیاوە ئەی خوێنێتەوە بەسەر ئێوەدا هیچ شتێ نیە مەگەر درۆێکی هەڵبەستراوە و بەبوختانەوە ئەیداتە پاڵ خوا.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُمْ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەو ڕاستی‌یە کە قورئانی پیرۆزە کاتێ چوە بۆلایان ئەیان ووت: ئەو قورئانە کە ئەوان نەیانئەتوانی وێنەی دابنێن گومانیان وابە هیچ شتێ نیە مەگەر جادوێکی ئاشکرایە و، بەڵگەیان بەدەستەوە نەبوو.

﴿ وَمَا آتَيْنَاهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا وَمَا أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴾ وە ئێمە نەمان بەخشیوە بەبت پەرستانی مەکە هیچ نامەیێ بخوێننەوە و، بیکەن بەبەڵگە لەسەر ڕاستی هابەشدانیان و، ئێمە نەمان ناردوە بۆلای ئەوان لە پێش تۆ و هیچ پێغەمەرێ ئەوان بترسێنێ لەسەر وازهێنان لەبت پەرستی یا لەسەر ڕاستی هاوبەشدانان، ئیتر ئەو بیروباوەڕە پوچەیان چۆن پێك هێناوە، هەتا بیانویان وەربیگیرێ؟

﴿ وَكَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا مِعْشَارَ مَا آتَيْنَاهُمْ فَكَذَّبُوا رُسُلِي فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش بت پەرستانی مەکەوە بوون لە نەتەوەکانی ڕابوردو بەدرۆ یان ئەخستەوە پێغەمەرەکانی خۆیان وەك چۆن بتپەرستانی مەکە پێغەمەر خۆیان بەدرۆ ئەخەنەوە و،

بیٚباوەڕانی مەکە نەگەیشتوون بەدەیەکی شتیٚ ئیٚمە بەخشیبومان بەگەلانی ڕابوردو لە هیٚزو توانا و تەمەنی دریٚژ و دارایی و منالّی زۆر، دوایی ئـەو گەلانـەی پیٚشـو پیٚغەمـەرەکانی ئیٚمـەیان بـە درۆخستوەتەو، ئیٚمە لەناومان بردن، دوایی بت پەرستانی مەکە بۆ بیرناکەنەوە بە چ جۆریٚ بـوە باوەڕنەهیٚنان بە ئیٚمە و، بە چ شیٚوەیە بوە سزای ئیٚمە بـۆ ئـەو کەسـانەی ڕابـردوون، بنـەبڕمان کردن و دارایی و منالّ نەگەیشتنە فریایان. کەواتە پیٚویستە بیٚباوەڕانی مەکە بترسن خوا توشـی نەمانیان بکا ویٚنەی سزای ئەوانەی پیٚشو.

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُـرَادَى ﴾ تـۆ بلـیٚ بـە دانیشـتوانی مەکـە: بەڕاستی من ئامۆژگاری ئیٚوە ئەکەم بە تاکە شتیٚ کـە ئیٚوە هەلّسـن بـە نیـازی پاکـەوە لەبـەر ڕەزامەندی خوا و، دور بیٚ لە لاسایی و ڕەگەز پەرستی و بیٚباوەڕی و کۆمەلّ کۆمـەلّ و تاکـە تاکە کۆببنەوە و، لـە یەکتری بپرسن بە چاوی دادپەروەری و بیٚلایەنی لـەبارەی پـەیامی مـن و لەبارەی خۆمەوە.

﴿ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَـدِيدٍ ﴾ لـە پاشـا ئیٚوە بیر بکەنەوە بە وردی، بۆتان ڕوون ئەبیٚتەوە و ئەزانن هیچ جۆرە شیٚتیە بەم هـاوڕیٚی ئیٚـوەوە کە موحەمەدە نیە، ڕاست ویٚژ و دەم و داویٚن پاکە، جادوگەر و چیرۆك خویٚن نیە، مەگـەر ئـەو پیٚغەمەرە و ڕەوانەی لای ئیٚوەکراوە بتان ترسیٚنیٚ لەبیٚ فەرمانی خوا، لە پیٚش ئەوەوەیە سزایەکی سەخت لە ڕۆژی دواییدا ئەگەر ئیٚوە باوەڕ نەیەرن توشتان ئەبیٚ.

﴿ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَهُوَ عَلَى كُـلِّ شَـيْءٍ شَـهِيدٌ ﴾ تـۆ بلیٚ: من داوای هیچ کریٚیەکم لە ئیٚوە نەکردوە بە هیچ جۆریٚ لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆم بە ئیٚوە، دوایی ئەو کریٚیە بۆ ئیٚوە بیٚ ئەگەر داوام کردبیٚ ، کریٚی من لـەسـەر هیـچ کەسـیٚ نیـە مەگەر هەر لەسەر خوایە و، خوا ئاگادارە لەسەر هەمو شتیٚ و ئـەزانیٚ بـەنیازی پـاکی مـن بـۆ گەیاندنی پەیامی خوا بە ئادەمیزاد.

﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ تۆ بلیٚ: بە ڕاستی پەروەردگاری من ئەزانیٚ بـەو شتانەی لە بەرچاونین، ئاگاداری هەموو شاراوەیەکە، خوا ڕاستی فڕە ئەداتە دلّی ئەو پیٚغەمەرانە هەلّیان ئەبژیٚری بۆ پیٚغەمەرایەتی، هەموو شتیٚ بەدەستی ئەوە، هەرکەسیٚکی خۆش بویٚ ئەیکا بـە پیٚغەمەر.

﴿ قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَـاطِلُ وَمَـا يُعِيـدُ ﴾ تـۆ بلـیٚ: بەدەرکـەوتنی ئـایینی ئیسـلام و هاتنەخوارەوەی قورئان ڕاستی توانای خوای مەزن و کاری پەك خەری پیٚغەمـەران دەرکـەوت. بنەبڕبو ئەو شتە پوچەی ئەوتۆ ناتوانیٚ هیچ شتیٚ دروست بکا لەنەبونـەو، ناتوانـیٚ دوای مـردن زیندوی بکاتەوە بونەوەران . ئیتر چۆن ئەو شتە پوچانە ئەپەرستن؟

﴿ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَى نَفْسِي وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيـبٌ ﴾ تۆ بلیٚ: ئەگەر لە ڕاستی لام دابیٚ بەهۆی واز هیٚنانم لە ئـایینی باوباپیری خـۆم. بەڕاسـتی ئـەو

لادانە بۆخۆشم ئەگەڕێتەوە و، ئەگەر ڕانومایيم وەرگرتبێ بۆلای ڕاستی، دوایی بەهۆی شتێکەوەبوە پەروەردگاری من بەسروش ناردوویەتیە خوارەوە بۆلای من. بەڕاستی پەروەردگاری من پاڕانەوەی من ئەبینێ، نزیکە بۆ وولاٌمدانەوی من، لە هەموو شتێ نزیکترە لە منەوە.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾

﴿ وَلَوْ تَرَى إِذْ فَزِعُوا فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾ وە ئەگەر تۆ ئەو بێباوەڕانە ببینی ئەڵێن: ئەو پیاوە ئەیەوی ئێوە لابدا لە شتێ باوباپیرانتان ئەیان پەرستن و، ئەیان ووت: قورئان جادوە، شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەر ئەبینن کاتێ ئەوان ترسیان توش ئەبێ لە کاتی زیندوبونەوەیان و دوای مردن، دوایی ڕاکردن بۆ ئەوان نابێ و لە توانای خوا دەرناچن و، ئەوان ئەگیرێن و ئەبرێن بۆلای ئاگرە کە نزیکە لە جێگەی وەستانیان.

﴿ وَقَالُوا آمَنَّا بِهِ وَأَنَّى لَهُمُ التَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴾ بێ باوەڕان کاتێ سزا ئەبینین ئەڵێن: ئێمە باوەڕمان بە موحەمەد هێنا و، بەلاٌم چۆن بە ئاسانی ئەو باوەڕهێنانە لەوان وەرئەگیرێ لە جێگەیەکی دور لە دانیشتنیان کە جیهانە، ئەمڕۆ ڕۆژی پرسیار و پاداشتە، ڕۆژی کردار و باوەڕهێنان نی‌یە و سودی نی‌یە بۆیان.

﴿ وَقَدْ كَفَرُوا بِهِ مِن قَبْلُ وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئەو بت پەرستانە لەمەوبەر لە جیهاندا باوەڕیان بە موحەمەد نەهێناو، شتێ لەوانەوە دیار نەبوو نەیانئەزانی فڕەیان ئەدا بەڕاستی نازانن لە جێگەیەکی دوور لە جیهان کە ڕۆژی دواییە و لەبیری خۆیانی ئەبەنەوە و، ئەڵێن: زیندوبونەوە و پرسیار و بەهەشت و دۆزەخ نیە و ئێمە سزا نادرێین بە بێ بەڵگە.

﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ ﴾ وە ئەخرێنە نێوان بێباوەڕان و نێوان شتێ ئەوان ئارەزۆی ئەکەن لە وەرگرتنی باوەڕهێنان لەوان و لە ڕزگاربوونیان لە ئاگر، ناچارکراون باوەڕ بهێنن بە ئاواتی خۆیان ناگەن، بە وێنەی شتێ

کرابو بە وێنەی ئەوان لـە بێباوەڕانی گەلانی ڕابردوو. بە ڕاستی ئەو بت پەرستانە و بێباوەڕانە وێنـەی ئـەوان کەوتونەتـە نـاوی گومانـەوە و ڕاسـتیان بـۆ دەرکـەوت کــە ڕۆژی دوایــی و زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ هەیە.

بە یاریدەی خوا کۆتایی بەماناکردنی ئەم سورەتە هات لە (١٤) ڕەبیعول ئەوەل سالّی (١٤٢١)ی کۆچی بەرانبەر (٢٠٠٠/٦/١٦)ی زایینی.

## ﴿ سورەتی فاتیر یا ئەلمەلائیکە ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی ( ٤٥ ) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾

﴿ الْحَمْدُ للهِ فاطِرِ السَّماواتِ وَالأَرْضِ جاعِلِ لْمَلائِكَةِ رُسُلاً أولى أجْنِحَةٍ مَّثْنى وَ ثُلاثَ وَرُباعَ ﴾ سوپاسی پاك وبی پایان بۆ خوایە کە دروستکەری ئاسمانەکان و زەویە، بەبێ ئەوەی لەپێشەوە وێنەیان بوبێ، خوایە کە فریشتەکانی گێراوە بەنوێنەر لەنێوان خۆیی و پێغەمەرانداو، ئەوان سروش ئەبەن بۆلای پێغەمەرو ئەوانیش ڕای ئەگەیەنن بەئادەمیزاد و جنۆکە، ئەو فریشتانە نێرراوێکن خاوەنی دوو باڵ یا سێ باڵ یا چوار باڵن بەگوێرەی جیاوازی پلەیان لای خوا، بەو باڵانە لەئاسمانەوە دێنە خوار و ئەچنە سەرەوە، کارئەکەن بەوجۆرەی خوا فەرمانیان پێ ئەدا.. دەربڕینی بیرو بۆچوون لەبارەی باڵی فریشتەکانەوە بی سودەو، ئەگونجێ لەگەڵ توانای خواداو دژی ئەقڵ نیە، بەگوێرەی زانینی ئێمە، لەوە زۆرتر هەواڵەی زانیاریخوای مەزنی ئەکەین و، پەیوەندی بەژیانی ئێمەوە نیە، بەڵگەی بێگومانیشمان دەست ناکەوێ .

﴿ يَزِيْدُ فِي الْخَلْقِ مايَشاءُ إنَّ اللهَ عَلى كُلّ شَيءٍ قَدِيْرٌ ﴾ خوا لەدروست کردنی باڵدا زۆر ئەکا شتێ ئارەزۆی بکا، وائەبێ زۆرتر لەچوار باڵ دروست بکا بەگوێرەی جیوازی پلەو پایەی فریشتەکان. بەڕاستی خوا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. پێغەمەر فەرمووی لەشەوی میعراجدا جبرەئیلم بینی شەش سەد باڵی هەبو. هەربەوجۆرەی فریشتەکان لەپلەوپایەدا جیاوازن: ئادەمیزادیش جیاوزییان هەیە لەجوانی ڕومەت و دەنگی خۆش وئەقڵی تەواو لەشی گەورەو شتی تریش .

﴿ مايَفتَحِ اللهُ لِلناسِ مِنْ رَّحْمَةٍ فَلا مُمْسِكَ لَهُ وَما يُمسِكْ فَلا مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ العَزيزُ الْحَكِيْمُ ﴾ هەرشتی خوا ببیبەخشێ بەئادەمیزاد لەچاکەی خۆی و دەرگای میهرەبانی خۆی بەرەلا بکا، دوایی هیچ کەسی توانای ئەوەی نیە بیگرێتەوە لەوان و ، هەرشتێ خوا لەوانی بگرێتەوەو بەوانی نەبەخشێ، دوایی هیچ کەسێ بەرەڵای ناکا لەدوای گرتنەوەی خوا بۆ ئەو شتە و. هەرخوایە تەنها توانای گرتنەوەو بەرەڵاکردنی هەیە، هەموو شتێ بەگوێرەی زانین لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

زانایان ئەڵێن: مەبەست لەچاکە لێرەدا تەنها دارایی و لەش ساغی وزانست و پلەوپایەی نیە، بەڵکو بریتیە لەوەی خوا ڕانومایی ئادەمیزدا بکا بۆلای کردنی کاری چاك، خۆی بپارێزێ لەخراپە، چونکە دارایی و زانست و لەش ساغی و پلەوپایەی وا هەن سەرئەکێشن بۆلای یاخی بوون لەفەرمانی خواو ستەمکردن.

﴿ يا اَيُّها النّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خالِقٍ غَيْرُ اللهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّماءِ وَ الأَرْضِ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ئێوە بیری چاکەی خوا بکنەوە بەسەر ئێوەداکەبەئێوەی بەخشیوە، ئایا لەجگەی خوا دروستکەرێ تر هەیە ڕۆزی و خواردەمەنی ببەخشێ بەئێوەو بەخێوتان بکا لەئاسمانەوە بەبارینی باران و، لەزەوییەوە بەسەوزبوونی ڕووەك و درەخت و دانەوێڵە؟ بێگومان خۆتان ئەزانن کەسی تر نیە جگەی خوا.

﴿ لاإِلَهَ إِلاّ هُوَ فانّي تُؤْفَكُونَ ﴾ هیچ کەسی نیە شایستەی پەرستنبی ورۆزی بدا بەئادەمیزاد مەگەر هەرخوای مەزن، دوایی ئێوە چۆن لەڕاستی لاداراون و بەتەنها خوا ناپەرستن و بۆلای بت پەرستی ئەڕۆن.

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ

عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾

﴿ وَإِنْ يَكَذِّبُونَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِنْ قَبْلِكَ وَ إِلى اللهِ تُرْجِعُ الأُمُورُ ﴾ وەئەگەر بی باوەڕانی مەکە تۆ بەدرۆ بخەنەوە ئاازری گیانی خۆت مەدە، بەڕاستی پێغەمەران لەپێش تۆوە بەدرۆخراونەتەوەو ئازاری دراون، ئەوانیش ئەیان ووت: زیندوو بونەوە نیە. کەواتە تۆیش خاوەنی ئارم بەو، هەموو کارێ هەر بۆلای خوا ئەگێڕیتەوە، خوا پاداشتی هەمو کەسێ ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان.

﴿ یاأَیُّها النّاسِ إِنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ فَلا تَغُرَّنَّكُمْ الْحَیاةُ الّدُنیا وَلایَغُرّنَّكُمْ بِاللهِ الْغَرُورُ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: بەڕاستی بەڵێنی خوا بەزیندوو بونەوەو پادشت دانەوە ڕاستەو بێگومانە، دوایی فریوی ئێوە نەدا خۆشی وژیانی جیهان و ، فریوی ئێوە نەدا شەیتانی زۆر فریودەر و لاتان بدا لەپەرستنی خوا بەهۆی دارایی و سامان و منالّی زۆرەوەو بتانباتە خوار بەناو خۆشی و ڕابواردنی جیهان.

﴿ إِنَّ الشَّيْطانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذْهُ عَدُواً إِنّما يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحابِ السَّعِيرِ ﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنی سەرسەختە بۆ ئێوەی ئادەمیزاد، دوایی ئێوە شەیتان وەربگرن بەدوژمنی گەورەی خۆتان و، ئەو پەیمانەی داویەتی ئێوە لابدا لەخوا پەرستی بیری خۆتانی بخەنەوە. بەڕاستی شەیتان بانگی تاقمی خۆی ئەکا، لەبەرئەوەی ئەوان ببن بەدانیشتوانی ناو ئاگری کلّپەداری دۆزەخ.

﴿ الَّذِيْنَ كَفَرُوا لَهُمْ عَذابٌ شَدِيْدٌ وَّ الَّذِيْنَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحاتِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَّ أَجْرٌ كَرِيْمٌ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بۆیان هەیە سزایەکی زۆر سەخت لەڕۆژی دواییداو، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوە، بۆئەوان هەیە لێ خۆشبون لەگوناهەکانیان و پاداشتێکی زۆر گەورەو بەنرخ.

﴿ أَفَمَنْ زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرآهُ حَسَناً ﴾ ئایا دوایی کەسێ لەلایەن شەیانەوە بۆی ڕازێنرابێتەوە کردەوەی خراپی خۆی ، دوایی وابزانری ئەو کردەوەی خۆیە چاکە، وەك کەسێ وایە چاك و خراپ جوێ بکاتەوە، بێگومان وێنەی یەك نین.

﴿ فَإِنَّ اللهَ يُضِلُّ مَنْ يَشاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشاءُ فَلا تَذْهَبْ نَفْسَكَ عَلَيْهِمْ حَسَراتٍ إِنَّ اللهَ عَلِيْمٌ بِما يَصْنَعُونَ ﴾ دوایی بەڕاستی خوا هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ لەڕێگەی ڕاستی ئایین لای ئەدا، چونکە ئەو کەسە ئەقلّی خۆی نەخستوەتەکار بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست و، هەرکەسێ ئارەزوی هەبێ شارەزایی ڕێگەی ڕاستی ئەکا، دوایی تۆ خۆت لەناومەدە لەبەر خەفەت خواردن لەسەر بەردەوامی تاقمی خۆت لەسەر بێ باوەڕی و بێ فەرمانی خواو بت پەرستی، بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ ئەو بت پەرستانە ئەیکەن، ئەوان سزای خراپەی خۆیان وەرئەگرن، تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە.

وَٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابٗا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١١﴾

﴿ وَاللهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّياحَ فَتُثِيرُ سَحاباً فَسُقْناهُ إلى بَلَدٍ مَيتٍ ﴾ وە خوا کەسێکی ئەوتۆیە ڕەوانەی ئەکا بایەکان بەتوانای گەورەیی خۆی، دوایی ئەو بایانە هەورەکان لەجێگەی خۆیان هەڵئەکەنن، دوایی ئێمە ئەو هەورە پاڵ پێوە ئەنێین بۆلای پارچەیەك زەوی وشکی بێ گیاو سەوزایی

﴿ فَأَحْيَنا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها كَذٰلِكَ النشور ﴾ دوایی ئێمە بەئاوی بارانی هەور ئەو زەویە مردوە زیندو ئەکەینەوە دوای وشك بونی‌و مردنی بەئاسانی‌و بەبێ ماندو بوون، هەر بەو جۆرەیشە زیندوکردنەوە مردوەکان و هاتنە دەرەوەیان لە گۆڕەکانیان.

﴿ مَنْ كانَ يُرِيدُ العِزَّةَ فَلِلهِ الْعِزَّةُ جَمِيْعاً ﴾ هەر کەسێ داوای گەورەیی‌و ڕێز ئەکا لەهەردو جیهاندا، دوایی گەورەیی هەموی هەر بۆ خوایە هەر بەتەنها، ئەبێ داوای گەورەیی لەخوا بکەن و بەویستی خۆی گەورەیی‌و جگەی گەورەیی ئەدا بەهەر کەسێ بیەوێ، گەورەیی هەر بەپەرستنی خوا دەست ئەکەوێ. نەك بەپەرستنی بتەکان بەگوێرەی گومانی بت پەرستان.

﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيبُ وَالْعَمَلُ الصالْح يَرْفَعُهُ ﴾ بۆلای خوا بەرز ئەبێتەوە گفتوگۆی پاك و چاك لەیادی‌خواو پاڕانەوە لەخواو، لە ئامۆژگاری‌و نیازی پاك و، کردەوەی چاك لەپەرستنی خوا بەنیازی پاك و خۆ بەخت کردن لەڕێگەی خواو نیشتمانا گفتوگۆی چاك بەرز ئەکاتەوە بۆلای خۆی. کەواتە ئێوە هەر گفتوگۆی پاك و چاك بکەن.

﴿ وَالَّذِيْنَ يَمْكُرُونَ السَيِّئاتِ لَهُمْ عَذابٌ شَدِيْدٌ وَمَكْرُ أولئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴾ وە کەسانێکی ئـەوتۆ فێڵو پیلان و خراپەکان ئەسازێنن بۆ موحەمەدو بۆ لـەناو بردنی، بۆ ئەوان هەیـە سزایەکی زۆر سەخت لـەڕۆژی دواییداو، فێڵو پیلانی ئەوکەسانە، ئەو پیلانەیە پوچ ئەبێتەوە. بەڵام کاری خوا سەرئەکەوێ.

﴿ وَاللهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرابٍ ثُمَ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَ جَعَلَكُمْ أزواجاً ﴾ وە خـوا یەکـەم بـاوکی ئێـوەی دروست کردوە لـەخاك لـەپاشـا منالـەکانی ئـادەمی دروسـت کـردوە لـە تـۆوێ دوای بەیـەك گەیشتنی نێرو مێ بەیەکتری، لەپاشا ئێوەی کردوە بەهاو جوت لـەنێرو مێ، بۆ ئەوەی ئێوە بچنە لای یەکتریو زاوزێ بکەن و ئادەمیزاد زۆر بن.

﴿ وَما تَحْمِلُ مِنْ أنْثى وَلا تَضَعُ إلاّ بِعِلْمِهِ وَما يُعَمَرُ مِـنْ مُعَمَـرٍ وَلا يَنْقَـصُ مِـنْ عَمْـرِهِ إلا فِـي كِتابٍ مُبِيْنٍ إنَ ذلِكَ عَلَى اللهِ يَسِرٌ ﴾ وەهیچ ژنێ منالـەکەی هەڵنـاگرێ لـە منـاڵدانیدا، منالیشـی دانانێ لـەمناڵدانی مەگەر ئەوانە هەمویان بەهۆی تواناو زانینی خواوەیەو، هیچ تەمەن پـێدراوێ تەمەنی درێژنابێ هەتا بگاتە کاتی پیریولـەتەمەنی کەم نابێتەوەو بخرێتە سـەر تەمـەنی یـەکێ تـر مەگەر ئەوانە هەمویان لـەنامەیەکی ئاشکرادا تۆمار کراون کە لـەوحەل مەحفوزە، یـانی درێـژی تەمەن و کورتی تەمەن لـەنامەی کرداری ئادەمیزاددا تۆمار کراون. بەڕاسـتی درێـژی تەمـەن و کورتی تەمەن و دیاریکردنی تەمەن بۆ هەمو کەسێ ئاسانە لـەسەر خوای مەزن و هیچ شتێ لای خوا گران نیە.

وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۚ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ

﴿١٤﴾ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾

﴿ وَما يَسْتَوِي البَحْرانُ هـذا عَـذْبٌ فُراتٌ سائِغٌ شَرابُهُ وَهـذا مِلْحٌ أُجاجٌ ﴾ وەدو دەریـا یەکێکیان ئاوەکەی زۆر شیرینبێ‌و بەئاسانی بڕواتە خوارەوە بۆ گەدەو تینوێتی بشکێنێ‌و، ئـەوی تریان ئاوەکەی زۆر سوێرو تاڵ‌و تفتبێ‌و تینوێتی نەشکێنێ‌و بەئاسانی نەڕواتە خوارەوە بـۆ گـەدە ئاوی ئەو دو دەریایە یەکسان نین.

﴿ وَمِنْ كُلٍ مَنْهُما تَأْكُلُونَ لَحْما طَرِياً وتستخرجون حلية تلبسونها ﴾ وەلەهەردو دەریاکـان: شیرین و تاڵیان ئێوە گۆشتێکی تازەو تەڕو بەتام ئەخۆن و، ئێوە لـەواندا خشڵی نایاب دەرئەهێنن و ئەیپۆشن و خۆتانی پێ ئەڕازێننەوە بەتایبەتی لـەدەریا سوێرەکاندا.

﴿ وَتَرى الْفُلْكَ فِيْهِ مواخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَكُمْ تُشْـكُرُونَ ﴾ وەتـۆ کەشتیەکان ئـەبینی لـەناو هەریەکە لـەو دوو دەریایانەدا، ئەڕۆن و ئاوەکانیـان لـەت ئەکـەن بـەم لاو لای خۆیانـا، لـەبەر ئەوەی ئێوە پەیدا بکەن بۆ خۆتان ڕۆزی‌و خواردەمەنی‌و شـتی تـری نایـاب بـەبازرگانی‌و جگەی بازرگانی‌و، بۆ ئەوەیش ئێوە سوپاسی خوا بکەن لـەسەر چاکەکانی خوا.

ئەو ئایەتە ئامـاژە بـۆ ئـەوە ئـەکا: هـەر وەك ئـەو دو دەریانـە هاوبەشـن لـە ئـاوێ تیدا، هەریەکەیان سودێکی تایبـەتی خۆیانیـان هەیـە، هـەروایش ئـادەمیزاد هەرچـەند هاوبەشـن لـە مرۆڤایەتیدا. بەڵام هەریەکەیان جۆرێکی تایبەتی خۆیانیان هەیە: هەیانە بـاوەڕدارن و هەیانـە بـێ باوەڕن، هەیانە دەست گوشادو هەیانە دەست قوچراو، هەیانـە زانـاو هەیانـە کـەودەن، هەیانـە ئازاو هەیان ترسنۆك. هەتا دێ.

﴿ يُوْحِيَ الَيْلَ فِي الَنهار وَيُوْحِيَ الَنهار فِي الَيْلِ ﴾ خوا کاتی شەو ئـەبا بـەناو کـاتی ڕۆژداو کاتی ڕۆژ کەم ئەبێتەوە، کاتی ڕۆژ ئەبا بەناو کاتی شەوداو کاتی شەو کەم ئەبێتەوە.

خوای مەزن زەوی دروست کردوە بەخڕی، ئەسوڕێتەوە بـەم لاولای خـۆردا، بـەو بۆنـەوە چوار وەرزی بەهارو هاوین و پایزو زستان پەیدا ئەبێ، نەختە نەختە بەهۆی ئەو سوڕانەوە یـەکێ

لەشەو ورۆژ کاتەکانیان وا ئەبێ زۆرو کەمی ڕویان تێ‌ئەکا، ئەگەر خۆر بەلای باشوری زەویدا کەوت ڕۆژ کەمتر ئەبێ، ئەگە ربەلای باکوردا بڕوا شەو کەمتر ئەبێ. لەکاتی چونی خۆر بەسەر هێڵی ناوەڕاستی زەویدا شەووڕۆژ کاتەکانیان وەك یەك ئەبن، هەندێ جار لەیەك کاتدا لایەکی زەوی تاریکەو ئەبێ بە شەو، ئەو لاکەی تر ڕوناکەو ئەبێ بە ڕۆژ. هەروەها ئەو سوڕانەی زەوی بەردەوامە هەتا کاتی دیاری‌کراو بۆیان.

﴿ وَسَخَرَ الشَمْسُ وَالقَمَرَ كُلٌّ تَجْرِي لأَجْلِ تُسَمىً ذٰلِكُمْ اللهُ رَبُكُمْ لَهُ المُلكْ ﴾ وە خوا خۆرو مانگی ڕام کردوە لە بۆسودی بەندەکانی خۆی، هەریەك لەخۆرو مانگ ئەڕۆن بەبازنەی دیاریکراوی خۆیانا بەگوێرەی سوڕانی تایبەتی خۆیان هەتا ماوەیەکی دیاری بۆیان. دوای ئەو ماوەیە لەسوڕ ئەکەون و جیهان خاپور ئەبێ‌و ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ، ئەو کەسەی ئەوکارە سەرسوڕێنەرانە ئەکا خوایە، پەروەردگاری ئێوەیە، هەر بۆخوایە پاشایەتی‌و خاوەنیەتی ئێوەو هەمو بونەوەران .

﴿ وَالَّذِيْنَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مايَمْلِكُوْنَ مِنْ قَطْميرِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ئێوە ئەوان ئەپەرستن لەجگەی خوا خاوەنی ئەو پێسە سپیە تەنکە نین بەسەر دەنکی خوارماوەیە.

﴿ إنْ تَدْعُو لايَسْمَع دُعاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مااسْتَجابُوا لَكُمْ ﴾ ئەگەر ئێوە بانگی ئەو کەسانە بکەن ئەیان پەرستن، ئەو بانگ و هاوارەی ئێوە نابیستن، چونکە ئەوانە هەیانە دارو بەردی بێگیانن و، ئەگەر بیشی بیستن و فریشتەو ئادەمیزاد بن وولاّمی ئێوە نادەنەوە. چونکە خاوەنی سود نین بۆخۆیان، هەتا سودو زیان بەئێوە بگەیەنن، ئیتر چۆن ئێوە ئەیان پەرستن؟

﴿ وَيَوْمَ القِيامَةِ يُكفَرُوْنَ بِشِرْكِكُمْ وَلا يُنَبِئُكَ مَثْلُ خَبِيْرِ ﴾ وە لەڕۆژی دواییدا ئەو کەسانەی ئێوە ئەیان پەرستن لە جگەی خوا باوەڕیان بەو هاوبەشدانانەی ئێوە نیە بۆ ئەوان و لەو کارە زۆر بێزارن و سەرزەنشتی ئێوە ئەکەن و، هەواڵ بەتۆ نادا هیچ کەسێ لەبەسەر هاتی ئەوان و بتەکانیان لەڕۆژی دواییدا هەواڵ نادا بەوێنەی کەسێ زۆر ئاگاداری کردەوەو کاری ئەوانە کە خوای مەزنە.

﴿ ياأَيُها الّناسُ أَنْتُمُ الفُقَراءُ إلى اللهِ وَاللهُ هُوَ الغَنِّيُ الْحَمِيْدُ ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ئێوە هەژاری لای خوان بۆ هەمو کارێ‌و لەهەمو کاتێکا. کەواتە خۆتان نزیك بخەنەوە لەخوا بەپەرستنی ئەوو هاوبەشی بۆ دامەنێن و، خوا ئەو کەسەیەو پێویستی بەهیچ کەسێ نیەو هەر ئەو شایستەی سوپاسە، بەڵکو ئێوە پێویستیتان بەو هەیە ڕزگارتان بکا لەنەخۆشی‌و تەنگانەو لەهەمو شتێ‌کا.

﴿ إنْ يَشاءَ يُذْهِكُمْ وَيَأتِ بِخَلْقِ جَدَيْدِ وَّما ذٰلِكَ عَلى اللهِ بَعَزِيْزِ ﴾ ئەگەر خوا ئارەزو بکا ئێوە لەناو ئەباو، بونەوەرانێکی تازە ئەهێنێ جگەی ئێوەو خوا پەرستر ئەبن لە ئێوەو بێ فەرمانی خوا ناکەن و، ئەو لەناو بردنەی ئێوەو دروست کردنی بونەوەرێ تر گران نیە لەسەر خواو زۆر ئاسانە، ئەفەرموێ: بن و ئەوانیش کوتوپڕ ئەبن.

﴿ وَلا تَزِرُوا زِرَةٌ زِرَةٌ وِزْرَ أخرى وَإنْ تَدْعُ مُثْقلة إلى حَمْلها لَيحْمِلْ مِنْهُ شَيْءٌ ﴾ وە هیچ کەسێکی گوناه بار گوناهی هیچ کەسێ تر هەڵناگرێ لە ڕۆژی دواییداو، بەڵکو هەر گوناهی شتێ هەڵئەگرێ خۆی کردبێتیو سزای بەهۆی تاوانەوە ئەدرێ، نەك بەهۆی تاوانی یەکێ ترەوەو، ئەگەر کەسێ باری گران کرابێ بەگوناهی خۆی داوا لەکەسێ تر بکا بۆلای هەڵگرتنی هەندێ لە گوناهەکانی، هیچ شتێ لەو گوناهە هەڵناگیرێو، با ئەوەی کە بانگ ئەکرێ خزمی نزیکی بانگ کەرەکە بێ وەك براو کوڕو کەسی تر.

پرسیار/ لەسورەتی عەنکەبوتا خوا ئەفەرموێ: با ئەو بێ باوەڕانە گوناهی بێ باوەڕی تر هەڵبگرن لەگەڵ گوناهی خۆیا، ئایا ئەوەی ئەوێ دژی ئەمەی ئێرە نیە؟

وەڵام/ دژی یەکتر نین، چونکە ئەوەی سورەتی عەنکەبوت هاتوەتە خوارەوەو لەبارەی کەسێکەوە خۆیلەڕێگەی ڕاست لای داوە وە کەسانی تریشی لەڕێگە لاداوە، ئەو کەسانە گوناهی لەڕێگە لادانی خۆیو لەڕێگە لادانی کەسانی تری هەڵگرتوە کە هەردو گوناهەکە هی خۆین و گوناهی کەسی تر نین.

﴿ إنما تُنْذِرُ الَّذِيْنَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ وَأقامُوا الْصَلاة ﴾ بەڕاستی ترساندنی تۆو ئامۆژگاری کردنی تۆ کەسانێکی ئەوتۆ وەری ئەگرن لەپەروەردگاری خۆیان بترسن بەبێ ئەوەی سزایخۆیان بینیبێو، دورن لەدوڕویو، نوێژەکانیان بەجێ ئەهێنن بەگوێرەی یاساو بەردەوامن لەسەر کردنیان.

﴿ وَمَنْ تَذَكَّى فَإنَما يَتزكى لِنَفْسِهِ وَإلى اللهِ المَصِيْرُ ﴾ وە هەر کەسێ خۆی پاك کردبێتەوە لەبت پەرستیو بێ فەرمانی خوا، بەڕاستی ئەو پاکیە سودی هەر بۆخۆیەتیو چاکەی بۆخۆی ئەگەڕێتەوەو، هەر بۆلای خوایە گەڕانەوەی لەڕۆژی دواییدا، دوایی پاداشتی هەمو کەسێ ئەداتەوە بەگوێرەی پاداشتی خۆی.

وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ ۖ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ

ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾

﴿ وَما يَستَوِى الأَعْمى وَالْبَصِيْرُ ﴾ وە کەسێ کوێر بێ لەئاستی ئاینێکی ئەوتۆ خوا تۆی بەو ئاینەوە ناردوەو، کەسێکی ئەوتۆ شارەزایی ببینێو دوای تۆ بکەوێو باوەڕت پێ بهێنێ وێنەی یەك نین.

﴿ وَلَ االظُلُماتُ وَلا النُورُ وَلا الظِلُ وَلا الْحَرُوْرُ ﴾ وە تاریکیەکانی نەزانین و ڕوناکی زانست و شارەزاییو، بەهەشتێ سێبەری بەردەوامەو دۆزەخێ گەرمایەکی بەردەوامە وێنەی یەك نین.

﴿ وَما يَستَوِى الأَحْياءَ وَلا الأَمْواتَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ شارەزاییان وەرگرتوەو، باوەڕیان بەخواو پێغەمبەری خوا هێناوەو، کەسانێ بەردەوامبون لەسەر بێباوەڕیو خۆیان بەگەورە داناوە وێنەی یەك نین.

﴿ إنّ اللهَ يَسْمَعُ مَنْ يَشاءُ وَما أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِى الْقُبُور ﴾ بەڕاستی خوا ئەبیسێنێ بەهەر کەسێ ئارەزوی هەبێ ڕانومایی وەربگرێ دەنگی ڕاستیو باوەڕ بەخواو فروستادە خوا ئەهێنێو، تۆ ناتوانی ڕاستی ببیسێنی بەکەسێ بەردەوام بێ لەسەر بێباوەڕی بەوێنەی کەسێ مردبێو خرابێتە گۆڕستانەوەو، هیچ شتێ نەبیستێ.

﴿ إنْ أَنْتَ إلا نَذِيْرٌ ﴾ هیچ شتێ لەسەر تۆ نیە مەگەر تۆ ئەوتە لەسەرە ئەوان بترسێنی لەسزای خوا. بەڵام ببیستی ڕاستی بەوان پیشەی تۆ نیە. دوایی وەرگرتنی ئەو شتەی تۆ هێناوتە بۆلای ئەوان بەدەستی خوایە. نەك بەدەستیتۆ، کەواتە تۆ بەخەفەتی ئەوانەوە خۆت لەناو مەبە.

﴿ إنا أرسَلْناكَ بالحَقِ بَشِيْراً وَنَذِيْراً وَإنَ مِنْ أمَةٍ إلا خَلافِيْها نَذِيْرٌ ﴾ بەڕاستی ئیمە تۆمان ڕەوانە کردوە بە ئاینێکی ڕاستەوە موژدە بدەی بەباوەڕداران بەبەهەشت و، بێباوەڕان بترسێنی بەئاگری دۆزەخ. تۆ لەخۆتەوە موژدە نادەیی‌و کەس ناترسێنی و، بەفەرمانی خوا ئەو شتانە ئەکەی و ، هیچ نەتەوەیە نەبوە لەپێش کاتی تۆوە مەگەر ڕۆیشتوە بۆناو ئەوان پێغەمەرێ یازانایە ئەوانی ترسانوە لەپاشەڕۆژی خراپی بەردەوامبون لەسەر بێ باوەڕی و بێ فەرمانی خوا.

﴿ وَ إنْ يُكَذِبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ جاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّناتِ وَ بِالزُّبُرِ وَبِالْكِتابِ الْمُنِيْرِ ﴾ وەئەگەر بت پەرستانی مەککە تۆ بەدرۆ بخەنەوە بەلاتەوە تازە نەبێ، دوایی بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش بت پەرستانی مەککەوە بوون پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستوەتەوە کاتێ پێغەمەرەکانیان چوبون بۆلایان بەچەندین بەڵگەی ئاشکراو کاری پەکخەر و دەستوری ڕونەوە، هەموویان بەڵگەبوون لەسەر پێغەمەرایەتی ئەوانو، بەچەندین نامەی نێرراو بۆسەریان وێنەی نوسراوەکانی ئیبراهیم و، بەچەندین نامەی ڕوون کەری یاسا بۆئەوان، وەك تەورات وئینجیل، بەدرۆیان خستەوەو ئارامیان گرت تۆیش ئارام بگرە.

﴿ ثُمَّ أخَذْتُ الَّذِيْنَ كَفَرُوا فَكَيْفَ كانَ نَكِيْرِ ﴾ لەپاشا من سزای کەسانێکی ئەوتۆم دان باوەڕیان نەهێنابوو بەپێغەمەرەکانیان بەچەندین سزای گران، دوایی تۆ تەماشا بکە پاشەڕۆژی گۆڕانکاری من لەسەر ئەوان و، سزادان و لەناوبردنی ئەوان و جێگەکانیان بەجۆرێ بوەو، مەگەر هەر ناویان ببرێ.

﴿ ألَمْ تَرى أنَّ اللهَ أنْزَلَ مِنَ السَّماءِ ماءً فَأخْرَجْنا بِهِ ثَمَراتٍ مُخْتَلِفاً ألْوانُها ﴾ ئایا تۆ نازانی ئیمە ناردومانەتە خوارەوە ئاوێ لەئاسمانەوە و دوایی ئیمە درەختەکانمان بەو ئاوە ئاوداو، دوایی ئیمە لەو درەختانە چەندین میوەی ڕەگەز وڕەنگ و تام جیاوازمان دەرهێناوە لەبەر سوودی ئادەمیزاد.

﴿ وَمِنَ الْجِبالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمُرٌ مُخْتَلِفٌ ألْوانُها وَغَرابِيبُ سُودٌ ﴾ وەچەندین ڕێگەی سپی و سوور، ڕەنگەکانیان جیاوازن، هەیانە زۆر سپین و هەیانە زۆر سوورن وهەیانە مام ناوەندین و، هەندێ لەکێوەکان زۆر زۆر ڕەشن، ئەو گۆڕانکاریانە بەڵگەن لەسەر توانای خوا، هەروەك میوەکانیش بەڵگەن لەسەری.

﴿ وَمِنَ النّاسِ وَالدَّوابِ وَالأنْعامِ مُخْتَلِفٌ ألْوانُهُ ﴾ وەچەند ڕەگەزێ هەن لەئادەمیزاد و لەو شتانە ئەخشێن بەسەر زەویدا ولەچوارپێکان، ڕەنگیان جیاوزە: هەیانە سپی و هەیانە سوورن، هەیانە ڕەشن وهەیانە زەردن، هەیانە ڕەنگی ترن.

﴿ كَذلِكَ ﴾ خوای مەزن ڕەنگی ئادەمیزاد و ئەوانەی تری بەجیاواز دروست کردوە، هەروەك ڕەنگی میوەکان و کێوەکان جیاوزن، ئەوانە هەمویان بەڵگەن لەسەر توانای خوا.

﴿ إنّما يَخْشى اللهَ مِنْ عِبادِهِ الْعُلَماءُ إنَّ اللهَ عَزِيْزٌ غَفُورٌ ﴾ بەڕاستی زانا خواناسەکان لەبەندەکانی خوا لەخوا ئەترسن و، دوای لاسایی و بیروباوەڕی پیاوخراپان ناکەون وبەبەڵگەی بێگومان خوا ئەناسن، بەڕاستی خوا زۆر بەدەسەڵاتە سزای بێ باوەڕان ئەدا، خۆش ئەبێ لەوکەسانە پەشیمان ئەبنەوەو باوەڕئەهێنن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ هُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتابَ اللهِ وَأَقامُوا الصَّلاةَ وَأَنْفَقُوا مِمّا رَزَقْناهُمْ سِراً وَعِلانِيَةً يَرْجُونَ تِجارَةً لَنْ تَبُورَ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ نامەی خوا بەبەردەوامی ئەخوێنن وکاربە یاساکانی ئەکەن و، نوێژەکانیان بەرپائەکەن بەگوێرەی یاسای دیاریکراو بۆیان و، سستی تێداناکەن و، ئەبەخشن بەهەژاران هەندێ لەوشتەی بەوانمان بەخشیوە بەنهێنی و بەئاشکرا ، ئومێدەوارن بازرگانی خوا پەرستنیان تووشی زیان نەبێ و، قازنجیان مسۆگەربێ.

﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ لەبەرئەوەی خوا پاداشتی ئەوان بەتەواوی ببەخشێ پێیان وخوا زۆرتریشی بکا بەهۆی گەورەیی خۆیەوە هەتا دەچەندانە. بەڕاستی خوا خۆش ئەبێ لەهەڵەیە کردویانە، پاداشتی گەورەیان ئەداتێ لەسەر ئەوەی سوپاسی چاکەی خوایان کردوە.

﴿ وَ الَّذِي أَوْحَيْنا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقاً لِما بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللهَ بِعِبادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴾ وەشتێکی ئەوتۆ لەنامەی ئێمە بەسروش ناردومانە بۆلای تۆ ئەو شتە زۆر ڕاستەو گومانی تێدانیە، ئەو نامەیە بەڕاست ئەگێڕێ شتێ لەنامەکانی پێشوودان و، دەستکاری نەکراون و، لەسەر دەستوری ئەو نامەیە ماونەتەوە.

بەڕاستی خوا ئاگاداری کردەوەی ئاشکراونهێنی بەندەکانی خۆیەتی وئەیان زانێ کەتۆ شیاوی ئەوەی ئەم نامەیە بە نێری بۆ تۆو ، بکرێ بەدەستوری بەردەوام.

﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنا الْكِتابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنا مِنْ عِبادِنا ﴾ لەپاشا ئێمە بریارماندا لەدوای تۆ ئەو نامەیە کەقورئانە بیکەین بەمیرات بۆ کەسانێکی ئەوتۆ هەڵمان بژاردوون و ڕێزمانداون بەسەر هەموو نەتەوەکانی تردا کە ئەوانیش بریتین لە ئۆمەت و پەیرەوانی تۆ، فەرمان ویاساکانی ئەو نامەیە بزانن بەبێ ماندو بون، هەندێکن لەوبەندانەی ئێمە هەڵمان بژاردوون.

١- ﴿فَمِنْهُمْ ظالِمٌ لِنَفْسِهِ ﴾ دوایی هەندێ لەو بەندانەی ئێمە کەسێکە کەمتەرخەمی کردوە لەبارەی کارکردن لەشتێ لەناو قورئاندا هاتوە، دوایی خۆی نومایش کردوە بۆ سزای خوا لەڕۆژی دواییدا. ئەو کەسە بەند ئەکرێ ماوەیەکی زۆر لەو ڕۆژەدا، سەرزەنشتی زۆر ئەکرێ بەجۆرێ گومان ئەبا سزای گرانی ئەدرێ، دواجار خوا لێی ئەبورێ و ئەیخاتە بەهەشت.

٢- ﴿ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ ﴾ وەهەندێ لەو بەندانەی ئێمە کەسێکە کاری کردوە بەفەرمانی خوا لەزۆر کاتدا، کەمتەرخەمی کردوە لەهەندێ کاتی تردا، دوایی کاری چاکی تێکەڵاو بەکاری خراپ کردوە، ئەو کەسە خوا پرسیارسێکی سوکی لێ ئەکاو، لەپاشا ئەیخاتە بەهەشتەوە.

٣- ﴿ وَمِنْهُمْ سابِقٌ بِالْخَيْراتِ بِإِذْنِ اللهِ ﴾ وەهەندێ لەوبەندانەی ئێمە کەسێکە لەکردنی کارە چاکەکاندا پێش کەوتنی بۆخۆی بەدەست هێناوە، خۆی ماندو کردوە لەکاری چاکدا بەهۆی یارمەتی خواوە، چاکەکانی قورسترە لەخراپەکانی و خراپەکانی ئەشۆرێتەوە، بەنیازی پاکەوە لەبەر ڕەزایەتی خوا کارەکانیان کردوە، ئەو کەسانە بەبێ پرسیار ئەچنە بەهەشتەوە.

﴿ ذٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ جَنّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَها ﴾ ئەو بەمیرات دانەی قورئانەی ئەوتۆ دراوە بەئۆمەتی تۆ ڕێزێکی زۆر گەورەیە لەلایەن خواوە بەخشیوە بەوان کەبریتیە لەچەندین بەهەشتی بەرین و جێگەی بەردەوام ئەچنە ناوی هەتاهەتایە.

﴿ يُحَلَّوْنَ فِيها مِنْ أَساوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَ لُؤْلُؤاً وَلِباسُهُمْ فِيها حَرِيراً ﴾ ئەو کەسانە هەموویان ئەڕازێنرێنەوە لەبەهەشتا بەهەندێ لەبازنەکانی زێرو بەلولوئو، بەرگیان لەبەهەشتا ئەوریشمە.

﴿ وَقالُوا الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ لەخۆشیاندا ئەڵێن: هەموو سوپاسێ بۆ خوایەکی ئەوتۆیە ئەو خەفەتەی ئێمە لێی ئەترساین کەپاشەڕۆژمان خراپ بێ

لەئێمەی لابردو، ترسمان نەما، بەڕاستی خوا لێبوردنی بۆ گوناه زۆرە هەرچەندە زۆریش بن، پاداشتی بەندەکانی خۆی ئەداتەوە لەبەرئەوەی سوپاسیان کردوە.

﴿ الَّذِي أحَلَّنا دارَ الْمُقامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لايَمَسّنا فِيْها نَصَبٌ وَلا يَمَسّنا فِيْها لُغُوبٌ ﴾ خوایەکی ئەوتۆیە ئێمەی داناوە لەجێگەیەکا دانیشتن لەناویدا بەردەوامە لەبەر گەورەیی خۆی نەك بەهۆی کردەوەکانی ئێمەوە تووشی ئێمە نابێ ئازاری لەشمان و ، تووشی ئێمە نابێ ئازاری دەروون کەپەیدا ئەبێ لەئازاری لەشمان.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾

﴿ وَالَّذِيْنَ كَفَرُوا لَهُمْ نارُ جَهَنَّمَ لايُقْضى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَ لايُخَفّفُ عَنْهُمْ مِنْ عَذابِها كَذلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُور ﴾ وەبۆ کەسانێکی ئەوتۆ هەیە باوەڕیان نەهێناوە ئاگری دۆزەخ، فەرمان نادرێ‌بەسەریانا جارێ تری دووهەم، دوایی ئەوان بمرن ورزگاریان ببێ و، سزای ئاگری دۆزەخیش سوکنابێ بۆیان چاونوقانێ، هەربەوێنەی ئەو سزا گرانە ئێمە پاداشتی هەموو کەسێ ئەدەینەوە باوەڕ بەخواو پێغەمەری خوا نەیەرن و، سوپاسی خوا نەکەن لەسەر چاکەکانی خوا بۆ ئەوان.

﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيْها رَبَّنا أَخْرِجْنا نَعْمَلْ صالِحاً غَيْرَ الَّذِي كُنّا نَعْمَلُ ﴾ وە بێ باوەڕان هاوار ئەکەن وئەپاڕێنەوە ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ ئێمە دەربکە لەناو ئاگری دۆزەخدا ئێمە دوایی کاری چاك ئەکەین جگەی ئەو کارەی ئەوتۆ کردومانە لەکاری خراپ لەجیهاندا ،وەلاّمیان ئەدرێتەوە:

﴿ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ مايَتَذَكَّرُ فِيْهِ مَنْ تَزَكَّى وَجاءَكُمُ النَّذِيْرُ فَذُقُوا فَما لِلظّالِمِيْنَ مِنْ نَصِيرٍ ﴾ ئایا ئێمە مۆڵەتی ئێوەمان نەداو، تەمەنی تەواوی وامان نەدانێ بتوانن بیر لەکاری دوا ڕۆژی خۆتان بکەنەوەو، ئامۆژگاری وەرگرن لەو ماوەیەدا کەسی بیەوێ ئامۆژگاری وەرگرێ و، ئەقڵی خۆی بخاتە کارو، هات بۆلای ئێوە پێغەمەرێ ئێوەی ترسان لەسزای ئەم ڕۆژەو باوەڕتان پێ نەهێنا، دوایی ئێوە بچێژن سزای ئاگری دۆزەخ و، دواتر بۆ ئێوەی ستەمکار نیە کەسێ یاریدەتان بداو سزای ئاگری دۆزەختان لەسەر لابا.

﴿ إِنَّ اللهَ عالِمُ غَيْبِ السَّماواتِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ عَلِيْمٌ بِذاتِ الصُّدُور ﴾ بەڕاستی خوا ئەزانێ بەهەموو نهێنیەکانی ئاسمانەکان و زەوی و، بەکردەوەی بێ باوەڕانئەزانێ و، ئەزانێ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای جیهان کارە خراپەکان ئەکەنەوە. بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ بڕوا بەدڵی ئادەمیزادا.

﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلائِفَ فِي الأَرْضِ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی بێ باوەڕی کردوە بەجێگەنشینی کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش ئێوە بوون لەناو زەویداو، ئەزانن پاشەڕۆژی ئەوان بەچ جۆرێ بوەو، خوا بۆ ئێوەی ڕەوا کردوە بەسودی زەوی ڕابورێرن، دوایی ئێوە لەخوا یاخی بوون، سوپاسی چاکەکانی خواتان نەکرد، هەروەها ئێوە ئەڕۆن و تاقمێ تر دێتە سەرزەوی جێگەی ئێوە ئەگرنەوە، پێویستە ئێوە باوەڕ بەوخوایە بهێنن.

﴿ فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَلايَزِيْدُ الْكافِرِيْنَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلا خساراً ﴾ دوایی هەرکەسی باوەڕی نەهێنابێ لەسەر خۆێتی سزای بی باوەڕیەکەی و ، بێ باوەڕی ئەوان هیچ شتێ زۆر ناکا بۆ ئەوان لەلای خوا مەگەر خەشمی سەخت و بێ نرخی و زیان.

﴿ وَلايَزِيْدُ الْكافِرِيْنَ كُفْرَهُمْ إِلا خَساراً ﴾ وەبێ باوەڕی بێ باوەڕان هیچ بۆ ئەوان زرۆ ناکا مەگەر زیانی ڕۆژی دوایی، دوایی هەرکەسێ فەرمودەی خوای بیستو ، خۆی لەخراپە پاراست، بۆئەوکەسە هەیە پاداشتێ بەنرخ، هەرکەسێ واز لەفەرمودەی خوا بهێنێ بۆئەو کەسە هەیە سزای دۆزەخ.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ

بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾

﴿ قُلْ أرَأيْتُمْ شُرَكائَكُمْ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُون اللهِ أرُونِي ماذا خَلَقُوا مِنَ الأَرْض ﴾ تۆ بلێ بە دانیشتوانی مەککە: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بەمن لەبارەی ئەو بتانەی ئەوتۆ ئێوە گومانتان وایە هاوبەشی خوان لەپەرستن بەچ مافێ شایستەی ئەوە ن کەئێوە بیانپەرستن لەجگەی خوا؟، ئێوە نیشانی منی بدەن چ بەشێکە لەزەوی ئەوان بەتەنها دروستیان کردبێ؟

﴿ أمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّماوتِ أمْ آتَيْناهُمْ كِتاباً فَهُمْ عَلى بَيِّنَةٍ مِنْهُ ﴾ ئایا بۆ ئەو بتانە هەیە بەشێکی زۆر کەم لەدروست کردیەن ئاسمانەکاندا لەگەڵ خوادا،هەتا شایستەی پەرستن بن؟، یا ئێمە بەخشیومانە بەوان لەنامەیە لای خۆمانەوە فەرمانمان دابێ بەوان هاوبەشی ئێمە بن لەپەرستندا، دوایی ئەوان لەسەر بەڵگەیەکی ئاشکرابن لەو نامەیەدا بێ بەبیانو بۆیان؟

﴿ بَلْ إن يَعِدُ الظّالِمُونَ بَعْضَهُمْ بَعْضاً إلا غُـروراً ﴾ بەڵکو ئەوەی ڕاستی بێ ستەمکاران هەندێکیان بەڵێن نادەن بەهەندێ تریان هیچ شتێ مەگەر هەر فریودانی یەکتری کەسەرۆکەکانیان ئەڵێن: ئەوبتانە بۆمان ئەپارێنەوە لای خوا و ژێر دەستەکان بڕوایان پێ ئەکەن.

﴿ إنَّ اللهَ يُمْسِكُ السَّماوتِ وَالأَرْضِ أنْ تَزُولا ﴾ بەڕاستی خوا ئاسمانەکان وزەوی دروست کردوون و، ڕای وەستانون لەبەرئەوەی لەناونەچن بەهۆی توانای خۆیەوە، خواکانی ئێوە بێ هێزترین شتێکن کەبتوانن شتێکی کەم دروست بکەن ونەیەڵن ئاسمانەکان وزەوی لەناوبچن.

﴿ وَلَئِنْ زالَتا إنْ أمْسَكَهُما مِنْ أحَدٍ إنَهُ كـانَ حَلِيمـاً غَفُـوراً ﴾ وەئەگەر ئاسمانەکان وزەوی نەمێنن وبکەون چ کەسێ جگەی خوا ڕایان ئەگرێ ؟ بەڕاستی خوا زۆر بەئارامە لەدواخستنی

سزای بێ باوەڕان و، ئەگەر ئارامی خوا نەبوایە زەوی شەقی ئەبردو قوتی ئەدان، لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە.

﴿ وَاَقْسَمُوا بِاللهِ جَهْدَ أَيْمانِهِم لَئِنْ جاءَهُمْ نَذِيرٌ لَيَكُونَنَّ اَهْدى مِنْ إحْدى الأُمَمِ ﴾ وەقورەیشیەکان سوێنیان ئەخوارد بەخوا بەشتێ لەتواناى سوێندى ئەواندابو، بەڕاستی ئەگەر پێغەمەرێ بێت بۆلایان و، بیانترسێنێ لەسزای خوا، بەڕاستی ئەوان ڕانومایی تر ئەبن لەهەریەکە لەنەتەوەکانی ترو، باوەڕ بەو پێغەمەرە ئەهێنن هەموویان و، یەکترى بەدرۆناخەنەوە بەوێنەی ئەو نەتەوانە.

﴿ فَلَمّا جاءَهُمْ نَذِيرٌ مازَادَهُمْ إلانُفُوراً ﴾ دوایی کاتی ئەو پێغەمەرە کەموحەمەدە چوو بۆلای قورەیشیەکان و لەبێ فەرمانی خوای ترساندن، چوونی ئەو پێغەمەرە هیچ شتێکی بۆ ئەوان زۆر نەکرد مەگەر دوور کەوتنەوە لەکاری ئەو پێغەمەرە وبەدرۆیان خستەوەو باوەڕیان پێ نەهێنا.

﴿ اسْتِكْباراً فِي الأَرْضِ وَمَكْراً السَّيِّءِ ﴾ هەر لەبەر داواکردنی گەورەیی بۆخۆیان لەناو زەویداو، لەبەرئەوەی پیلانێ خراپ ساختە بهێنن بۆ ئەو پێغەمەرە داوای باوەڕهێنانی لێ ئەکردن و پیلانیشیان بۆ سازکرد.

﴿ وَلايَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّءُ إلا بِأَهْلِهِ ﴾ وەسزای پاشەڕۆژی پیلانی خراپ نایەتەخوارەوە بۆسەر هیچ کەسێ مەگەر هەر تووشی خاوەنەکەی خۆی ئەبێ و، هەرکەسێ بیرێ هەڵکەنێ بۆ جگەی خۆی هەرخۆی ئەکەوێتە ناوی .

﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إلا سُنَّةَ الأَوَلِينَ فَلَنْ تَجِدُ لِسُنَةِ اللهِ تَبْدِيلاً وَلَنْ تَجِدُ لِسُنَةِ اللهِ تَحْوِيْلاً ﴾ دوایی ئەو بێ باوەڕانە تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە نابێ چاوەڕوانی هیچ شتێ بکەن مەگەر چاوەڕوانی دەستورێ بکەن خوا تووشی گەلانی پێشووی کردوەو سزای داون کەئەمانیش تووشی سزا ئەکا وەك ئەوان، دوایی گۆڕان بۆ دەستور خوا دەست ناکەوێ و، دەستت ناکەوێ سزای ئەمان بڕوا بۆلای جگەی خۆیان.

أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾

﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ ئایا دانیشتوانی مەککە نەرۆیشتوون بەناو زەوی یەمەن و شام و عێراقدا تەماشا بکەن چۆن بوەکۆتایی بێ هاتنی ئەو کەسانەی ئەوتۆ لەپێش ئەوانەوە بوون، ئاگاداری ئەوە بن ئێمە بنەبڕمان کردوون وجێگەکانیانمان کاول کردوە؟

﴿ وَكانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ﴾ وەئەو کەسانەی پێش دانیشتوانی مەککە زۆر بەهێزتر بوون لەمان و هێزو هەڵمەتیان سودی بەوان نەبەخشی ،دوایی بۆ ئامۆژگاری وەرناگرن و واز لەخراپە بهێنن ؟

﴿ وَماكانَ اللهُ لِيُعْجِزَهُ مِنْ شَيءٍ فِي السَّماواتِ وَلا فِي الأَرْضِ ﴾ وەهیچ شتێ لەناو ئاسمانەکان وزەویدا نیە ڕێگە بگری لەخوا ئەگەر بیەوێ سزای تاقمێ بدا .کەواتە هێزی ئەوان لەبەردەم هێزی خوادا بێ نرخە.

﴿ إِنَّهُ كانَ عَلِيْماً قَدِيْراً ﴾ بەڕاستی خوا ئەزانێ بەهەموو شتێ و پەنهان نیە لای ئەو هیچ شتێ، تواناى بەسەر هەموو شتێکا هەیە .

﴿ وَلَوْ يُؤاخِذُ اللهُ النّاسَ بِما كَسَبُوا ماتَرَكَ عَلى ظَهْرِها مِنْ دابَةً ﴾ وەئەگەر خوا سزای ئادەمیزاد بدا بەهۆی شتێ کردویانە لەبێ فەرمانی خوا جێی نەئەهێشت هیچ شتێ بڕۆیشتایە بەسەر زەویدا.

﴿ وَلكِنْ يُؤَخِرُهُمْ إِلى أَجَلٍ مُسَمّى فَإِذا جاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللهَ بِعِبادِهِ خَبِيْرٌ ﴾ وەبەلاّم خوا پرسیاری ئەوان دوا ئەخا بۆلای کاتێ ناوی براوەو دیاری کراوە لەنامەی خۆیا ئەو کاتەیش ڕۆژی دواییە، دوایی ئەوکاتە هات بۆلایان بەڕاستی خوا ئاگاداری کرداری بەندەکانی خۆیەتی وپادشتیان ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان پاداشتی باوەڕداران ئەداتەوەو سزای بێ باوەڕان ئەدات.

**بەیاریدەی خوا کۆتایی پی هات ١٩/٦/ ٢٠٠٠**

# ﴿ سورەتی یاسین ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: جگە لەئایەتی (٤٥) لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە.ژمارە ئایەتەکانی (٨٣) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَالْقُرْءَانِ الْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى الْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِىَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَءَاثَٰرَهُمْ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ يَسْ ﴾ زوربەی زانایان لایان وایە مانای ئەو پیتانە وەك مانای (الم) وایـە کـە لـەوێ رون کراوەتەوە، هەندێ تر لەزانایان ئەڵێن: یاسین ناوی پێغەمبـەرە، هـەروەها بەچـەندین مانـای تـر مانایان کراوە، هەر خوا هەمو شتێ ئەزانێ.

﴿وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ سوێندم بەو قورئانـەی خـاوەنی زانستی بێ وێنەیە لەرێك و پێکیو پاراویدا، بەجۆرێ کەس ناتوانێ وێنەی دابنـێ. بەڕاستی تـۆ

یەکێ لەو پێغەمبەرانەی نێراون بۆلای ئادەمیزادو جنۆکە، لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستی و خواری ولاری تێدا نیە کەڕێگەی تەنهایی خوایە وشارەزابونە بۆلای ڕێگەی ڕاست. کەواتە گرنگی مەدە بەوبێ باوەڕانە ئەڵێن: تۆ پێغەمبەر نیت.

﴿ تَنْزِيْلَ الْعَزِيْزَ الرَّحِيْمِ لِتُنْذِرَ قَوْماً مَّا أُنْذِرَ آباؤُهُمْ فَهُمْ غافِلُونَ ﴾ ئەو قورئانەی ناردوەتە خوارەوە بۆسەر تۆ خوایە زۆر گەورەو بەدەسەڵاتە، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە، بەناردنەخوارەوەیە، لەبەرئەوە تۆ بەو قورئانە تاقمێ بترسێنێ، نەچوە بۆلای باوباپیرە نزیکەکانیان بەرلەتۆ هیچ پێغەمبەرێ بیانترسێنێ لەنێوان تۆو عیسادا کە نزیکەی (٦٠٠) ساڵە، دوایی ئەوان بێ ئاگا بوون لەباوەڕهێنان ورانومایی، چونکە پێغەمبەر نەنێررابو بۆلایان.

﴿ لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلى أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لايُؤمِنُونَ ﴾ بەڕاستی فەرمودەی من لەسەر زۆرترینی جنۆکەو ئادەمیزادو بۆ ئەوان پێویست کراوە کەدۆزەخ پڕ ئەکەم لەجنۆکەو ئادەمیزاد، چونکە ئامادەیی خۆیانیان دەرنەبڕیوە بۆ باوەڕهێنان وبەبێ باوەڕی مردوون، دوایی ڕێگە بۆ باوەڕهێنان نەبەستراوە.

بەڕێکەوت جارێ ئەبوجەهل سوێندیخوارد ووتی: ئەگەر موحەمەدم بینی نوێژ بکا بەبەردێ سەری ئەشکێنم، دوای پێغەمبەری بینی نوێژ ئەکا، بەردێکی هەڵگرت و فرەی دا بۆ پێغەمبەر، دەستی چەمایەوە بۆلای گەردنی وبەردەکە لکا بەدەستیا، هاوڕێکانی بەتوندی لەدەستیان کردەوە.

پیاوێ تر لەبت پەرستان ووتی: من بەم بەدردە موحەمەدئەکوژم، کاتی پێغەمبەر نوێژی ئەکرد چو بۆلای و، ویستی بەردەکەی بۆ بهاوێژێ چاوی کوێربو، پێغەمەری نەدی و، دەنگەکەی ئەبیست، چویەوە بۆلای هاوڕێکانی، ئەوانیشی نەدی.

پیاوێ تری سێهەم ووتی: من بەم بەردە سەری موحەمەد ئەشکێنم، بەردێکی هەڵگرت و، بەرەولای پێغەمبەر ڕۆیشت، کەچی پشتاوپشت گەڕایەوە، هەتا بەپشتا کەوت بەبێ هۆشی، پێیان ووت:ئەوە چیتە؟ ووتی: هوشترێکی نێرم بینی ،ئەگەر نزیکی بکەوتمایەوە ئەی خواردم و پەلاماری ئەدام. خوای مەزن بەوبۆنەوە فەرمووی:

﴿ إِنَّا جَعَلْنا فِي أَعْناقِهِمْ أَغْلالاً فَهِيَ إِلَى الأَذْقانِ فَهُمْ مُّقْمَحُونَ ﴾ بەڕاستی وێنەی ئەو بێ باوەڕانە واز لەباوەڕهێنانَ ئەهێنن و، هەوڵئەدەن ئازاری پێغەمبەر بدەن: بە وێنەی کەسانێ وان ئێمە زنجیر بکەینە ملیان و ببەسترێ بەچەناگەیانەوە، دوایی ئەوان سەریان بەرز ئەکەنەوەو نەتوانن دای نەوێنن وملیان بچەرخێنن بەم لاولادا، ئەو بی باوەڕانەیش ناتوانن ڕوو وەرگێڕن بۆلای ڕاستی وباوەڕبهێنن.

﴿ وَجَعَلْنا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيَهِمْ سَدّاً وَّمِنْ خَلْفِهِمْ سَدّاً فَأَغْشَيْناهُمْ فَهُمْ لا يُبْصِرُونَ ﴾ وە وێنەیان وەك وێنەی کەسانێ وانێمە دیوارێکمان دانابێ لەبەردەمیاناو، دیوارێ ترمان دانابێ لەپشتیانەوەو، ئەم لاولایان بەو دیوارانە دامان پۆشین و، نە لە پێشەوە و نە لەپاشەوە هیچ شتێ نەبینن، دوایی ئەو بێ باوەڕانەیش بەڵگەیەکی ئەوتۆ نابینن ڕێگەی ڕاستی ئاینیان بۆ روون بکاتەوەوباوەڕ بەخواو بەپێغەمەر بهێنن.

﴿ وَسَواءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لايُؤْمِنُونَ ﴾ وەئەو کەسانەی بەوجۆرە بن یەکسانە لەسەریان، ئایا تۆبیانترسێنی لەسزای خوا یا نەیانترسێنی ئەو کەسانە باوەڕنایەرن تائەمرن، ترساندن سودی نیە بۆیان.

﴿ إِنَّما تُنْذِرُ مَنْ اتَّبَعَ الذِّكْرَ وَخَشِيَ الرَّحْمنَ بِالْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴾ بەڕاستی ترساندنی تۆ سوود بەکەسێ ئەبەخشێ دوای ناوەڕۆکی قورئان بکەوێ و، لەخوای خاوەن بەخشندە بترسێ بەبێ ئەوەی ببینێ و، کار بەفەرمودەکانی بکا، بەرلەوەی تووشی سزای پاشەڕۆژ ببێ، دوایی تۆ موژدە بدە بەو کەسە بەلێبودرنی گوناهەکانی وبەپاداشتێکی بەنرخ و گەورەو بەرێز .

﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتى ونَكْتُبُ ماقَدَّمُوا وَآثارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْناهُ فِي أمامٍ مُبِينٍ ﴾ بەڕاستی ئێمە مردوەکان بەباوەڕدارو بەبێ باوەڕەوە زیندوو ئەکەینەوەو، ئەوشتەی کردویانە لەچاك و لەرخاپ ئەینوسین لەنامەی کرداریانا، لەبەرئەوەی ئێمە پاداشتی هەموویان بدەینەوە بەگوێرەی کرداریان و، ئەیشنوسین ئەوەی بەجێی یەلن لەزانینی بەسوود وبی سوود لەکاری چاك و خراپ و، ئێمە هەموو شتێ ئەژمێرین و ڕونی ئەکەینەوە لەنامەیەکی ئاشکرادا کەبریتیە لەلەوحەلمەحفوز.

زانایانی مێژوو وتویانە: دانیشتوانی شاری ئەنتاکیە لەسەردەمی عیسادا بتیان ئەپەرست. ئەو شارەکەوتوەتە باکوری ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەند. لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح داگیری کردو خستیە سەر نیشتمانی موسڵمانان، گۆڕی حەبیبی نەجار لەوشارەدایە، ئەو شارە سەربەئەسکەندەرونەی کۆماری تورکیایە.

عیسا دوو نوێنەری خۆی نارد بۆلای دانیشتوانی ئەو شارە ، هەتا یاساو دەستوری خوا پەرستی بەوان ڕابگەیەنن و واز لەبت پەرستی بهێنن، دوایی کاتێ ئەو دوو پیاوە نزیکبونەوە لەوشارە حەبیبی نەجاریان بینی مەڕی ئەلەوەڕاند، پرسیاری لێ کردن: ئێوە چ کەسن وچ شتێکتان مەبەستە ؟ئەوانیش هەواڵیان دایە ووتیان: ئێمە نێرراوی عیسا پێغەمەرین بەفەرمانی خوا ئێمەی نادروە بۆلای دانیشتوانی خزمی تۆ لەم شارەدا، حەبیب ووتی: نیشانەی ڕاستی خۆتانتان لایە، ووتیان: بەلێ ئێمە بەدەستوری خوای مەزن نەخۆش ڕزگار ئەکەین لەنەخۆشیەکەی، کوێرو بەلەکاوی چاك ئەکەینەوە، حەبیس کوڕێکی هەبوە ماوەی دووساڵ نەخۆشبوە، دەستیان هێنا بەسەریا چاك بویەوە، دوایی حەبیب باوەڕی هێنا، هەواڵ و دەنگ وباسی ئەو دووپیاوە بلاوبویەوە بەناو شاردا دەنگ و باسیان گەیشتە لای پاشاو، بانگی کردن و پرسیاری لێ کردن:ئایا ئێوە جگەی خوای ئێمە خوایێ ترتان هەیە؟ ووتیان: بەلێ ئەو خوایە کەتۆو خواکانی تۆی دروست کردوە خوای ئێمە وخوای تۆیشە، پاشا زۆر تورەبو، فەرمانی دا بەدارکاریان وبەند کردنیان.

لەپاشا عیسا سەرۆکی یاریدەرانی خۆی نارد کەناوی ( شەمعون ) بو بۆلای دانیشتوانی ئەو شارە ویاریدانی ئەو دووپیـاوە، شـەمعون پیـاوێکی زیـرەك وژیـرو زانـا بـو،بـەجۆرێکی نـهێنی ونەناسراو چوە ناوشارەوە. تێکەڵاوی دارو دەستەی پاشای کـرد، بـەمرۆڤێکی ژیـر هاتـە پێش چاویـان و، گەیاندیانـە لای پاشـا، ئـەویش بـەپیاوێکی تێگەیشـتوو هاتـە پێـش چـاوی و، بوبەیەکی‌لەپیاوە تایبەتیەکانی پاشا. ڕۆژێ شەمعون ووتی: پاشـا : بـەمن گەیشـتوە دوو پیاوتـان بەند کردوە، ئایا جەنابتان گفتوگۆتان لەگەڵ کردوون و، گوێت لەمەبەستی ئەوان گرتوە؟ پاشا ووتی : لەکاتی تورەیدا بووم و پرسیارم لێ نەکردن، داوای لەپاشـا کـرد بانگیـان بکـا بـۆلای خۆی، پاشا فەرمانی دا بەهێنانیان و شەمعون لای پاشا ووتی: ئێـوە چ شـتێ ئەپەرسـتن؟ ووتیـان خوایەکی تاك و تەنها کە هەموو بونەوەران ئەو دروستی کـردوون و هاوبەشـی نیـە ، شـەمعون ووتی : درێژە بەگفتوگۆ مەدەن ، بەکورتی باسێکی ئەو خوایەمان بۆ بکەن، ووتیـان: خوایەکـە هەرشتێکی مەبەستبێ ئەیکا، شەمعوون ووتی: نیشانە وکـاری پەکخـەرتان چ شـتێکە؟ ووتیـان: هەرشتێ پاشا داوای بکا جێ بەجێی ئەکەین: کورێکی کوێریان هێنا کە جێگەی چـاوی نـەبوە، دەستیان بەسەریا هێناو جێگەی چاوی بۆ دروست بو، دوو چاوی‌شی بۆ پەیدا بوو ئـەیان بینـی، شەمعون بەپاشای ووت: ئەگەر تۆ داوای شتێکی وا لەخوای خۆت بکەی ئـەتوانێ بیکـا، پاشـا ووتی لەتۆ پەنهانیە ناتوانێ شتی وابکا ،خـوای ئێمـە نابینـێ ونابیسـێ. سـوود و زیـان بەکـەس ناگەیەنن. لەپاشا شەمعون ووتی بەو دوو کەسە: ئەگەر ئێوە بتوانن مردوو زیندوو بکەنەوە ئێمە باوەڕتان پێ ئەهێنین، منالێکیان هێنا حەوت ڕۆژ مردبوو ، لەخوا پاڕانەوەو کوڕەکـە هەڵسـایە سەرپێ و زیندوو بویەوە، دوایی پاشاو تاقمەکەی باوەڕیـان هێنـاو .خـوای مـەزن لـەو باریـەوە ئەفەرموێ :

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم

مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُوا طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ أَئِن ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾

﴿ وَ أضرِبْ لَهُمْ مَثَلا أصْحابَ الْقَريَـةِ إذْ جاءَهـا الْمُرْسَلُونَ ﴾ وەتـۆ ڕوون بکـەرەوە بـۆ دانیشتوانی مەکەو بێ باوەڕان وێنەی دانیشتوانی گوندی ئەنتاکیە کاتێ چو بۆلایان نێرراوەکانی عیسا لەهاوڕێ هەڵبژێراوەکانی ، لەبەرئەوەی دانیشتوانی مەکە پەند وەرگرن.

﴿ إذْ أرْسَلْنا إلَيْهِمْ اثنين فَكَذَّبُوهُما فَعَزَزْ بِثالِثٍ ﴾ کاتـێ ئێمـە ناردمـان بـۆلای دانیشـتوانی ئەنتاکیـە دوو کـەس لەقوتابیـەکانی عیسـا لەپێشـەوە بـۆ ڕاگـەیاندنی پـەیامی خۆیـان، دوای ڕاگەیاندنی پەیامەکە دانیشتوانی ئەو شارە ئەو دوو کەسـانەیان بەدرۆخستـەوە، دوای لێدانیـان بەند کردنیان. زانایان بیریان جیاوازە لەڕوون کردنەوەی ناوی ئەو دووکەسانە: ئەوەی گرنـگ بێ ئەو دوو کەسە نێررابون وبەدرۆیان خستبونەوە، دوایی ئێمە بۆ بەرز کردنەوەی هورەی ئـەو دوو کەسە و بەهێزکردنی دەرونیان کەسێ تری سێهەمان ڕەوانە کرد بـۆ ئـەو شـارە ، زانایـان ئەڵێن: ناوی ئەو کەسەی سێهەم شەمعون بو گەورەی قوتابیەکانی عیسا بو، دوایی لەنێوان ئـەو سێ کەسەو لەنێوان دانیشتوانی ئەو گوندەدا ئەم گفتوگۆیانەی خوارەوە هاتوە چوی پێ کرا بەم جۆرە :

﴿ فَقالُوا إنّا إلَيْكُمْ مُرْسَلُونَ ﴾ دوایی ئەو سـێ کەسـانە بەدانیشـتوانی ئـەو گوندەیـان ووت بەڕاستی ئێمە ڕەوانە کراوین بۆلای ئێوەی دانیشتوانی ئەنتاکیـە، بۆئـەوەی خـوای تـاك وتەنـها بپەرستن و واز لـەبت پەرستی بهێنن.

﴿ قالُوا ماأنْتُمْ إلاّ بَشَرٌ مِثْلُنا وَ ما أنْزَلَ الرَّحْمنُ مِنْ شَيءٍ إنْ أنْتُمْ إلاّ تَكْذِبُونَ ﴾ دانیشتوانی ئەنتاکیە ووتیان بەو سێ کەسانە: ئێوە نێرراوی خوا نین و مەگەر ئادەمیزادێکن بەوێنەی ئێمە ئەخۆن و ئەخۆنەوەو ئەگەڕێن بەبازاڕدا، ڕێزێکی تایبەتیتان نیە شایستەی ئەوە بێ پەیامی خوا بەتایبەتی بۆ ئێوە بەنێرێ و، خوای خاوەن بەخشندە هیچ سروشێکی نەناردوە بۆلای ئێوە، ئێوە هیچ کەسێ نین مەگەر ئێوە درۆ ئەکەن لەم داواکارییەی خۆتانا و، خوا فەرمانی نەداوە بەئێوە کە هیچ شتێ ڕاگەیەنن بەئێمە.. ئەو سێ کەسانە کۆڵیان نەداو ماندو نەبون بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا .

﴿ قالُوا رَبُّنا يَعْلَمُ إنّا إلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ وَما عَلَيْنا إلاّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ ﴾ ووتیان :پەروەردگاری ئێمە ئەزانێ بەڕاستی ئێمە نێرراوین بۆلای ئێوەو درۆ ناکەین و، هیچ شتێ لەسەر ئێمە نیە مەگەر ڕاگەیاندنی ئاشکرا بەئێوە بگەیەنین و، ئەوەیش بزانن بەهۆی دەستوری خواوۆ کوێر و بەڵەکاوی چاك ئەکەینەوەو مردوو زیندو ئەکەینەوە، دوایی ئێوە داوای چ شتێ لەئێمە ئەکەن و بۆ باوەڕناهێنن ؟

﴿ قالُوا إنّا تَطَيَّرْنا بِكُمْ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَ لَيَمَسَّنَّكُمْ مِنّا عَذابٌ ألِيمٌ ﴾ دانیشتوانی شاری ئەنتاکیە ووتیان: بەڕاستی ئێمە خراپی وبەدفەڕی بەئێوەوە ئەبینین کەبەبۆنەی نەگبەتی ئێوەوە باران نابارێ و تووشی گرانی بوین و کشت وکاڵمان ووشکبوەو، سەرەڕای ئەوە ئێوە داوای شتێکی زۆر گەورە ئەکەن . بەڕاستی ئەگەر ئێوە کۆتایی بەم داواکاریە درۆینە نەیەرن ئێمە ئێوە بەردەباران ئەکەین و سزایەکی زۆر ئاازردەر لەلایەن ئێمەوە تووشی ئێوە ئەبێ ئەگەر نەیشتان کوژین.

﴿ قالُوا طائِرُكُمْ مَعَكُمْ أئِنْ ذُكِّرْتُمْ بَلْ أنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ ﴾ قوتابیەکانی عیسا بەدانیشتوانی ئەو گوندەیان ووت: بەدفەڕی و خراپەی ئێوە لەگەڵ خۆتانە. ئایا ئەگەر ئێوە ئامۆژگاری بکرێن و بترسێنرێن لەسزای خوا لەلایەن ئێمەوە، بۆ ئەبێ هەڕشە لەئێمە بکەن و خراپە بدەنە پاڵ ئێمە، ئەو کارەی ئێمە خراپ نیە. بەڵکو ئێوە تاقمێکن لەسنور لاتان داوەو بێ فەرمانی خوا ئەکەن و هاوبەشی بۆ دائەنێن. کەواتە هاتنی خرایە بۆلاتان بەهۆی خراپی خۆتانەوەیە. نەك لەلایەن ئێمەوە .

﴿ وَجاءَ مِنْ أقْصى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعى قالَ ياقَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾ وەلەلای دورترین جێگەی ئەو شارەوە پیاوێ ڕای ئەکرد ،ووتی: ئەی تاقمی من و دانیشتوانی شار: ئێوە دوای ئەو نێراوانەی خوا بکەون کەداوای خوا پەرستیتان لێ ئەکەن.

زانایان ئەڵێن: ئەو پیاوە ناوی حەبیبی نەجار بو کەکاتێ نێرراوەکانی عیسا هاتنە نزیکی شارەکەوە باوەڕی بەخوا هێنابو لەسەر دەستی ئەوان.

﴿ اتَّبِعُوا مَنْ لا يَسْألُكُمْ أجْراً وَهُمْ مُهْتَدُونَ ﴾ ئێوە داوای کەسێ بکەون داوای هیچ کرێیە لەئێوە ناکا لەسەر گەیاندنی پەیامی خۆیان و ئەو نێرراوانە شارەزایی و ڕانومایی یان وەرگرتوە

بۆلای بەختیاری هەردوو جیهان ئەو نێرراوانە شارەزای ڕێگەی ڕاستن و ئەتان گەیەننە چاکەو بەختیاری هەردوو جیهان، دانیشتوانی ئەو شارە بەو پیاوەیان ووت: ئایا تۆ لەسەر ئاینی ئەوانی ؟ ووتی:

﴿ وَ مالي لا أعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ وە چ شتێکە ڕێگە بگرێ لە من خوایەکی ئەوتۆ بپەرستن کەمنی دروست کردوە لەنەبونەوەو، ئێوە لەدوای مردن بۆلای ئەو ئەگێڕرێنەوە لەڕۆژی دواییدا بۆ پرسیار کردن و، پاداشتی کردەوەکانتان ئەداتەوە؟ بۆ ئێوە هاوبەشی من ناکەن لەپەرستنی خوادا ؟

﴿ أتَخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً إنْ يُرِدْنِ الرَّحْمانُ بضر لاتُغْن عَنّي شَفاعَتُهُمْ وَلا يُنْقِذُون ﴾ ئایا من چۆن جگەی خوا لەبتەکانی ئێوە وەرئەگرم بەخوا ؟ ئەگەر خوای خاوەن بەخشندەی من بیەوێ من تووشی زیانێ بکا، پاڕانەوەی ئەو خوایانەی ئێوە هیچ سودێ بەمن نابەخشن و، من ڕزگارناکەن لەو زیانەتووشی من بوە.

﴿ إنِي إذاً لَفِي ضَلالٍ مُبِيْنٍ ﴾ بەڕاستی ئەگەر من لەجگەی خوا بپەرستم و ، شتێ هەڵبژێرم بۆ خۆم خاوەنی سودو زیان نەبن ئەو کاتە من لەناو گومراییەکی ئاشکرادام.

﴿ إنِي آمَنْتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ ﴾ بەپەلە ئەو پیاوە ڕۆیشت بۆلای نێرراوەکان و، ووتی: بەڕاستی من باوەڕم هێناوە بەپەروەردگاری ئێوە، دوایی ئێوە گوێم لێ بگرن وبیبیسن وشایەتیم بۆ بدەن.

﴿ قِيْلَ ادْخِلَ الْجَنَةَ قالَ يالَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ بِما غَفِرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِيْنَ ﴾ بەلام تاقمی ئەو پیاوە بەردەوام بوون لەسەر بێ باوەڕی وبەردەبارانیان کردو کوشتیان و،ئەی ووت: ئەی خوای من: تۆ ڕانومایی ئەم تاقمەی من بکە بۆلای پەرستنی خۆت، دوایی لەکاتی مردنیدا بەو پیاوە بێژرا : خوا بەهەشتی کردوە بەبەشی تۆ بڕۆرە ناویەوەو، ووتی: خۆزگایە: ئەو تاقمەی من ئەیانزانی بەوەی پەروەردگاری من لەمن خۆشبوەو، منی گێڕاوە بەیەکێ لەوکەسانە ڕێزیان گیراوەو، منی ناوەتە ناو بەهەشت، بۆئەوەی وازیان لەبێ باوەڕی بهێنایەو، بەوێنەی من تووشی ڕەزامەندی خوا ببونایەو بەم پلەیە بگەیشتنایە.

زانایان بیریان جیاوازە لەپاشەڕۆژی پاشاو دانیشتوانی شار: هەندێکیان ئەڵێن: هەمویان باوەڕیان هێنا، هەندێ تریان لایان وایە هەمویان باوەڕیان نەهێنا، هەندێ تر لەزانایان لایان وایە بوون بەدوو بەشەوە: هەندێکیان باوەڕیان هێنا، هەندێ تریان لەسەر بێ باوەڕی و بت پەرستی مانەوە. ئەوەی شایانی باسبێ ، خوای مەزن لەوبارەوە هیچ شتێکی ڕوون نەکردوەتەوە، ئێمە پێویستە لەسەرمان باوەڕی بێگومانمان هەبێ بەو ڕوداوەو، پاشەڕۆژی دانیشتوانی شار هەر خوا ئەیزانێ .

**بەیاریدەی خوا کۆتایی پێ هات ( ٢٠/٦/ ٢٠٠٠) ی زایینی**

**(١٨) ی ڕەبیعولئەوەڵی ١٤٢١ ی کۆچی**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس وستایشی بی پایان بۆ خـوای هـەمو بونـەوەران درودی زۆر لـەسەر پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمەری ئیسـلام و لـەسـەر یـارو یـاوەران و خـێزانی وئۆمەتی بێ .

وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾

﴿ وَما أنزَلنا عَلى قَوْمِهِ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ جُنْدٍ مِنَّ السّماءَ وَ ماكُنّا مُنْزِلِيـنَ ﴾ وە ئێمـە ڕەوانـەمان نەكرد بۆسەر تاقمی حـەبیبی نـەجار دوای مردنـی بـۆ لـەناوبردنی تاقمەكـەی هیـچ لـەشكرێ لـەئاسمانەوە بۆ لـەناوبردنیان و، بۆ ئێمە شایستە نیە فریشتەكان بنێرینە خوارەوە بۆ لــەناوبردنیان. ناردنە خوارەوەی فریشتەكان بۆ كارێكی گەورەیە، وەك نادرنـە خوارەوەیـان لـەڕۆژی بـەدر و ڕۆژی ئەحزابدا و، لـەڕۆژی حونەیندا لـەبەر ڕێزی پێغەمەر .

﴿ إنْ كانَتْ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً فَإذا هُمْ خامِدُونَ ﴾ سزایە هاتە خوارەوە بۆ لـەناوبردنی تـاقمی حەبیبی نەجار یەك دەنگی زۆر سەخت بو لـەلایەن جبرەئیلـەوە،دوای ئەو دەنگە هەمویان مـردن وجولـەیان نەما.

﴿ یا حَسْرَةً عَلی عِبادِ ما یَأتِیهِمْ مِنْ رَّسُولٍ إلاّ کانُوا بِهِ یَسْتَهْزِؤُونَ ﴾ ئەی داخ وخەفەت بۆ بەندە بێ باوەڕەکان:نایە بۆلایان هیچ پێغەمەرێ داوایان لی بکەن باوەڕبهێنن مەگەر ئەوان گاڵتەئەکەن بەو پێغەمەرە.

﴿ ألَمْ یَرُوا کَمْ أهْلَکْنا قَبْلَهُمْ مِنَ الْقُرُونِ أنَّهُمْ إلَیْهِمْ لا یَرْجِعُونَ ﴾ ئایا دانیشتوانی مەکە نەیانزانیوە ئێمە چەندین نەتەوەی زۆرمان لەناوبردوە لەدانیشتوانی خولەکانی پێشو بەر لەدانیشتوانی مەکە، چونکە پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆئەخستەوە. بەڕاستی ئەو تاقمانەی پێشوو دوای لەناوبردنیان ناگەڕێنەوە بۆلای ئەوان لەجیهاندا .

﴿ وَإنْ کُلٌّ لَمّا جَمِیعٌ لَّدَیْنا مُحْضَرُونَ ﴾ وەبەڕاستی ئەوانە هەموویان کۆئەکرێنەوە لەلای ئێمە لەڕۆژی دواییدا دوای زیندوبونەوەیان ، ئامادەئەکرێن بۆ پرسیارو پاداشت. کەواتە مردنیان جێگەی ئاسودە نیە.

﴿ وَآیَةٌ لَّهُمُ الأَرْضُ الْمَیْتَةُ أحْیَیْناها وَ أخْرَجْنا مِنْها حَبّاً فَمِنْهُ یَأْکُلُونَ ﴾ وەبەڵگە بۆ دانیشتوانی مەکە لەسەر زیندو بونەوە زەویەکی مردوی بێ گیاو بێ سەوزاییەئێمە زیندووی ئەکەینەوە بەجۆرێ شایستە بێ بۆ سەوز بونی گیاو هەمو ڕوەکێ و، ئێمە هێناومانەتە دەرەوە لەو زەویە مردوە ووشکە دانەوێڵەیە، دوایی ئەوان ئەو دانەوێڵەیە ئەخۆن وپێی ئەژین .

﴿ وَجَعَلْنا فِیْها جَنّاتٍ مِنْ نَخِیلٍ وّ أعْنابٍ وَفَجّرْنا فِیْها مِنَ الْعُیُونِ ﴾ وەئێمە پەیدا ئەکەین لەڕوی ئەو زەویەدا چەندین باخ و بێستان لەخورما و لەترێ و، ئێمە هەڵئەقوڵێنین لەو زەویەدا چەندین کانیاو باخەکانیان پی ئاودەدەن.

﴿ لِیَأکُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ وَما عَمِلَتْهُ أیْدِیهِمْ أفَلا یَشْکُرُونَ ﴾ لەبەرئەوەی ئەوان لەومیوەیە بەهۆی ئاوەوە پەیدا ئەبێ و لەو شتەی ئەوان بەدەستی خۆیان پەیدای ئەکەن بیخۆن: لەهەنگوین و سرکەو دۆشاوی هەمەجۆرە شیرینی و زۆر شتی تر، ئایا دوایی بۆ ئەوان سوپاسی ئەو هەموە چاکانە ناکەن خوا بەوانی بەخشیوە؟ ڕستەی ﴿ وَما عَمِلَتْهُ أیْدِیهِمْ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە دارایی ڕەوا ئەوەیە بەئارەقی ناوچاوان وماندو بونی ئەندامەکان پەیدا بکرێن .

﴿ سُبْحانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْواجَ کُلَّها مِمّا تُنبتُ الأَرْضَ وَمِنْ أنْفُسِهِمْ وَمِمّا لایَعْلَمُونَ ﴾ ئێوە کەسێکی ئەوتۆ دووربخەنەوە لەشتێ شایستەی ئەو نەبێ وەك مناڵ و هاوبەش لەپەرستن و دروستکردنی بونەوەران، ئەو خوایە هەمو جۆرە هاوجوتێکی دروستکردوە لەشتێ زەوی پەیدای ئەکا لەدرەخت ولەبەروبوم و دانەوێڵە، لەخۆتان بەهۆی چونە لای نێرو مێ بۆلای یەکتری و زاوزێ ئەکەن و، لەشتێ ئێوە نایزانن لەناو زەوی ودەریاداو، لەهێزی نێرومێی کارەباو، لەبەیەك گەیشتنی نێرو مێی گیاندارانی تر.

بۆ زانین: خوای مەزن هەروەك لە گیاندارانا نێرو مێی دروست کردوە، لەدرەخت و ڕوەکیشدا نێرو مێی دروست کردوە بەهۆی باو مێرولەو شتی ترەوە متوربە ئەبن وبەروبوم فەراهەم دێنن. بێگومان ئەوانە هەمو بەهۆی توانای خوای مەزنەوەیە نەك بەرێکەوت. لەبەر مانەوەی ئەو شتانە وپێش کەوتنیزانست وشارستانی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی.

وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾

﴿ وَآيَةٌ لَهُمُ الَّيلُ نَسلَخُ مِنهُ النَّهارَ فَإذا هُمْ مُّظلِمُونَ ﴾ وەبەڵگەیەکی زۆر گەورەو سەرسوڕێنەر لەسەر توانا ویەکێتی ئێمە بۆ بێ باوەڕان ئەوەیە: ئێمە بونەوەرانمان دروست کردوە لەسەر پەیڕەو پرۆگرامێکی زۆر سەرسوڕێنەر کە ئێمە ڕوناکی ڕۆژ لائەبەین و تاریکی شەو لەجێگەیدا دائەنێین، دوایی ئەوان ئەکەونە ناو تاریکیەوە.. یانی شەو ورۆژ دێن بەدوای یکداو، زەوی خڕەو ئەسوڕێتەوە بەم لاولای خۆردا، ئەو لایەی زەوی بەرانبەر بەخۆرە ئەبێ بەڕۆژ، ئەو لایەکەی تری ئەبێ بەشەو، دوای سوڕانی زەوی ئەولاکەی تری بەرانبەر بەخۆر ئەوەستێ ئەبێ بەڕۆژ و ئەو لاکەی ئەبێ بەشەو ، هەروەها.

﴿ وَ الشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقِرِ لَها ذلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيْمِ ﴾ وەبەڵگەیە تر لەسەر توانای خوا ئەوەیە: خۆر ئەڕوا هەمو ڕۆژێ بۆلای جێگەیەکی دیاری کراو بۆ وەستانی ، لەخۆرهەڵات و خۆر نشینداو، بۆخۆر هەیە لەهەمو ڕۆژێکا جێگەیە بۆ هەڵهاتنی و ، جێگەیە بۆ ئاوابوونی ، لەپاشا خۆر نایەتەوە بۆلای ئەو جێگانە لەساڵی داهاتوودا نەبێ لەهەمان کاتدا، ئەو ڕۆیشتنەی خۆرە بەو جۆرەو، پەیدا بوونی شەو ورۆژبەدوای یەکتریدا بەدیاری کردنی خوایەکی زۆر گەورەو بەدەسەڵاتە ، هەموو شتێ ئەزانێ .

خاوەنی نامەی ﴿ القرآن والعلم الحديث ﴾ کەیەکێکە لەزانا گەورەکانی ئاسمان ناسینی ئەم سەردەمە ئەڵێ: ( خۆر بەتیژی ئەڕوا لەیەك چرکەدا ( ١٢ میل ئەبڕێ، جگە گەڕانی خۆی بەدەوری خۆیا و، ئەو گەڕانەی خۆی جیاوازە لەو گەڕانەی زەوی بەدەوری خۆردا.

﴿ وَالقمَرُ قَدَرْناهُ منازل حَتّی عادَ کالعُرْجُونِ الْقدِیْمِ ﴾ وەبەڵگەیە تر لەسەر توانای خوای مەزندا ئەوەیە: ئێمە دیاریمان کردوە بۆ ڕۆیشتنی مانگ چەند جێگەیە، هەرەیەکە لەوجێگانە ئەبڕێ لەشەو ڕۆژێکا، ئەندازەی ئەو جێگانەی ( ٢٨ ) ڕۆژە ،. هەروەها مانگ ئەڕوا هەتا ئەکاتە دواهەمینی جێگەی خۆی، بەوێنەی لقی دارخورمایەکی کۆنی چەماوەی لێدێ، لەپاشا مانگ بۆماوەی دوو شەو وون دەبێ ئەگەر مانگ ( ٣٠ ) ڕۆژ بێ و، بۆماوەی یەك ڕۆژ ئەگەر ( ٢٩ ) ڕۆژ بێ . ئەو جێگانەی مانگ ناگۆڕێن بەجگەی خۆیان و، لەجێگەی خۆیان دەرناچن. ئاسمان ناسەکان ئەڵێن: ئەو جێگانەی مانگ ( ٢٨ )جێگەن مانگ هەرشەوێ لەیەکێ لەو جێگانەدایە مانگ لەکۆتاییدا دووشەو وون ئەبێ ئەگەر مانگ ( ٣٠ ) ڕۆژ بێ ، شەوێك وون ئەبێ ئەگەر ( ٢٩ ) ڕۆژ بێ. لەو کاتانەدا وون ئەبی وەك لقی دارخورمایەکی باریکی چەماوەی لێدێ.خۆرو مانگ هەریەکەیان بەگوێرەی پەیڕەو دیاری کراوی خۆیانا ئەڕۆن بەشوێنی خۆیانا.

﴿ لا الشَّمْسُ یَنْبَغِي لها أنْ تُدْرِكَ الْقمَرُ وَلاالَّیْل سابِقُ النَّهار وَکُلٌّ فِي فَلَكٍ یَّسْبَحُونَ ﴾ نەبۆ خۆر دروستە یا ئاسانە بگاتە مانگ و ، کۆببێتەوە لەگەڵیا لەشەودا لەو کاتەدا دیاری کراوە بۆ مانگ و ، نەشەویش پێشی ڕۆژ ئەکەوێ لەکاتی کۆتایی ڕۆژدا ، بەڵکو هەریەکەیان ئەڕۆنبەبازنەی دیاری ئاسمانی خۆیانا بەگوێرەی پەیڕەوێ بۆیان دیاری کراوە لەلایەن خوای مەزنەوە.

﴿ وَآیَةٌ لَهُمْ أنّاحِمَلْنا ذُرِّیَتَهُمْ فِي الْفَلَكِ الْمَشْحُون ﴾ وەبەڵگەیە تر لەسەر توانای ئێمە بۆ دانیشتوانی مەکە ئەوەیە: کەبەڕاستی ئێمە باوباپیری ئەوان و هەمو وئادەمیزادمان لەناو ئەو کەشتیەی پڕکرابو لەوانەی خرابونە ناوی لەکاتێکا ئاو هەمو ڕوی زەوی داگرت لەسەردەمی نوحداو، ئەگە نەخرایانە ناوی هەمویان ئەخنکان و ئادەمیزاد بنەبڕ ئەبوون .

﴿ وَخَلَقْنا لَهُمْ مِنْ مِثْلِهِ مایَرْکَبُونَ ﴾ وەئێمە دروستمان کردوە بۆ ئادەمیزاد لەوێنەی کەشتی نوح چەند شتێ تر بۆئەوەی سواریان بن لەکاتی پێویستدا و، کەل وپەلی خۆیانیان بخەنە سەریان، وەك هوشتر و هێسر و شتی تریش، ئێمە خستومانەتە مێشکیان چەندین شتی تر دروستبکەن بۆئەوەی بچنە ناویان لەدەریاو دەشت و هەوادا وەك پاپۆرو ئوتومبیل و فرۆکەو شتی تریش .

﴿ وَإنْ نَشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلا صَرِیْخَ لَهُمْ وَلاهُمْ یَنْقِذُونَ إلاّ رَحْمَةٌ مِنّا وَمَتاعاً إلی حِیْنٍ ﴾ وەئەگەر ئێمە ئارەزوومان ببێ بێ باوەڕان ئەخنکێنین و، کەل وپەلیان بن ئاو ئەکەین ، دوایی هیچ کەسی ناگاتە فریایان و ڕزگاریان بکا لەخنکاندان و، ئەوان ڕزگاریان نەئەبو لەمردن مەگەر لەبەر بەزەیی خوا ڕزگاریان ئەبی و لەبەرئەوەی ڕابوێرن لەجیهاندا بەخۆشی هەتا کاتێ دیاری کراوە بۆ مردنیان .کەواتە ئەبێ لەکاتی ڕابواردن و خۆشیانا لەسزای خوای مەزن بترسین .

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾

وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾

﴿ وَإذا قِيلَ لَهُمْ اتَّقُوا مابَيْنَ أيْدِكُمْ وَما خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ وەهەر کاتێ بێژرا بەبێ باوەڕان: ئێوە لەسزایە بترسن لەجیهاندا توشتان ببێ ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لەسەر بێ باوەڕی، وەك چۆن تووشی گەلانی پێش ئێوە بو، چونکە ئەوانیش پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوەو ئێوە لەسزای ڕۆژی دوایی بترسن، لەبەرئەوەی ئێوە بەئومێدی ئەو ەبن خوا میهرەبانیتانلەگەڵ بکاو لەگوناهەکانتان ببورێ، چونکە ڕزگار بون هەربەمیهرەبانی خواو لەخوا ترسانە.

﴿ وَماتأتِيهِمْ مِنْ آيَةٍ مِنْ آياتِ رَبِّهِمْ إلا كانُوا عَنْها مغرمين﴾ وەنایە بۆلای بێ باوەڕان هیچ ئایەتێ لەئایەتەکانی قورئانی پەروەردگاری ئەوان باسی کارە گەورەکانی خواو، چاکەی خوا بکا بەسەر ئەوانەوە مەگەر ئەوان ڕویان لێ وەرئەگێڕن و باوەڕیان پێ ناهێنن.

﴿ وَإذا قِيلَ لَهُمْ أنْفِقُوا مِمّا رَزَقَكُمْ اللهُ ﴾ وەهەر کاتێ لەلایەن پێغەمەرەوە بێژرایە بەبێ باوەڕان: ئێوە هەندێ لەو شتانە خوا بەئێوەی بەخشیوە بیدەن بەهەژارانی موسڵمانانی خزمی خۆتان.

﴿ قَالَ الَّذِيْنَ كَفَرُوا لِلَّذِيْنَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَنْ لَوْ شاءَ اللهُ أَطْعَمَهُ ﴾ ئەو کەسانەی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە گاڵتەکردنەوە بەوکەسانەی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە ئەڵێن: کاتێ خوا توانای هەیە خواردەمەنی بدا بەهەرکەسێ هەژارەو نەیداتێ، ئایا ئێمە شایستەترین خواردەمەنی نەدەینێ؟ ئیتر داوای خواردەمەنی لەئێمە نەکاو، کاتێ خوا بیەوێ هەژار بێ، ئێمە چۆن ڕۆزی ئەدەین بەو کەسە .

﴿ إنْ أَنْتُمْ إلاّ فِي ضِلالٍ مُبِيْنٍ ﴾ دوایی ئێوەی بت پەرست لەگومڕاییەکی زۆر ئاشکرادان، پەنهان نیە لەسەر هیچ کەسێ، خوای مەزن ڕۆزی هەژارانی پێویست کردوە لەسەر دارایی ساماندراران، چونکە خوا مافێکی تایبەتی پێویست کردوە لەناو دارایی ساماندارانداا بۆ هەژاران ،هەموو شتێ هەر هی خودایە.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هذا الْوَعْدُ إنْ كُنْتُمْ صادِقِيْنَ ﴾ وەبت پەرستان ئەڵێن: چ کاتێ ئەو زیندو بونەوەیە ئێوەی باوەڕدار گومان ئەبەن هەیە دێت، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن هەیە؟ خوای مەزن وەڵامیان ئەداتەوەو بەڕاستی ئەو بەڵێنە بێگومانە دێت و، کوتوپڕ تووشی ئەوان ئەبێ و ئاگایان لەخۆیان نیە.

﴿ مايَنْظُرُونَ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخْصِمُونَ ﴾ ئەو بێ باوەڕانە ناوەستن وچاوەڕواناکەن مەگەر کاتێکی زۆر کەم و، ئیسرافیل تەنها دەنگێکی زۆر سەخت ئەکا بەسەریانان، دوایی ئەوە لەناو ئاسمانەکان و زەویدان ئەمرن جگەی هەندێ لەفریشتەکان نەبێ و، ئەوان لەناو یەکتریدا گفتوگۆ لەکاروبار و بازرگانی خۆیان ئەکەن، ئەو بەڵێنەی خوا بەدڵیانا نایەو ،بەو دەنگە سەختە هەموویان ئەمرن و دڵیان پارچە پارچە ئەبێ.

﴿ فَلا يَسْتَطِيْعُونَ تَوْصِيَةً وَّلا إلى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ دوایی ئەوان توانای ئەوەیان نیە هیچ گفتوگۆیەك و ڕاسپاردەیەك بکەن، بائەوپەڕی پێویستیان پێیان هەبێ و، توانای ئەوەیان نیە بگەڕێنەوە بۆلای خێزانەکان وبۆلای بازاڕ . بەڵکو ئەمرن هەربەوجۆرەی مردوون.

﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّوَرِ فَإذاهُمْ مِنَ الأَجْداثِ إلى رَبِهِمْ يَنْسِلُوْنَ ﴾ وە لەلایەن ئیسرافیلەوە فو ئەکرێ بەسوردا بۆ جاری دووهەم، دوایی ئەوان زیندو ئەبنەوە لەڕۆژی دواییداو، هەمویان لەگۆڕەکانیان دێنەوەو، زۆر بەگورجی ڕائەکەن بۆلای فەرمانی پەروەردگاری خۆیان.

بۆ زانین: ئیسرافیل دووجار فو ئەکات بەسوردا: جاری یەکەم هەمو گیانداران ئەمرن، وەك لەئایەتی پێشودا باسی کرا، جاری دووهەم هەمو گیانداران دوایی زیندو ئەبنەوە.. زانایان ئەڵێن: ووشەی﴿ الصّوَر﴾ بەمانای کەڕ نایەو وێنەیە بۆ زیندوکردنەوەی مردوەکان و هاتنە دەرەوەیان لەگۆڕەکانیان. بەوێنەی وەڵامدانەوەی سەربازەکان لە کاتێکا یەکێکیان فو ئەکات بەکەڕەنادا، بۆ ئەوەی ئامادە بن بۆ مەشق، جاری دووهەم فوی پێدا ئەکات بۆ ئەوەی بڕۆن بەرەو گۆڕەپانی مەشق کردن.

﴿ قالُوا یاوَیْلَنا مِنْ بَعَثَنا مِنْ مَرْقَدِنا هذا ماوَعَدَ الرَّحْمنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ ﴾ کاتێ گیانداران زیندوو ئەکرێنەوەو ،گیان ئەکرێتەوە بەلەشیانا، بێ باوەڕان ئەڵێن: ئەی ئابروچون بۆ ئێمە و چەندە گران و سەختە ئەو سزایەی ئەوتۆ چاوەڕوانی ئێمەی ئەکرد؟ چ کەسێکە ئێمەی زیندوو کردوەو ،ئێمەی بێدار کردوەتەوە لەجێگەی خەوتنمان. ئائەمە ئەو زیندوبونەوەیە خوای خاوەن بەخشندە بەڵێنی پێدابو لەسەر زمانی پێغەمەر و، نێرراوەکانی خوا ڕاستیان کرد لەو شتە هەواڵیان پێدابو، بەئێمەیان ڕاگەیاند و بەدرۆمان خستنەوەو باوەڕمان پێ نەهێنان.

﴿ إنْ كانَتْ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً فَإذا هُمْ جَمِيعٌ لَدَيْنا مُحْضَرُونَ ﴾ ئەو فوکردنەی دوایی بەسوردا تاکە دەنگێ بۆ لەلایەن ئیسرافیلەوە، دوایی بونەوەران بەبیستنی ئەو دەنگە کۆئەکرێنەوە لەلای ئێمەو، ئامادە ئەکرێن بۆپرسیار و وەڵام و پاداشت.

﴿ فَالْيَوْمَ لاتُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَلا تُجْزَوْنَ إلاّ ماكُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئەم ڕۆژەی دوایی ترازوی دادپەروەری دائەنرێ و، هیچ کەسێ بەهیچ شتێ ستەمی لێ ناکرێ، ئیتر ئەو کەسە چاکبێ یا خراپ، ئیتر کردەوەکەی کەمبێ یازۆر ، خوای گەورە ئەیان هێنێ بۆ خاوەنەکەیان، داویی ئەو کەسە پادشتی بەهیچ نادرێتەوە مەگەر بەو شتەی بیکا، چاکبێ یاخراپ.

إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟

ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾

﴿ إنَّ أصْحابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فاكِهُونَ ﴾ بەڕاستی دانیشتوە باوەڕدارە نیاز پاكـەكانی بەهەشت لـەم ڕۆژەی دواییدا لـەناو چەند كارێكی خۆیانا ڕائـەبوێرن بـەخواردن و خواردنـەوەو شادمانن وبێ ئاگای كردوون لـەجگەی خۆیان.

﴿ هُمْ وَأزْواجُهُمْ فِي ظِلالٍ عَلَى الأَرائِكِ مُتَّكِئُونَ ﴾ شتێ تر كەئەوان زۆرتر شادمان بكاو بێ ئاگایان بكا لـەجگەی خۆیان، بەڕاستی خۆیان و ئەو ژنانەی جیهانیان لـەناو سێبەرێكی بـەردەوام لـەبەهەشتان، نەگەرمەو نەسارد، پاڵئەدەنەوە لـەسەر چەندین كورسی ڕازاوە بەپەردەو بەڕاخەر.

﴿ لَهُمْ فِيها فاكِهَةٌ وَلَهُمْ مايَدَّعُونَ ﴾ بۆیان هەیە لـەناو بەهەشتا جۆرەها میوەی خۆش وبـەتام و، بۆیان هەیە شتێ داوای بكەن و ئارەزوی بكەن ولـەخزمەت خوادا دڵخۆش وشادن.

﴿ سَلامٌ قَـوْلاً مِـنْ رَّبٍ رَّحِيْـمٍ ﴾ فریشتـەكان بـەوان ڕائەگەیـەنن فەرمودەیـــە لـەلایـــەن پەروەردگارێ میهرەبان وخاوەن بەزەییەوە كەسڵاوی خوایە لـەوان.

﴿ وَامْتازُوا الْيَوْمَ أيُّها الْمُجْرِمُونَ ﴾ كاتێ باوەڕداران ئەبرێن بۆلای بەهەشت، بە تاوان بـاران ئەبێژرێ، ئێوە جیا ببنەوە لـە باوەڕداران و، بچن بۆلای جێگەی خۆتان لـە ناو ئاگری دۆزەخ.

﴿ ألَمْ أعْهَدْ إلَيْكُمْ يابَنِي آدَمَ أنْ لاتَعْبُدُوا الشَّيْطانَ إنَّهُ عَدُوٌّ لَكُمْ ﴾ ئایا ئەی ئـادەمیزاد : مـن فەرمانم نەدا بەئێوەو ئامۆژگاریم نەكردن پەیڕەوی شەیتان نەكەن ؟ بەڵگەی زۆرم پیشان بـەئێوە نەدا لـەسەر تاك وتەنهایی خۆمدا بۆ پەرستن. بەڕاستی شەیتان دوژمنێكی ئاشكرایە بۆ ئێـوە هـەر لـەكاتی باپیرە ئادەمتانەوەو، بۆتانی ئەڕازێنێتەوە بێ فەرمانی من بكەن.

﴿ وأن أعْبُدُونِي هذا صِراطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ وەفەرمانم پێ نەدان ئێوە هەر بەتەنها مـن بپەرستن ، بەتایبەتی ئەو پەرستنەی من ڕێگەی ڕاستی بێ خوارو خێچەو، ئاینێكە شـارەزایتان ئـەكا بـۆلای ڕاستی ؟

﴿ وَلَقَدْ أضَلَّ مِنْكُمْ جِبِلاًّ كَثِيْراً أفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُـونَ ﴾ وەبەڕاسـتی شـەیتان تـاقمێكی زۆری لـەئێوە لاداوە لـەڕێگەی ڕاستی ئاین. ئایادوایی بۆ ئێوە بیر ناكەنەوە لـەناوبردنی گەلانی ڕابـوردو كەبەهۆی پەیڕەوی شەیتانەوە لـەناوچون.

﴿ هذهِ جَهَنَّمُ الَّتِي تُوعَدُونَ إصْلَوها الْيَوْمَ بِما كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ ئائەمە ئەو دۆزەخەی ئەوتۆیە كە بەڵێنی پێ درابو لـەسەر زمـانی پێغەمـەران كـەبۆ ئـەو كەسـانەیە پـەیڕەوی شـەیتانن و،واز لـەپەرستنی من ئەهێنن، ئێوە بچنە ناو ئەو دۆزەخەوەو، سزاكەی بچێژن بەهۆی ئەوەوە باوەڕتـان بەبونی دۆزەخ نەبو لـەجیهانانا.

﴿ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْواهِهِمْ وَتُكَلِّمُنا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِما كانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ ئێمە لەم ڕۆژەدا مۆر ئەدەین بەسەردەمی تاوانبارانداو، گفتوگۆیان لێ قەدەغە دەکەین، چونکە باوەڕیان بەئێمەو پێغەمەران نەهێنابو لەجیهانداو، ئێمە دەستەکانیان ئەهێنینە گفتوگۆو ئەو شتەی کردویانە ئەندامەکانیان ئەیلێن و، پێکانیان شایەتی ئەدەن بەشتێ ئەیکەن لەجیهاندا.

﴿ وَلَوْ نَشاءُ لَطَمَسْنا عَلَى أَعْيُنِهِمْ فَاسْتَبَقُوا الصِراطَ فَأنى يُبْصِرُونَ ﴾ وەئەگەر ئێمە ئارەزو وبکەین چاوی بێ باوەڕان کوێر ئەکەینو جێگەکەی نایەڵین، دوایی ئەیانەوێ بڕۆن بۆلای ڕێگەیە لەوەوبەر بەوا ڕۆیشتوون، دوایی چۆن تووشی ئەو ڕێگەیە ئەبن دوای کوێر بونیان.

﴿ وَلَوْ نَشاءُ لَمَسَخْناهُمْ عَلَى مَكانَتِهِمْ فَما اسْتَطاعُوا مضيها وَلايَرْجِعُونَ ﴾ وەئەگەر ئێمە ئارەزوو بکەین بەڕاستی ئێمە شێوەو ڕەنگی بێ باوەڕان ئەگۆڕین لەجێگەی خۆیاناو، هێزو توانایان پوچ ئەکەینەوە، دوایی ئەوان توانایان نامێنێ بەرەوپێش بڕۆن و، ناتوانن بەرەودوایش بگەڕێنەوە نەبەلای ڕاستاو نەبەلای چەپا.

﴿ وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلا يَعْقِلُونَ ﴾ وە هەرکەسێ ئێمە تەمەنی درێژ بکەین ومۆڵەتی بدەین تەمەنی درێژ بێ، ئێمە شێوەی دروستبونی ئەو کەسە ئەگۆڕین و، هێزو توانای کەم ئەکەینەوە هەتا وەك کاتی منالی لێ دێتەوە، لەشی لاواز ئەبێ و ئەقڵی کەم ئەبێتەوەو، کەوتەکار ئەبێ، ئایا دوایی بۆ بیر لەتوانای خوا ناکەنەوە، ئەو کەسەی بتوانێ دەمتان مۆربکاو شێوەتان بگۆڕێ و دوای لاوی وجوانی نەختە نەختەبەرەو پیری بتانبا، ئەتوانێ دوای مردن زیندوتان بکاتەوە بۆ پرسیار و وەڵام وپاداشت.

وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەرکاتێ قورئانی بخوێندایە، بێ باوەڕان ئەیان ووت: موحەمەددیسانەوە هۆنراوە دائەنێ ،خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوەو، ئەفەرموێ:

﴿ وَمّا عَلَّمْناهُ الْشِعْرَ وَما يَنْبَغِي لَهُ ﴾ وەئێمە هۆنراوەمان فێری موحەمەد نەکردوەو، قورئان وێنەی شیعر نیە، چونکە قورئان دورە لەئاواتی هاندەرو ئاڵۆزو، وێنە هێنانەوەی خەیاڵی و، هۆنراوە شایستەی پلەی بەرزی موحەمەد نیە، چل ساڵ پێش بوونی بەپێغەمەر نەبیسراوە هۆنراوەی دانابێ، ئەو مەرجانەی بۆ دانانی هۆنراوە دانراوە لەقورئاندا نایەتەدی، پارچە پارچە کردنی ووشەکانی وبڕگەکانی، بەگوێرەی هونەری هۆنراوە لەقورئاندا نایەتەدی.

﴿ إنَّ هُوَ إلاّ ذِكْرٌ وّ قُرآنٌ مُبِينٌ لِيُنْذِرَ مَنْ كانَ حَقّاً ﴾ ئەو شتەی ئەوتۆ موحەمەد هێناویەتیئامۆژگاری کردن و شارەزایی کردنە لەلایەن خواۆ ، قورئانێکە دەستورو بیروباوەڕو فەرمانەکانی ئایینی ئیسلام ڕون ئەکاتەوە بۆ ئادەمیزاد، خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ ئەوەی کەسێ

دڵێکی زیندوی هەیە و خاوەنی هۆشەو بیترسێنێ، نەك ئەو کەسانەی بێ ئاگـان وەك مردوانـە، چونکە ئەو کەسانە لەناوەڕۆکی قورئان ناگەن و،ئەگەر بیشی زانـن خۆیـان بەگەورەتردائـەنێن لەوەی گوێ لەقورئان بگرن.

﴿ وَ يَحِقَّ الْقَوْلُ عَلى الْكافِرِيْنَ ﴾ وەلـەبەر ئەوەیش فـەرمودەی خـوا بەسـەر بێ بـاوەڕاندا بێتەدی کە خوا فەرمویەتی: دۆزەخ پڕ ئەکەم لەجنۆکەو ئادەمیزاد.

أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنّـا خَلَقْنـاكُمْ مِمّـا عَمِلَـتْ أَيْدِينـا أَنْعاماً فَـهُمْ لَـها مـالِكُونَ ﴾ ئایـا ئـادەمیزاد نەیانزانیوەو هەواڵیان نەدراوەتێ کەبەڕاستی ئێمە دروستمان کردوەبۆ سـوودی ئـەوان هـەندێ لەوشتانەی ئێمە دروستمان کردوون و، جگەی ئێمە ناتوانن پەیدایان بکەن، لەهوشترو گاو بزن ومەڕ، دوایی ئەوان ئەبن بەخاوەنیان و، بۆ کاروبـاری خۆیـان ئـەیان خەنـەکار، بەهـەر جـۆرێ ئارەزووی بکەن.

﴿ وَذَلَّلْناها لَهُمْ فَمِنْها رَكُوبُهُمْ وَمِنْها يَـأْكُلُونَ ﴾ وەئێمـە ئـەو چوارپێیانـەمان بـۆ ئـەوان ڕام کردوە، بەجۆرێ ناتوانن لەوان یاخی ببن و، منداڵێکی بچـوك هوشـترێکی گـەورە ڕائەکێشـێ و وائەبی لێی ئەدا، دوایی ئەوان سواری هەندێکیان ئەبن و، لـەگۆشت وشتی تری ئەوان ئـەخۆن، خوری و کورگ و موەکانیان بەکاردێنن.

﴿ ولَهُمْ فِيْها مَنافِعُ وَمَشارِبَ أَفَلا يَشْكُرُونَ ﴾ وە بۆ ئـەوان هەیـە لـەناو ئـەو چوارپێیانـەدا چەندین سودی زۆر وەك پێسەکانیان و گۆشت و کێڵانی زەوبی و، لەوانا هەیەخوراوەی پاك و خاوێن، ئایا بۆ دوایی ئەوان سوپاسی خوا ناکەن لـەسەر ئەو چاکانـەیداو، بـاوەڕی پـێ بـهێنن و بەتەنها هەر ئەو بپەرستن ؟

ئەگەر خوا ئەوانەی بۆ ئەوان دروست نەکردایە، ئەوان بەوجۆرە نایابە ڕایان نەئەبوارد.

﴿ وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللهِ آلِهَةً لَعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾ وەبێ باوەڕان وەریان ئەگرت بۆخۆیان لەجگەی خوا چەند خوایە لەبتەکان و ئەیانپەرستن، بەئومێدی ئەوەی یارمەتیان بدرێ لەلایەن ئەو بتانەوە. بۆیان بپاڕێنەوە لای خواو سزایان نەدا لەرۆژی دواییدا.

﴿ لايَسْتَطِيْعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جند مُّحْضَرُونَ ﴾ ئەو خوایانەی ئەوان توانای ئەوەیان نیە یارمەتی بێ باوەڕان بدەن و، بێ باوەڕان سەربازن بۆ بتەکان وئامادەکراون بۆ پارستنیان ئەگەر دەست درێژی بکرێتە سەر بتەکان. زۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەو بتانە بێ باوەڕان پاسەوانیانن و نایەڵن دەست درێژی بکرێتە سەریان، ئیتر چۆن ئەیان پەرستن وبەتەمای پاڕانەوەیانن ؟

﴿ فَلا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إنا نَعْلَمُ مايُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ دوایی گفتوگۆی بت پەرستان ئازاری تۆ نەدا کە ئەڵێن: تۆ شاعیری یا جادوگەری، یا پۆشەوێژ یا تۆ شێتی.بەڕاستیئێمە ئەو شتە ئەزانین ئەوان ئەیشارنەوە شتێ ئەوان ئاشکرای بکەن، هیچ شتێ لەئێمە وون نابێ، ئێمە لەرۆژی دواییدا سزایان ئەدەین. کەواتە تۆ ئارام بگرە بەوێنەی پێغەمەرانی تری خاوەن مەبەست .

أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

﴿ أوَ لَمْ يَر الأنسانُ أنّا خَلَقْناهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَأذا هُوَ خَصِيْمٌ مُبِيْنٌ ﴾ ئایا ئادەمیزاد نەیانزانیوەکەبەڕاستی ئێمە ئەوانمان دروست کردوە لە دڵۆپێ ئاوی بێ نرخ و قێزەوون لەلایەن پیاوەوە چوەتە مناڵدانی ژنەوە، دوایی کردمان بەمرۆڤێکی خاوەن بیرو زانا و بەتوانا و ئەتوانێ

ئەوەی لەدڵیایە دەری بڕێ، دوای شتێکی وانەبو باسی بکرایە، دوایی ئەو ئادەمیزادە دوژمنێکی ئاشکرای سەرسەختی لێ دەرئەچێ بەرانبەر بە ئێمەو، بیر لە پێشووی خۆی ناکاتەوەو، گفتوگۆی خراپ ئەکا.

﴿ وَضَرَبَ لَنا مَثَلاً وَّ نَسِيَ خَلْقَهُ قالَ مَنْ يُحيي الْعِظامَ وَهِيَ رَمِيْم ﴾ وە ئەو بێ باوەڕە لەبارەی ئێمەوە گفتوگۆی سەرسوڕێنەر ئەکاو ئەڵێ ئێمە توانای زیندوکردنەوەی مردوانمان نیەو، وائەزانێ ئێمە وێنەی ئەوین لەبێ تواناییداو ، دروست کردنی خۆی لەبیرچوەتەوەکەئێمە ئەومان لەدلۆپێ ئاو دروست کردوەو، ئەڵێ: چ کەسێکە ئەو ئێسکانە زیندو بکاتەوە بەوێنەی جاران وگیان بکا بەبەریاو، ئەو ئێسکانە رزاون و پواون ؟

﴿ قُلْ يُحْيِيْها الَّذِي أَنْشَأها أَوَّلَ مَرَّةٍ وَّهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيْم ﴾ تۆ بڵێ‌بەو بێ باوەڕانە: ئەو کەسەی ئەوتۆ ئەو ئێسکانە زیندو ئەکاتەوە یەکەم جار دروستی کردوون لەنەبونەوە، بگرە زیندوکردنەوەی دوایی ئاسانترە لەپەیداکردنی یەکەم جارو، خوا بە هەموو بونەوەرێ ئەزانێ و، ئەزانێ بەپارچە پارچە ڕزیوەکانی مردوان وئەزانێ لەچ جێگەیەکن و ئەندامەکانیان لەیەك جوێ ئەکاتەوە. ئەو کەسە چاو وگوێچکەو ئەقڵ بدا بە دلۆپێ ئاوی بێ نرخ ، ئەتوانێ مردوان زیندو بکاتەوە.

﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الأخضر ناراً فَإذا أنتم منه تُوقِدُون ﴾ کەسێکی ئەوتۆ ئێوەی یەکەم جار دروست کردوە، دروستی کردوە بۆ سوودی ئێوە ئاگر لە درەختێکی سەوزی ئاودار، دوایی ئێوە پەیدا ئەکەن ئاگر لەودەرختە سەوزە، لەگەڵ ئەوەیشدا ئاو وئاگر دژی یەکترین. بێگومان کەسێ توانای ئەوەی هەبێ ئاگر لەدرەختێکی تەڕی ئاودار پەیدا بکا، ئەتوانێ مردوەکان زۆر بەئاسانی زیندو بکاتەوەو گیان بکاتەوە بەبەریانا.

بۆ زانین: خوای مەزن دوو درەختی دروست کردوون سەوز وپاراون، ئەگەر ئێوە لەهەریەکەیان لقێکیان لێ بکەنەوە دلۆپ دلۆپ ئاویان لێ دێتە دەرێ، کەچی ئەگەر ئەو دوولقانە بدرێن لەیەکتری ئاگریان لێ پەیدا ئەبێ.

﴿ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّماواتِ وَ الأَرْضَ بِقادِرٍ عَلى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ ﴾ ئایا کەسێکی ئەوتۆ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون لەنەبونەوە، توانای بەسەر ئەوەدا نیە کە وێنەی ئەو بێ باوەڕانە دروست بکا دوای مردنیان زیندویان بکاتەوە ؟

﴿ بَلَى وَهُوَ الْخَلاقُ الْعَلِيْمُ ﴾ بەڵێ: ئەو خوایە توانای بەسەر هەمو شتێکا هەیەو، بونەوەرێکی زۆری هەیە، ئەزانێ بەهەمو شتێ، کەسێکە هیچ شتێکی لەئاسمانەکان و زەویدا لێ وون نابێ.

﴿ إِنَّما أَمْرُهُ إِذا أَرادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ بەڕاستی فەرمانیخوا بەجۆرێکە هەرکاتێ بیەوێ شتێ دروست بکا، ئەفەرموێ بەو شتە تۆ ببە، دوایی ئەو شتە کوتوپڕ پەیدا ئەبێ و، خوای مەزن پێویستی بە ئامێر و کەرەسە نیە بۆ دروست کردنی هەموو شتێ. کەواتە خوای گەورە هەرکاتێ بیەوێ مردوەکان زیندو بکاتەوە ئەفەرموێ: ئێوە زیندو ببنەوە، کوتوپڕ زیندو ئەبنەوە.

﴿ فَسُبْحانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ کەفەرمانی خوا بەوجۆرە بێ ئێوەی بێ باوەڕانی مەککە کەسێکی ئەوتۆیە دەست وتوانای ئەوە خاوەنیەتی و دەستەڵاتی هەموو شتێ بێ، ئێوە پاکی بکەنەوەو دوری بخەنەوە لەهەمووو شتێکی ناشایستە و نارەواو، ئێوە هەر بۆلای ئەو کەسە ئەگێڕرێنەوە لەڕۆژی دواییدا دوای مردنتان و زیندو بونەوەتان.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانەی پێشوو ئەوەبوە: ئوبەی کوڕی خەلەف چوە خزمەت پێغەمەر و، هەندێ ئێسکی ڕزیوی پێ بوو ووتی: ئایا خوا ئەمە زیندو ئەکاتەوە داوی ڕزینی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی : بەڵێ، تۆیش مردی زیندوت ئەکاتەوەو ئەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخ.

**بەیاریدەی خوای مەزن کۆتایی پێ هات**

# ﴿ سورەتی سافات ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە ژمارەی ئایەتەکانی ( ١٨٢ ) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ ﴿٤﴾ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ وَالصافاتِ صَفاً فَالزاجِراتِ زَجْراً ﴾ وە سوێندم بەسوپای باوەڕداران کاتێ ئەوەستن و ڕیز ئەدەن بەڕیزدانێکی ڕێك وپێك و ئەیانەوێ خۆیان بفرۆشـن و دوژمنـی خـوا بکـوژن و خۆیـان بکوژرێن، هەتا بەهەشتیان دەسـت کـەوێ، دوای سوێند بـەو کۆمەڵـە سوپایەی بـاوەڕداران چارەوێکانی خۆیان لێ ئەخورن بەلێ خورینێکـی تـەواو، ئەچنـە گۆڕەپـانی جـەنگ و پـەلاماری بێباوەڕان ئەدەن و گوێ نادەنە ئەوەی بکوژرێن لەڕێگەی بەرزی ئاینی خوای گەورەدا.

﴿ فَالتالِياتِ ذِكْراً إنَ إلهَكُمْ لَواحِدٌ ﴾ دوایی سـوێندم بـەو کۆمەڵـەی بـاوەڕداران قورئـان ئەخوێنن بەبێ ماندوبون و، داوای یارمەتی هـەر لەخوائەکـەن بـۆ پاراسـتنی ئـاین و نیشـتمانی خۆیان. بەڕاستی خوای ئێوە تەنهایە بۆ پەرستن و داواکردنی یارمەتی و هاوبەشی نیە.

﴿ رَبُ السَماءِ وَالأرْضِ وَما بَيْنَهُما وَرَب الْمَشـارْفِ ﴾ پـەروەردگاری ئاسمانـەکان و زەویو شتێکە لەنێوان ئەواندان و، پەروەردگاری جێگـەکانی هەڵـهاتنی خـۆرە کـە ژمارەیـان (٣٦٥) جێگەن هەمو ڕۆژێ خۆر لـە یەکێکیان هەڵدێو ئاوا ئەبێ، بەگوێرەی ئەندازەی ساڵی هەتاوی.

زانایان بیرو بۆچونیان جیاوازە لەبارەی مەبەست لەمانای ووشەکانی ( الصّافات، الزّاجرات، التّالیات ) هەندێکیان ئەڵێن: مەبەست لەماناکانیان فریشتەکانن.

﴿ إنا زَيّنّا السَّماءَ الدُّنْيا بِزِينَةِ الْكَواكِبِ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو ئاسمانەی نزیکە لە ئێوەوە ڕوناکمان کردۆتەوە بەڕوناکی ئەستێرەکان، ئەستێرە ئەو شتانەن بەئاسمانی جیهانەوە ئەبینرێن و ئاسمان بەوان ڕازێنراوەتەوە.

﴿ وَحِفْظاً مِنْ كُلِّ الشَّيْطانِ مارِدٍ ﴾ وە ئێمە ئاسمانەکانمان پاراستوە لەهەمو شەیتانێ یاخیبوبێ و لە فەرمان و پەرستنی ئێمە دەرچوبێ و، ئێمە ئەو ئەستێرانەمان کردوە بە پاسەوانی ئاسمان.

﴿ لايَسْمَعُونَ إلى الْمَلأِ الأَعْلى يُقْذَفُونَ مِنْ كُلِّ جانِبٍ ﴾ ناتوانن ببیستن هیچ شتێ لە گفتوگۆی تاقمەکانی سەروە کە بریتین لە فریشتە پاکەکان و، هەوڵی ئەوە ئەدەن بۆ گوێ گرتن بچن بۆلایان و، بۆیان فڕێ ئەدرێ کۆمەڵێ گڕی سوتێنەری ئاگر لەهەمو لایەکەوە.

﴿ دُحورا وَلَهُمْ عَذابُ واصِبُ ﴾ ئەو شەیتانانە سزایان ئەدرێ بەدەرکردن لەهەمو لایەکەوەو، بۆیان هەیە لەڕۆژی دوایدا سزای سەختی بەردەوام و نەبڕاوە.

﴿ إلا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهابٌ ثاقِبٌ ﴾ ئەو شەیتانانە ناتوانن بڕۆن بۆلای سەرەوە بۆ گوێ لە گفتوگۆی فریشتەکانی سەرەوە مەگەر کەسێ لەوان شتێ لەگفتوگۆی ئەوان وەربگرێ بەپەلەو بەدزیەوە، دوایی بەرلەوەی بگاتەوە بۆلای زەوی توشی ئەو ئەبێ کۆمەڵێ ئاگری زۆر ڕوناك و ئەیسوتێنێ بەرلەوەیبگاتەوە بۆلای پۆشەوێژەکان و، درۆو بوختانی ترەوەی بخەنە سەرو دانیشتوانی زەوی لە ڕێگە ڕاست لابدەن.

فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ۚ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ

ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾

﴿ فَأَستهتمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمْ مَنْ خَلَقْنا ﴾ دوایی تۆ پرسیار بکە لەو کەسانە بڕوایان بەزیندو بونەوە نیە: ئایا دروستکردنی ئەوان و زیندوبونەوەی ئەوان دوایی مردنیان گرانە یادروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی‌و ئەوەی لەنێوان ئەواندایە؟

﴿ إنا خَلَقْناهُمْ مِنَ طِيْنٍ لآزبٍ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو بێباوەڕانەمان دروست کردوە لە خاکێکی لیق و ترشاو ئەنوسا بەدەستەوە ڕاستەوخۆ یەکەم جار وەك ئادەم و، دوواتر لە دڵۆپێ ئاوی بێ‌نرخ و قێزەوەن، ئیتر بۆ بیرلە خۆیان ناکەنەوە؟

﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَ يَسْخَرُونَ ﴾ بەڵکو بەڕاستی تۆ سەرت سوڕ ئەمێنێ لەبیروبۆچونی ئەو کەسانە بڕوایان بەزیندوبونەوە نیە دوای مردن و، ئەوان گاڵتە بەبیروباوەڕی تۆو بەزیندوبونەوە ئەکەن، تۆ سەرت سوڕنەمێنێ هەمو شتێ لای خوا ئاسانەو، تۆڵەیان لێ ئەسێنێ.

﴿ أو إذا ذُكِرُوا لايَذْكُرُونَ ﴾ وە هەرکاتێ ئامۆژگاریان بکرێن بەهۆی ئایەتەکانی قورئانەوە، ئامۆژگاری وەرناگرن وسود لەو ئامۆژگاریە وەرناگرن.

﴿ وَإذا رَأوْا آيَةً يَّستَسْخِرُونَ وَقالُوا إنَ هذا إلا سِحْرٌ مّبِيْنٌ ﴾ وە هەرکاتێ کارێکی پەکخەر لەکارەکانی تۆو، بەڵگەیە لەبەڵگە ڕاستەکانی تۆیان ببینیایە لەنێوان خۆیانا دەستان ئەکرد بەگاڵتە کردن پێیان و، ئەیان ووت: ئەو شتەی موحەمەد هێناویەتی جادوی ئاشکرایە، ئەیانەوێ بەو کارەی خۆیان دانیشتوان لەڕێگە لابدەن.

﴿ أإذا مَتناوَكُنا تُراباً وَعِظاماً أئِنـا لَمَبْعُوثـونَ او آبـاؤُنَ الأَوَّلُـوْنَ ﴾ ئەو کەسانەی باوەڕیان بەزیندوبونەوە نیە ئەڵێن: ئایا کاتێ ئێمەمردین،لەشمان ڕزاو بوین بەخاك و ئێسك و بوین بتۆزو بڵاوبوینەوە بەم لاولادا ئایا ئێمە زیندو ئەکرێینەوە بۆ پرسیار؟ یا ئێمە چۆنبڕوامان بە زیندوبونوەی‌باوباپیرەکانی خۆمان هەیە هەزاران ساڵە مردون و گیان بکرێتەوە بە لەشیانا؟

﴿ قُلْ نَعَم وَأَنْتُمْ داخِرُونَ. فَإنَما هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ . فَإذا هُمْ يَنْظِرُوْنَ ﴾ تۆ بڵێ:بەڵێ ئێوە لە گۆڕەکانتان دێنە دەرێ‌و دوایی ئێوەو باپیرانتان زیندو ئەکرێنەوەو، ئێوە ئەنێرێن بۆلای پرسیارکردن لێتان بەلاوازی‌و بەسەر شۆڕی، دوایی بەڕاستی‌زیندو بونەوە لای ئێمە کارێکی گران نیە مەگەر تاکە دەنگێکە کە ئێوە ئەیبسن و، دوایی زیندو ئەبنەوەو هەڵئەسنە سەرپێ‌و، هەندێکتان تەماشای هەندێ ترتان ئەکەن.

﴿ وَقالُوا يا وَيْلَنا هَذا يَوْم الّدِيْنِ. هذا يَوْم الفَصْلَ الّذِي كُنتُـمْ بِـهِ تَكْذِبُوْنَ ﴾ وە کاتێ لە گۆڕەکانیان هاتنە دەرەوە، هەندێکیان بەهەندێ تریان ئەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئەم پرسیارە سەختە

ئەکرێ لە ئێمەو، بۆ ئەم سزا درێژ خایەنەی ئێمە، ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە پاداشتی ئێمە ئەدرێتەوە لەسەر ئەو کارانەی کردومانە، دوایی بەوان ئەبێژرێ: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی ئەوتۆیە کاری ڕاست و کاری خراپ جوێ ئەبنەوەو، ئەو ڕۆژەیە ئێوە بەدرۆتان ئەخستەوە، پیاو چاکان و خراپەکاران لەیەك جوێ ئەبنەوە، دوایی تاقمێ بۆلای بەهەشت و تاقمێ تر بۆلای دۆزەخ ئەنێرێن. کەواتە ئێوە بچێژن سزای شتێ کردوتانە.

﴿ احشروا الَّذِيْنَ ظَلَمُوا وأزْواجَهُمْ وَما كانُوا يَعْبُدُوْنَ مِنْ دُوْنِ اللهِ ﴾ خوای مەزن داوای ئەوەی ئادەمیزاد لە گۆڕەکانیان هاتنە دەر بەفریشتەکان ئەفەرموێ: ئێوە کەسانێکی ئەوتۆ بەهاوبەشدانان بۆ ئێمە ستەمیان لە خۆیان کردوە کۆیان بکەنەوەئەوان و هاورێ هاوبەش دانەرەکان و ئەوکەسانەی ئەیان پەرستن لەبتەکان لەجگەی خوا لەدەشتی کۆبونەوەدا.

﴿ فاهْدُوهُمْ إلى صِراطِ الجَحِيْمِ. وَقِفُوْهُمْ إنَهُمْ مَسْؤُلُوْنَ ﴾ دوای ئەو شتەی کرا بەتاوانباران بە فریشتەکان ئەبێژرێ: ئێوە بەگورجی تاوانباران ببەن بۆناوەڕاستی دۆزەخ و، بەر لەبردنیان ئێوە ئەوان ڕاوەستێنن. بەڕاستی ئەوان پرسیاریان لێ ئەکرێ لەو کارانەی کردویانەو، لەسەر بێباوەڕیو بێفەرمانی خوا.

﴿ مالَكُمْ لاتُناصِرُونَ . بَلْ هُمَ اليَوْمَ مُسْتَسلِمُوْنَ ﴾ بەو تاوانبارانە ئەبێژرێ: لەبەر چ شتێ هەندێ لە ئێوە یاریدەی هەندێ ترتان نادەن ئەمڕۆ، وەك ئەوەی لەجیهاندا یارمەتی یەکترتان ئەدا. بەڵکو ئێوە ئەمڕۆ فەرمانبەرداری خوای گەورەن و، توانای پیلان و فێڵتان نیەو ڕێگەی ڕزگاری نادۆزنەوە.

وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾

﴿ وَأَقْبَل بَعْضُهُم على بَعْضٍ يَتَساءَلُونَ. قالُوا إنَكُمْ كُنْتُم تأتوننا عَنِ اليَمِيْنِ ﴾ لەڕۆژی دوایدا ناکۆکی سەخت پەیدا ئەبێ لەنێوان تاوانبارە سەرۆکەکان و ژێردەستەکانیان و، هەندێکیان ڕو ئەکەن بۆلای هەندێکی تریان و، پرسیار لەیەکتری ئەکەن. ژێر دەستەکان بەسەرۆکەکانی خۆیان ئەڵێن:بەڕاستی ئێوە ئەهاتن بۆلای ئێمە سوێندتان بۆ ئێمە ئەخوارد کە نیازتان پاکەلەگەڵ ئێمەو، دوایی ئێمە بڕوامان پێ‌کردن. کەواتە ئێوە نەتان هێشت ئێمە باوەڕبهێنین، ئەگینا ئێمە باوەڕمان ئەهێنا.

﴿ قالُوا بَلْ لَمْ تَكُوْنُوا مُؤمِنِيْنَ . وَما كانَ لَنا عَلَيْكُمْ مِنْ سُلطانٍ بَلْ كُنتُمْ قَوماً طاغِيْنَ ﴾ سەرۆکەکان وولامی ژێر دەستەکان ئەدەنەوەو ئەڵێن: بەڵکو ئێوە خۆتان بەئارەزوی خۆتان باوەڕتان نەهێناوەو،ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوە بۆ باوەڕنەهێنان. بەڵکو ئێوە تاقمێك بون لەسنوری ڕێگەی ڕاست لاتان دابو بەسەر بەستی خۆتان. کەواتە خۆتان بەرپرسیارن.

﴿ فَحَقَ علينا لَنا قَولَ رَبِنا إنا لَذائِقُوْنَ ﴾ دوای پێویستە لەسەر ئێمەو لەسەر ئێوە شتێ پەروەردگاری ئێمە هەڕەشەی لێ ئەکردین، بەدرۆمان خستەوە. بەڕاستیی با بیچێژین سزای سەخت. فەرمودەی خوا هاتە دی:ئێمە دۆزەخ پڕئەکەین لەبێباوەڕانی جنۆکەو ئادەمیزاد.

﴿ فَأَغْوَيْناكُمْ إنّا كُنّا عادِيْنَ فَإنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذابِ مُشْرِكُونَ ﴾دوایی ئێمە بێ باوەڕیمان بۆ ئێوە ڕازاندەوەو، ئێوەمان لەڕێگەی ڕاست لادا. بەڕاستی ئێمە وەك ئێوە لەڕێگەی ڕاست لامان دابو،خوای مەزن فەرموی: دوایی ئەوان هەمویان لەسزادا هاوبەشن، هەروەك لەڕێگەی ڕاست لادان و، بێباوەڕیدا هاوبەش بوون.

﴿ إنّا كَذلِكَ فَفعل بِالْمُجْرِمِيْنَ إنَهُمْ كانُوا إذا قِيْلَ لَهُمْ لاإلهَ إلاّ اللهُ يَسْتَكبِرُونَ ﴾ بەڕاستی ئێمە هەربەوجۆرە سزای ئەوبێباوەڕانەماندا، ئێمە هەربەوجۆرە ئێمە کارئەکەین لەگەڵ هەمو تاوانباران، چونکە ئەو بێباوەڕانە هەرکاتێ بیبێژرایە بەوان: هیچ خوایە نیە پەرستنی بۆ بکرێ جگە لەخوایە تاك وتەنهایە، ئەوان لەئاستی ئەو فەرمودەیە خۆیان بەگەورە دائەناو بەبەرزتر ئەزانی .

﴿ وَيَقُولُونَ أئِنا لَتاركوا آلِهَتِنا لِشاعِرٍ مَجْنُون ﴾ وەتاوانباران ئەڵێن: ئایا بەڕاستی چۆن ئێمە واز لەپەرستنی خواکانی خۆمان ئەهێنین لەبەر شاعیرێکی شێت. بێباوەڕان دوو شتی دژ بەیەکتری تێکەڵاو ئەکەن وئەیدەنە پاڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ : یەکەمیان: موحەمەد هۆنراوە بێژە. کەواتە ئەبی خاوەنی بیرو هۆش بێ. دووهەمیان ئەڵێن: موحەمەد شێتە.کەواتە ئەبێ ئاگای لەخۆی نەبی وبیرو هۆشی نەبێ. ئەوەندە نەفامن دوو شتی دژ بەیەکتری لەیەك ڕستەدا کۆئەکەنەوە.

﴿ بَلْ جاءَ بِالْحَقِ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِيْنَ ﴾ بەڵکو موحەمەد بەئائینێکی ڕاستەوە لەلایەن خواوە هاتوە بۆلای ئادەمیزادو، خاوەنی بەڵگەی ڕاستەو، بڕوای بەشتێ هێناوە پێغەمەرانی تر هێناویانە، هۆنراوەو شێتی لەپیاوێکی وەك موحەمەدەوە دورن و، ژیرترین مرۆڤی ڕووی زەویە.

إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾

﴿ إنَكُمْ لَذائِقوا الْعَذابِ الأَلِيْمِ وَما تُجْزَونَ إلاّ ماكُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ بەڕاستی ئێوەی تاوانبار بچێژن سزایەکی سەخت وخاوەن ئازارو، ئێوە پاداشتتان ناندرێتەوە مەگەر بەشتێ ئێوە ئەیکەن بەبێ کەم وزۆر.

﴿ إلا عِبادَ اللهِ الْمَخلِصِيْنَ اولئكَ لَهُمْ رزقٌ مَعْلُومٌ ﴾ ئادەمیزاد سزای سەخت ئەچێژن مەگەر ئەو بەندانەی خوا پارێزراون لەبێباوەڕی و، باوەڕیان بەخواو بەپێغەمەر هێناوە، ئەو کەسانە بۆیان هەیە خواردن و خواردنەوەی دیاری کراوو تایبەتی بەهەمو شێوەیە: لەڕەنگ و تام وبۆن وسوددا، بەئاسانی بەبێ ماندو بوون دێت بۆلایان لەبەهەشتا. ئەو خواردن وخواردەمەنیانە بریتین:

﴿ فَواكِهُ وَهُمْ مُكْرَمُونَ فِي جَنّاتِ النّعِيمِ عَلى سُرُرٍ مُتَقابِلِيْنَ ﴾ لەچەندین میوەی جۆراوجۆر پاك وجوان ، پێش کەشیان ئەکرێ و، ئەوان رێزیان لێ ئەگیرێ هەریەکەیان بەگوێرەی پلەوپایەی خۆیان لەناو بەهەشتێ هەمو چاکەیەکی تێدا کۆکراوەتەوە، بۆیان ئامادەکراوە چەندین کورسی پاڵی پێوە ئەدەن هەمویان بەرانبەر بەیەکتری و، بەخۆشیەوە گفتوگۆ لەگەڵ یەکرتی ئەکەن بەرووی گەشەوە.

﴿ يُطافُ عَلَيْهِمْ بكأسٍ مِنَ مَّعِين بَيْضاءَ لَذّةٍ لِلّشارِبِيْنَ ﴾ پێشکەشیان ئەکری و ئەگێرڕێ بەسەریانا جامێکی پڕ لەجۆرەها مەی دێتە دەرەوە لەسەرچاوەیەکی زۆر سپی تر لەشیرو، زۆر بەتام و کۆتایی پێ نایە، بۆئەو کەسانەی ئەیخۆنەوە، بەشادمانی لەسەر کورسیەکان دانیشتوون.

﴿ لاغَوْلٌ فِيها وَلاهُمْ عَنْها ينزفون﴾ لەناو ئەو مەیەدا تێك چوونی ئەقڵ و ئازاری لەش و سەرئێشەی تێدا نیەو، ئەو کەسانەی لەبەهەشتان بەخواردنەوەی ئەو مەیە سەرخۆش نابن. بەڵکو خۆشییان زۆرتر ئەبێ.

﴿ وَعِنْدَهُمْ قاصِراتُ الطَّرفِ عِينٌ . كأنَهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾ وەئەو بەهەشتیانە چەندین کچیان لایە چاویان بەتەنها هەربۆلای مێردەکانی خۆیان ئـەڕوانێ، ئـەوەیش نیشـانەی چـاکی و داوێـن پاکیە، چاویان گەورەو زۆر جوانە، ئەوانە کچن ودەستی بێگانـەیان لی نـەدراوە، بەوێنـەی ئـەو هێلکە سپیانەن پارێزراون لـەشکان وتۆز.

پرسیار: زۆر ڕاستە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ژن وپیاوی وەك یەك داناوە لـەزۆرترین مافدا. بەڵام بۆ قورئان ئەفەرموێ: خوا پاداشـتی پیاوچاکانئەداتـەوە بـەکچی زۆرجـوان وشـۆخ و لـەبارەی پادشت دانەوەی ژنان بەکوڕی جوان دەنگی نەکردوە؟

وەڵام: قورئانی پیرۆز وەك سەرچاوەیەکی یاسای گشتی ژن وپیاوی وەك یەك داناوە لـەمافدا: وەك لـەئایەتی ( ١٩٥ ) ی سورەتی ئالی عیمران و ئایەتی ( ١٢٤ )ی سورەی‌ت نیسـاء و ئایـەتی (٧١)ی سورەتی زوخروفدا. خوای مەزن باسی فەرموە.زانـای بـەناوبانگ ( موحەمـەد جـەواد موغنیە ) لـەتەفسیری ( الکاشف) لاپەڕەی ( ٣٣٩ ) بەرگی شەشەم دا ئەفـەرموێ: بۆیـە باسـی ژنانی نەکردوە، چونکە باسی ژن ومێردی کردن ژنان زۆر شەرمی لێ ئەکەن.

پرسیار: قورئان ئەفەرموێ: هەرکەسێ چوە بەهەشت، ئەوەی دەروونی لای خۆشبێ دەسـتی ئەکەوێ، کەواتە بۆ ئەبی پیاو ژنی زۆری هـەبێ لـەبەهەشـتاو، بـەڵام ژن ئـەبێ هەریـەك پیـاوی هەبێ؟

وەڵام: خوای گـەورە بـەگوێرەی دەسـتوری خـۆی وای بڕیـارداوەو خسـتویەتیە دەروونـی ژنانەوە ئارەزوویان لـەیەك پیاو زۆرتر نیەو داوایشی ناکەن. هەرخواهەموو شتێ ئەزانێ.

فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ

ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾

﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلى بَعْضٍ يَتَساءلُونَ ﴾ دوای ئەوەی‌باوەڕداران لەبەهەشتا بەخۆشی وشادمانیەوە ڕائەبوێرن، هەندێکیان ڕوئەکەن بۆلای هەندێ تریان، پرسیار لەیەکتری ئەکەن لەوشتانەی ڕۆیشتوون لەجیهانداو بیریان ئەکەنەوە.

﴿ قالَ قائلٌ مِنْهُمْ إني كانَ لِي قَرِينٌ. يَقُولُ أئِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ أئِذا مِتْنا وَكُنّا تُراباً وَّعِظاماً أئِنّا لَمَدِينُونَ ﴾ یەکێ لەوکەسانەی لەبەهەشتان وگفتوگۆیان لەگەڵ یەکتری ئەکرد، ئەڵێ: من بەڕاستی بەبیرم دێتەوە من هاوڕێکم هەبوو لەجیهاندا زۆرجار بەیەکەوە بووین، هەوڵی ئەدا من لەڕێگەی ڕاست لابدا، ئەیوت بەمن: ئایا تۆ لەوکەسانەی بڕوات وابێ کاتێ ئێمە مردین وبوین بەخاك و بەئێسك ورزاین، ئێمە زیندوو ئەکرێنەوە دوای مردنمان، بۆئەوەی پرسیاری کردەوەکانمان لێ بکرێ و پاداشت و تۆڵەمان وەربگرین، ئەو کارە ئێوەی باوەڕدار ئەیڵێن، زۆر دوورەو ئەفسانەو پڕوپوچە.

﴿ قالَ هَلْ أنْتُمْ مُّطَّلِعُونَ ﴾ ئەو کەسەی گفتوگۆی ئەکردو ووتی بەدانیشتوانی بەهەشت: ئایا ئێوە ئەتانەوێ تەماشا بکەن و نیشانی ئێوەی بدەم ئەوکەسەی هاوڕێی من بوو لەجیهاندا لەبارەی زیندوبونەوە گفتوگۆی لەگەڵ من ئەکردو، بڕوای بەزیندوبونەوە نەبوو؟

﴿ فاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَواءِ الْجَحِيمِ .قالَ تَاللهِ إنْ كِدْتَ لَتُرْدِينِ ﴾ دوایی ئەو پیاوە باوەڕدارە ئاگاداری پەیدا ئەکا لەسەر دانیشتوانی دۆزەخ و، هاوڕێکەی خۆی ئەبینێ لەناوەڕاست ئاگری دۆزەخدا، بەهاوڕێکەی ئەڵێ: سوێندم بەخوای مەزنبێ، بەڕاستی نزیکبو تۆ من لەناوببەی بەوێنەی خۆتم لێ بکەی.

﴿ وَلَوْلا نِعْمَةُ رَبّي لَكُنْتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴾ وەئەگەر چاکەی پەروەردگاری من نەبوایە بەسەرمەوەو، منی پاراست لەبت پەرستی، بەڕاستی منیش بەوێنەی تۆ ئێستا ئامادە ئەکرام بۆئەوەی بخرێمە دۆزەخەوە.

﴿ أفما نَحْنُ بِمَيِّتِينَ إلاّ مَوْتَتَنا الأُولى وَمانَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ دوایی ئەو کەسە ئەڵێ لەخۆشی ئەو چاکەیەی پەروەردگاری خۆی: ئایا دوایی ئێمە نامرین و لەم شادمانیەدا ئەبین و، ئێمە جارێ تر نامرێینەوە، جگەلەو مردنەی پێشووی ئێمە لەجیهانداو سزا نادرێین؟

﴿ إِنَّ هذا لَهُوَ الفوْزُ الْعَظِيْمُ لِمِثْلِ هذا فلْيَعْمَلِ الْعامِلُونَ ﴾ بەڕاستی ئەو چاکەو ڕەزامەندییەی خوا ڕزگاربوون و سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە. مردن و ئازار لەم ڕۆژە بەدواوە نیە، دوایی بۆ وێنەی ئەو مەبەست وپلە گەورەیە باباوەڕداران کاربکەن و، واز لەگوناهو بێ فەرمانی خواو نیشتمان فرۆشی بهێنن.

﴿ أذلِكَ خَيْرٌ نُزُولاً أمْ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ ﴾ خوای مەزن ئەفەرموێ: ئایا ئەو شتەی ئامادەکراوە بۆ دانیشتوانی بەهەشت چاکترە یا بەری درەختی زەقوم کە ئامادەکراوە بۆ دانیشتوانی دۆزەخ؟ کەتامێکی تاڵ و بۆنێکی پیسی هەیە.

﴿ إنّها جَعَلْناها فِتْنَةً لِلظّالِمِيْنَ .إنّها شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أصْلِ الْجَحِيْمِ ﴾ بەڕاستی درەختی زەقوم ئێمە دروستمان کردوە بۆ سزادان وئازاردانی ستەمکاران وبێ باوەڕان. بەڕاستی درەختێکە ئاگری دۆزەخ نای سوتێنی سەوز بوە لەخواری خوارەوەی دۆزەخ و سەری هێناوە دەرو، لقەکانی ئاگری لێ ئەبێتەوە.

﴿ طَلْعُها كَأنَّهُ رُؤُوسُ الشّياطِيْنِ. فَأنَّهُمْ لآكِلُونَ مِنْها فَمالِئُونَ مِنْها الْبُطُونَ ﴾ بەری ئەو درەختە لەئەوپەڕی ناشیرینیدایە بەوێنەی سەری شەیتان وایە، دوایی دانیشتوانی دۆزەخ لەبەری ئەو درەختە ئەخۆن بەناچاری، چونکە زۆریان برسیە، دوایی لەتینوانا سکی خۆیانی لێ پڕ ئەکەن وتینوێتیان سەختتر ئەبێ.

پرسیار: سەری شەیتان نەبینراوە، دوایی چۆن ئەبێژری ئەو درەختە وێنەی سەری شەیتانە؟

وەلاّم: ناشیرینی شەیتان لەدەروونا چەسپاوە، بانەیش بینرابێ، کەواتە دروستە ببێژری بەوێنەی سەری شەیتانە، لەلایەترەوە: لای عەرەبەکان بەهەرشتێ لایان خراپ بوایە، ئەیان ووت: ئەڵێی: سەری شەیتانەو، هەر شتێ لایان جوان بوایە ئەیان ووت: ئەڵێی:فریشتەیە.هەندێ لە زانایان ئەڵێن: شەیتان لەم جێگەیەدا بەمانای مارە. هەندێ تر ئەڵێن:لەنێوان مەکەو یەمەندا درەختێکی ناشیرین هەیە ناوی زەقومە.

﴿ ثُمَّ إنَّ لَهُمْ عَلَيْنا لَشَوْباً مِنَ حَمِيْم. ثُمَّ إنَّ مَرْجَعَهُمْ لأِلَى الْحَمِيْمِ ﴾ لەپاشا دوای ئەوەی سکی خۆیان پڕ ئەکەن لە خواردنی بەری ئەو درەختەو تینوێتی زۆریان پێ دێنێ، خوراوەیەکیان بۆ ئەهێنن تێکەڵە لەکێم وزوخی گەرم ڕیخۆڵەیان پارچە پارچە ئەکا. پاش پێشکەشکردنی ئەو خواردن و خوراوەیە گەڕانەوەیان بۆلای دۆزەخە.


إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ

ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾

﴿ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آباءَهُمْ ضَالِّينَ فَهُمْ عَلى آثارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾ بەڕاستی بت پەرستانی مەککە ئەو سزایانە شایستەی ئەوانە، چونکە باوباپیری خۆیانیان لەسەر بت پەرستی و گومڕایی دەست کەوتبو، ئەوانیش بەگورجی لەسەر ئایینی ئەوان ڕۆیشتن ودوایان کەوتن، بەبێ ئەوەی بیر بکەنەوە لەو شتەی پێغەمەر هاوردی بۆلایان لەچەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر یەکێتی خواو ڕێگەی ڕاست.

﴿ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الأَوَّلِينَ ﴾ دانیشتوانی بت پەرستی مەکە یەکەمین تاقم نەبوون لەڕێگەی ڕاست لایان دابێ و دوای ئایینی باوباپیری خۆیان کەوتبن وبیان خەنە داوی خۆیان و، بەڕاستی بەرلەوان زۆرترین نەتەوەی پێشوان و، دوای ئایینی باوباپیری خۆیان کەوتبون و سەرۆکەکانیان ئەوانیان خەڵەتان وبی فەرمانی پێغەمەرەکانی خۆیانیان کردو بەدرۆیان خستنەوە.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنا فِيهِمْ مُنْذِرِينَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردبو لەناو گەلانی ڕابوردودا چەندین پێغەمەر ئەوانیان ئەترسان لەپاشەڕۆژی خراپی بێ باوەڕی ولادان لەڕێگەی ڕاست. بەلام دوای ئەو پێغەمەرانە نەکەوتن.

﴿ فَانظرْ كَيفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُنْذِرِينَ ﴾ دوایی تۆ تەماشا بکە لەخراپی و بنە بربوون وئابرو چوون ورسوایی ئەو کەسانەی ترسێنراون لەلایەن پێغەمەرەکانیانەوەو باوەڕیان پێ نەهێناون.

﴿ إلاَّ عِبادَ اللهِ الْمُخْلَصِينَ ﴾ مەگەر ئەوبەندانەی هەڵبژێراوی و پوختەی خوان وبەنیازی پاکەوە باوەڕیان هێناوەو، ئەو کەسانە ڕزگاریان ئەبێ لەسزای خوا.

﴿ وَلَقَدْ نادانا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ﴾ وەبەڕاستی تاقمی نوح ئازاری زۆری نوحیانداو بێ فەرمانی خوایان کرد، دوایی نوح لە ئێمە پاڕایەوە کە ڕزگاری بکەین لە خراپی ئەوان و بیپارێزین لەو سزایەی ئەوتۆ بۆ ئوان تۆمارکراوە. دوایی ئێمە چاکترین کەسێ بوین وولامی پاڕانەکەیمان دایەوە بە چاکترین وولام.

﴿ وَنَجَّيْناهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ العَظِيْمِ ﴾ وە ئێمە نوح و ئەو خێزانانەی باوەڕیان هێنابو ڕزگارمان کردن لە ئازاری سەخت و خنکان بەلافاوی زۆر گران.

﴿ وَجَعَلْنا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الباقُونَ. وَتَرَكنا عَلَيْهِ فِي الآخِرِيْنَ ﴾ وەئێمە منالەکانی نوحمان هێشتەوە هەر ئەوان بمێننەوەو، زەوی ئاوەدان بکەنەوەو، ئێمە ئەوانمان گێڕا بەجۆرێ نەوەکانی دوای خۆیان ناویان بێنن و باسیان بکەن بە چاکەو بە ستایشی شیرین وە ئێمە باسی چاکەکردنمان هێشتەوە هەتا هەتایە.

﴿ سَلامٌ عَلَى نُوحٍ فِي العالَمِيْنَ ﴾ بێوەیو ئاسایش لەسەر نوحیێ لەلایەن بونەوەرانی دوایی خۆیو بۆی بپارێنەوە لای خوا پاداشتی ئەو ئارام گرتنەوەی بداتەوە لەسەر ئازاری بێباوەڕان.

﴿ إنا كَذلِكَ نُجْزِي الْمُحْسِنِيْنَ. إنَهُ مِنْ عِبادِنا الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی بەو جۆرە پاداشتی نوحمان دایەوە، هەر بەوجۆرە پاداشتی هەمو کەس ئەدەینەوە چاکە بکەن و، خۆیان ماندوبکەن لەرێگەی خوادا. بەڕاستی نوح لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمەیەو کردەوەی چاکی کردوە.

﴿ وَأغْرَقْنا الآخَرِيْنَ ﴾ وە ئێمە ئەوانەی تری جگەی نوح و کوڕو خێزانەکانی خنکاندمان بەئاوی لافاو لە جیهانداو، لەپاشەڕۆژیشدا سزای زۆر سەختتریان ئەدەین.

بۆزانین: کوڕەکانی نوح سێ کوڕن کە باپیری هەمو نەوەکانی دوای خۆیانن:

١- سام کە لەزمانی عەرەبیدا بەمانا ( ناوە ) کوڕە گەورەکەی نوحە: عەرەب و جوو ئاشوریو ئارامیەکان لە نەوەیئەون، بۆیە پێیان ئەبێژرێ سامی.

٢- یافیس: بەزمانی عەرەبی یانی ( جوانی ) باپیری دانیشتوانی خۆرئاوای باکوری دەریای قەزوێن و، دانیشتوانی دورگەکانی دەریای ناوەڕاست، لەبنچینەدا پێیان ئەوترێ هندۆئەوروپیو، باپیری تورکەکانی سەقالیبەو خەزەرو یاجوج و ماجوجیشە.

٣- حام بەمانا ( گەرمیە ) بچوکترین کوری نوحە.باپیری سودان و حەبەشەوبەربەرە.

وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾

﴿ وَأنَ مَن بَشِيْعَتِهِ لأبْراهِيْمُ ﴾ وە لەتاقم و هاو ئاین و وێنەی نوحە ئیبراهیم، لەدەربڕینی بانگەواز بۆلای پەرستنی خوا بەتەنهاو، لەئارام گرتنیدا لەسەر دەستوری خواو، لەسەر ئازاردانی بێباوەڕان بۆی.

﴿ إذا جاءَ رَبَهُ بِقَلْبٍ سَلِيْمٍ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە: ئیبراهیم چوو بۆلای پەروەردگاری خۆی بەدڵێکی دور لەبت پەرستیو گومان لەهەمو گفتوگۆو کرداریا، بەنیازی پاکەوە بۆلای ئاینی خوا.

﴿ إذْ قالَ لأبِيْهِ وَقَوْمِهِ ماذا تَعْبُدُونَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیم بەباوکیوتاقمەکەی خۆی ووت:ئێوە چ شتێ ئەپەرستن؟ خۆتان دروستیان ئەکەن و بازرگانیان پێوە ئەکەن.

﴿ أئِفكاً آلِهَةً دُوْنَ اللهِ تُرِيْدُونَ ﴾ ئایا ئێوە چۆن بەدرۆوە چەند خوایێ داوا ئەکەن و ئەیان پەرستن لە جگەی خوا، بەباوەڕو بڕوای ڕاستەقینەوە نیە. بەڵکو بەبوختان و گومڕاییەوە ئەیان پەرستن.

﴿ فَما ظَنَكُمْ بِرَبِ العالَمِيْنَ ﴾ ئایا دوای ئێوە بەچ شتێ گومان ئەبنە پەروەردگاری هەمو بونەوەران کەبەڕاستی شایستەی پەرستنە هەتا وازی لێ بهێنن و ئەو بتانە بپەرستن؟

بۆزانین: تاقمەکەی ئیبراهیم لەبەر ئەوەی ئیبراهیم واز لەتانەدان و خراپەی خواکانیان بهێنێو داوایان لە ئیبراهیم کرد لەگەڵیان بڕوا بۆلای جەژنەکەیان و، بەشداریان بکا لەڕابواردندا.بەڵکو خوی ئەوان بگرێ. بەڵام ئیبراهیم لەدڵیا نیازی دابو، بەڵگەی ئاشکرایان بۆ پەیدابکا لەسەر ئەوەی خواکانیان خاوەنی زیان و سود گەیاندن نین، لەبەر ئەوەی نەڕوا لەگەڵیان بڕوبیانوی بۆ هێنانەوەو، توشی گومانی کردن و ووتی:

﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُجُوْمْ. فَقالَ إنِي سَقِيْم. فَتَوَلُوا عَنْهُ مُدَبِرِيْنَ ﴾ تەماشای هەڵهاتنی ئەستێرەکانم کرد\وە بەتەماشا کردنێکی قوڵ، بۆم دەرکەوتوە. بەڕاستی من تووشی نەخۆشی تاعون بووم کەئەو کاتە بڵاوبوبوەوە لەناویانا، دوایی تاقمەکەی ئیبراهیم لەبەر ئەوەی تووشی تاعون نەبن پشتیان کردە ئیبراهیم. چون بۆلای کۆبونەوەی جەژنەکەیان، زۆر بەپەلە. ئەو گەلەی سەردەمیئیبیراهیم بڕوایان وابو کە ئەستێرەکان سەرچاوەی هەمو شتێکن.

ئەوانەی مانای قورئانی پیرۆزیان کردوە مانای زۆریان بۆ وشەی (سقیم ) باسکردوە، لەهەمویان بەهێزتر ئەمەیە کەبەمانا ( شاك ) بێ، یانی بەڕاستی من ئێستا لە گومانداو و سەرگەردانم ئەگەڕێم و وورد ئەبمەوە لەبەر ئەوە ڕانموی ببم بۆلای دروست کەری بونەوەران و، بەڕاستی تەماشای بتەکانم کردوە، دوایی بڕوای بێگومانم پەیداکردوە کەئەوان خوانین، لەپاشا تەماشای ئەستێرەکانم کردوە، دوایی من ڕانموییی نەبوم بۆلای هیچ شتێ. بەڵکو لەسەر گومان و سەر گەردانی ماومەتەوە، ئیبراهیم لەو فەرمودەیەدا ئەیەوێ لەگەڵ تاقمەکەی نەڕوا لەگەڵیان هەتا بە بەڵگەی ڕاست بۆریان بدا و بیانویان ببڕێ ئەگینا ئەو گومانی لەبونی خودا نەبوەو ئەیزانی ئەستێرەکان هیچ شتێ فێری ئادەمیزاد ناکەن.

﴿ فَراغَ إلى آلِهَتِهِمْ فَقالَ ألا تَأكُلُونَ مـالَكُمْ لاتَنْطِقُـونَ ﴾ دوای چوونـی تاقمەکـەی بـۆلای کۆڕی جەژن، ئیبراهیم بەهـەڵی زانـی و ، بەنـهێنی چـو بـۆلای خواکانیـان و تەماشـای کـردن خواردنی زۆر لەلایان دانراوەو، گفتوگۆناکەن، دوایی ئیبراهیم ووتی: ئایا ئێوەی بـەخوا کـردو بۆئەو خواردەمەنیانە ناخۆن و، گفتوگۆناکەن و وەڵام نادەنەوە.

﴿ فَراغَ عَلَيْهِمْ ضَرْباً بِالْيَمِينِ ﴾ دوایی ئیبراهیم بەنهێنی چـوە سـەر خواکانیـان و، بەدەسـتی ڕاستی دەستی کرد بەلێدانیان و شکاندنی و پارچـە پارچـە بـوون، جگـە لـەبتـە گەورەکـەیان، بۆئەوەی بچنەلای کەهاتنەوە.

﴿ فَأقْبَلُوا إلَيْهِ يَزِفُّونَ . قالَ أتَعْبُدُونَ ماتَنْحِتُونَ . وَاللهُ خَلَقَكُمْ وَما تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی تاقمەکەی بەپەلە هاتنەوە بۆلای ئیبراهیم و ، ووتیان: ئایا تۆ ئەو کارەت کردوە؟ ئیبراهیم ووتی :هاوار بـۆ ئێوە. ئایا ئێوە چۆن شتێ ئەپەرستن خۆتان تاشیوتانن. بەڕاستی خوا دروست ناکرێ، ئێوە خۆتـان پاسەوانی ئەوان ئەکەن دەست درێژی نەکرێتە سەریان، ئیتر چۆن ئەبی خوا بن و، وە خوا ئێـوە و هەموو شتێ ئێوە ئەیکەن دروستی کردوون.

﴿ قالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْياناً فَألْقُوهُ فِي الْجَحِيْمَ ﴾ تاقمەکەی ئیـبراهیم دەسـەڵاتی گفتوگۆکۆدنیـان لـەگەڵ ئیبراهیما نەماو ، پەلاماریان برد بۆلای هێزو ووتیان: ئێوە جێگەیەکی زۆر گـەورەو قـوڵ دروست بکەن بۆ ئیبراهیم و پڕی بکەن لەدارو لەسوتەمەنی و ئاگری تێ بەردەن و، دوایی ئێوە ئیبراهیم فڕە بدەن بۆلای ئەو ئاگرە سەختە.

﴿ فَأرادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْناهُمْ الأسْفَلِيْنَ ﴾ دوایی ئەوان ویسـتیان پیلانـی لـەناوبردن سـاختە بهێنن بۆ ئیبراهیم، دوایی ئێمە ئەوانمان گێڕا بەسەر شۆڕ و ڕسوای هەردوو جیهان، ئەوان پەکیان کەوت و ئیبراهیم ڕزگاری بو لەسوتان و خوا ئاگرەکەی بۆ سارد کردەوە.

﴿ وَقالَ إنِي ذاهِبٌ إلى رَبّي سَيَهْدِينِ ﴾ وە ئیبراهیم دوای ئەوەی ڕزگـاری بـوو لـەپیلانی ئەوان، نیازی کرد کۆچ بکا لایان و، بڕوا بۆ جێگەیە بەبێ تـرس خـوا بپەرسـتێ و ووتـی: مـن ئەڕۆم بۆلای جێگەیە پەروەردگاری من بۆی دیاری کردووم، دوایـی ئـەو شارەزایی مـن ئـەکا بۆلای ڕێگەی ڕاست و شتێ چاکبێ بۆ ئاییندکەم.

بۆ زانین: لەفەرهەنگی نامەی پیرۆزی گاورەکـاندا هـاتوە:{شـوێنەوارو نیشـانە و نەخشـەیە دۆزراوەتەوە مێژوەکانیان ئەگەڕێتەوە بۆلای دووهـەزار سـاڵ بەرلـەدایك بوونـی عیسـا،نـاوی ئیبراهیم نووسراوە لەسەری: ابرامو. ابرام. ابرامـا و، مێـژووی تـازەیش دەریخسـتوە نەخشـەی شاری {ئور} وەك ئەو سەردەمەی ئیبراهیمی تێدابوەو، دوای کۆچی کردوە بۆ شام }.



يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾

﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِيْن. فَبَشَّرْناهُ بِغُلامٍ حَلِيْمٍ ﴾ کاتی ئیبراهیم بوبو، هەتا ئەوکاتە خوای مەزن منالّی پێ نەبەخشیبوو، لەخوای گەورە پاڕایەوەو ووتی: ئەی پەروەردگاری من تۆ ببەخشە بەمن کوڕێك لەباوەڕداران وپیاوچاکان، بۆئەوە لەم کاتی پیریما یارمەتیم بدا، پاڕانەوەکەم لێ وەرگرت، دوایی ئێمە موژدەمان دایە بەکوڕێکی زۆر بەئارام و بەشەرم، ناوی نا بە ئیسماعیل، لەپاشا بردی بۆلای شیوێکی بێ شینایی کشتوکاڵ لای خانەی ڕێزداری خوا.

﴿ فَلَّما بَلَغَ مَعَهُ السَّعيَ قالَ يابُنَيَّ إِنِي أرى فِي الْمَنامِ أَنِي أَذْبَحُكَ فَأَنْظُرْ ماذا تَرى ﴾ دوایی کاتێ ئەو کوڕە پێگەیشتوو گەورە بو، توانای پەیدا کرد لەسەر کۆشش لەگەڵ باوکیا لەکاروباری جیهانداو یارمەتی بدا بۆ بەجێ هێنانی کارەکانی ، ئیبراهیم بەر لەشەوی ( عەرەفە ) خەوێکی بینی ، ووتی: ئەی کوڕی خۆم: خوا فەرمانی پێداوم لەخەوما کەتۆ سەر ببڕم، دوایی بیر لەوکارە بکەرەوەو ئاماژە بکە بۆ بیروبۆچوونی خۆت لەوبارەیەوە. سێشەو لەسەریەك ئەو خەوەی بینی ،دوایی بۆی دەرکەوت فەرمانێکە خوا فەرمانی پێداوەو ئەبێ بکرێ.

﴿ قالَ ياأَبَتِ افْعَلْ ماتُؤمَرُ سُجِّدنِي إِنْ شاءَ اللهُ مِنَ الصّابِرِيْنَ ﴾ کوڕەکەی ووتی: ئەی باوکی خۆم: ئەوشتەی لەلایەن خواوە فەرمانت پێ دراوە بیکەو جێ بەجێی بکە، ئەگەر خوا ئارەزوو بفەرموێ، منت دەست ئەکەوێ لەوکەسانە بم ئارم ئەگرن لەسەر فەرمودەی خوا.

﴿ فَلَما أسْلَما وَتَلَّهُ لِلْجَبِيْنِ ﴾ دوایی کاتی ئیبراهیم وئیسماعیلی کوڕی مل کەچ و سەرشۆڕی فەرمودەی خوا بون و، ئیبراهیم کوڕی خۆی ڕاکێشا بەسەر زەویدا ولەسەر تەنیشت و تەوێڵی نایە سەر زەوی و ویستی سەری ببڕێ، خوا فەرموی: پەلە مەکە لەسەربڕینیدا.

﴿ وَنادَيْناهُ أنَ يا إبْراهِيْمُ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤيا إنّا كَذلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ وەئێمە بانگی ئیبراهیممان کرد، ئەی ئیبراهیم : بەڕاستی ئەو شتەی ئێمە لەخەودا فەرمانمان دا بەتۆ جێ بەجێت کردو مەبەستەکە هاتە دی، وەك سەرت بڕیبێ وایە. بەڕاستی هەربەوجۆرەی ئێمە دوای خەفەت وناخۆشی تۆمان شادمان کرد هەر بەوجۆرە ئێمە پاداشتی هەموو کەسێ ئەدەینەوە چاکە بکاو فەرمانی خوا بەجێ بهێنێ.

﴿ إنَّ هذا لَهُوَ الْبَلاءُ الْمُبِيْنَ ﴾ بەڕاستی پەلاماردانی ئیبراهیم بۆ سەربڕینی کوڕەکەی و، خۆدانەوە دەستی ئەو کوڕە بۆئەوەی سەری ببڕێ تاقی کردنەوەیەکی ئاشکرا بوو بۆ جوێ کردنەوەی پیاوچاکانی و پیاوخراپان.

﴿ وَفَدَيْناهُ بِذَبْحٍ عَظِيْمٍ ﴾ وەئێمە کردمان بەسەر گەردانی ئیسماعیل سەربڕاوێکی زۆر گەورەو قەڵەو، بەرانێکمان بەجبرەئیلدا نارد بۆ ئیبراهیم لەجیاتی کوڕەکەی سەری ببڕێ وبیکا بەقوربانی.

﴿ وَتَرَكْنا عَلَيْهِ فِي الآخَرِيْنَ . سَلامٌ عَلى إبْراهِيمَ كَذلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِيْنَ ﴾ وەئێمە ئیبراهیممان گێڕا کەلەناو نەتەوەکانی دواییدا زۆر بەچاکی وپاکی و خوا پەرستی باسی بکەن وستایشی بکەن و، بڵێن: بێوەیی وئاشتی وئاسایش لەسەر ئیبراهیم بێ، هەربەوجۆرە ئیبراهیممان ڕزگار کرد پاتداشتی هەمو پیاوچاکان ئەدەینەوە.

﴿ إنَّهُ مِنْ عِبادِنا الْمُؤمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی لەبەرئەوەی ئیبراهیم یەکێکە لەو بەندانەی ئێمە بەنیازی پاکەوە باوەڕی هێناوە ئێمە ئەو چاکە گەورەیەمان لەگەڵ کردو، ڕزگارمان کرد لەوەی کوڕەکەی خۆی سەربڕێ.

زانایان ئەڵێن: ئیبراهیم شەوی هەشتی مانگی زیل حیجە خەوێکی بینیو کەسێ پێیووت: خوا فەرمانی داوە بەسەر بڕینی ئەو کوڕەی خۆت. بەیانی بیری کردەوە ئایا ئەو خەوە ڕاست بێ یا نە، بۆیە ئەوەڕۆژە ناونراوە بەڕۆژی ( يوم التروية ) یانی ڕۆژی بیرکردنەوە. لەشەوی نۆی مانگداخەوێ تری بینی پێیان ووت: بەیانی بۆت دەرئەکەوێو ئەزانی خەوەکەت ڕاستە؛ بۆیە ئەو ڕۆژە ناونراوە بە (يوم العرفة) یانی ڕۆژی زانینی ڕاستی. لە (١٠)ی مانگی زیل حیجەدا خەوێ تری بینی پێیان ووت: ئەبێ بەیانی ئەو کوڕەت سەربڕی؛ بۆیە ئەو ڕۆژە ناوبراوە بە (يوم الفخ) یانی ڕۆژی سەربڕین.

زانایان بیرو بۆچونیان لەبارەی ئەو کوڕە فەرمان دراوە بەسەر بڕینی ئایا ئیسحاقە یا ئیسماعیلە؟ هەندێکی کەم لەزانایانی ئیسلام و جوەکان لایان وایە ئەو کوڕە ئیسحاقەو ئیبراهیم بردویەتی بۆ مەکە سەری ببڕێ.

بەڵام زوربەی زۆری زانایان ئەڵێن: ئەو کورە ئیسماعیلە بەگوێرەی ئەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- ئایەتەکانی ( ١٠٢-١٠٣ ) بەزەقیو بەئاشکرا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو کورە موژدە پێدراوە ئەو کەسەیە کەلەگەڵ ئیبراهیمدا کاری کردوە ئیسماعیل بوە، کوڕی گەورەی ئیبراهیمە، بەلای هەمو زانایانەوە. بە گاورەکان و جوەکانیشەوە ئەو کوڕەی فەرمانی پێدراوە سەر ببڕێ کوڕی گەورەی ئیبراهیم بوە، کەواتە بریتیە لە ئیسماعیل. نەك ئیسحاق، چونکە لە ئیسماعیل منالترە.

٢- ئایەتی ﴿ وَبَشَرْناهُ بِأسْحاقَ نَبِياً مِنَ الصالْحِيْن ﴾ موژدەدانە بە ئیبراهیم لەپاداشتی ئەوەدا بەفەرمانی خوای مەزن هەڵساوەو، پەلاماری داوە کوڕی گەورەی خۆی سەرببڕێ کوڕێ تری بداتێو بیکا بە پێغەمبەرو پیاو چاك.

٣- ئەگەر سەربڕاوەکە ئیسحاق بوایە؛ سەربڕینی قوربانی. ڕاکردنی نێوان سەفاو مەروە. بەردەبارانی شەیتان لەشام دا بوایە؛ چونکە خاتون ساراو ئیسحاقی کوڕی دانیشتوی شام بوون.

﴿وَبَشَرْناهُ بِأسْحاقَ نَبِياً مِنَ الصالْحِيْن﴾ وە ئێمە موژدەمان دا بە ئیبراهیم بەکوڕێ تر ناوی ئیسحاقەو ئەیکەین بە پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرە چاکە خوا ناسەکان لەپاداشتی ئەوەدا بەفەرمانی خوا هەڵساو پەلاماری سەر بڕینی کورە گەورەکەی خۆی هەڵساو ئارامی گرت لەسەر ئازار.

﴿ وَبارَكْنا عَلَيْهِ وَعلى إسْحاقَ. وَمِنْ ذُر بَيْتِهما مَحْسِنَ وَ ظالِمٌ لِنَفسِهِ مُبِيْنٌ ﴾ وە ئێمە پیت و فەڕو پیرۆزی هەردوو جیهانمان ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاقداو، کوڕو نەوەی زۆرمان دانێ. وەهەندێ لەمناڵەکانی ئیبراهیم و ئیسحاق بەپەرستنی خواو باوەڕهێنان چاکە ئەکەن بۆ خۆیان و، هەندێ تریان ستەم لەخۆیان ئەکەن بەستەمێکی ئاشکرا، بێ فەرمانی خوا ئەکەن و باوەڕناهێنن.

وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ



﴿ وَلَقَدْ مَنَنّا عَلى مُوسا وَهارُوْنَ. وَنَجَيْناهُما وَقَوْمَهُما مِنَ الكَرْبِ العَظِيْم ﴾ وە بەڕاستی ئێمە چاکەمان لەگەڵ موساو هاروندا کرد بەوەی کردمان بە پێغەمبەرو، ئێمە ئەوان و تاقمەکانیانمان ڕزگار کرد لەخەفەتی ئازاردانی بەنو ئیسرائیلیەکان لەلایەن فیرعەون و تاقمەکەیی‌و، لە خنکانیان بەئاو.

﴿ وَنَصَرْناهُم فَكانُوا هُمُ الغالِبِيْنَ ﴾ وەئێمە یاریدەی موساو هارون و تاقمەکانیانماندا، دوایی هەر ئەوان زاڵبون بەسەر فیرعەون و تاقمەکەیاو، ڕزگاریان بوو لەبەندایەتی‌و چەوساندنەوە.

﴿ وَآتَيْناهُما الكِتابَ المُسْتَبِيْن. وَهَدَيْناهُما الصِراطَ المُسْتَقِيْمَ ﴾ وە ئێمە نامەیەکی ڕوناك و ئاشکرامان بەخشی بەموساو هارون کە بریتی بوو لەتەورات، هەمو یاساکانی خوای تیادا ڕون کرابووەوو،ئیمە ئەوانمان شارەزای ڕێگە ڕاستی خوا پەرستیمان کردن.

﴿ وَتَرَكْنا عَلَيْهِما فِي الآخَرِيْنَ. وَسَلامٌ عَلى مُوسا وَهارُوْنَ ﴾ وە ئێمە جێمان هێشت بەسەر موساو هاروندا لەناو گەلانی دواییدا باسیان بکەن بەچاکەو ستایش و خوا پەرستی، ئاشتی‌و ئاسایش و ڕەزامەندی خوا لەسەر موساو هارون بێ.

﴿ إنا كَذلِكَ نَجزِي المُحْسِنِيْنَ. إنَهُما مِنْ عِبادِنا المُؤْمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی ئێمە هەر بەو جۆرەی موساو هارونمان ڕزگارکرد لە ئازاری فیرعەون،هەر بەو جۆرە ئێمە پاداشتی هەمو پیاو چاکان ئەدەینەوەو شایستەی ئەوەیشن، بەڕاستی موساو هارون لەبەندە باوەڕدارو نیاز پاکەکانی ئێمەن.

﴿ وَإنَ الياسَ لَمِنَ المُرْسَلِيْنَ. إذْقالَ لقَوْمِهِ ألا تَتَقُوْنَ ﴾ وە بەڕاستی ئیلیاس یەکێ بوو لەڕەوانەکراوەکان. پێغەمبەرێ بو لە پێغەمبەرەکان. تۆ بیر کەرەوە کاتێ ئیلیاس بە تاقمەکەی خۆی ووت: ئایا ئێوە بۆ لەسزای خوا ناترسن؟ ئیلیاس کوڕی یاسینە لە نەوەی هارونی برای موسایە.

﴿ أتَدْعُوْنَ بَعْلاً وَتَذَرُوْنَ أحْسَنَ الخالِقِيْنَ. اللهُ رَبَكُمْ وَرَبْ آبائُكُمْ الأَوَلِيْنَ ﴾ ئایا ئێوە بۆ ئەو بتەی ئەوتۆ ئەپەرستن خۆتان و ناوتان ناوە ( بەعل ) وواز لەکەسێ ئەهێنن شیرینترین بونەوەری دروست کردوە کە ئادەمیزادە، ئەو کەسەیش خوایەو پەروەردگاری ئێوەو باو باپیرە پێشوەکانتانەو ئێوە بەخێو ئەکا.

﴿ فکذبوهُ فإنهم لمحضرون إلا عِبادِ اللهِ المخلصِين ﴾ دوایی تاقمەکـەی ئیلیـاس ئیلیاسـیان بەدرۆ خستەوە، دوایی ئەو تاقمە ئامادە ئەکرێن و ئەنێرێن بۆلای ئــاگری دۆزەخ، لەبەرئـەوەی بگەن بە پاداشتی خۆیان، ئەو تاقمە ڕزگاریان نابێ لەسزای خوا مەگەر ئـەو بـەندە نیـاز پـاك و هەڵبژێردراوانەی ئێمە نەبێ کە ڕزگاریان ئەبێ لەسزاو پاداشتی چاکەی خۆیان وەرئەگرن.

﴿ وتَرَكْنا عَلَيْهِ فِي الآخرِيْنَ. سَلامٌ عَلى إلْ ياسِيْنَ. إنا كَذلِكَ نُجزِي المُحسِنِيْنَ. إنَهُ مِنْ عِبادِنا المُؤمِنِيْنَ ﴾ وە ئێمە جێمان هێشت بەسەر ئیلیاساو لەناو گەلانی دوایدا ناوی بەرزی بێپاو چـاك و خوا پەرست و ستایشی بکرێ بەچاکەو، لـەسەر ئیلیاس بـێ ئاشتیو ئاسایش و ڕەزامـەندی خوا. بەڕاستی هەر بەو جۆرەی پاداشتی ئیلیاسمان دایەوە، هەر بەو جۆرە ئێمە پاداشـتی پیـاوانی چاکەکەر ئەدەینەوە، بەڕاستی ئیلیاس لەبەندە باوەڕدارو نیاز پاکەکانی ئێمەیە.

هەندێ لـەزانایان ئەڵێن: ئیلیاس ئەو پێغەمبەرەیە ناوی براوە بە ئیدریس و، لەئایاتی (٥٦) ی سورەتی مەریەمداو، لە ئایەتی(٨٥)ی سورەتی ئەلئەنبیائدا باسی کراوە.

وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾

﴿ وَ إنَ لُوطاً لَمِنَ المُرْسَلِيْنَ. إذ نَجَيْناهُ وَأَهْلَهُ اجْمَعِيْنَ. إلا عَجُوزاً فِي الغابِرِيْنَ ﴾ وە بەڕاستی لـووتی کوڕی هاران لـە ڕەوانەکراوەکان و لـە پێغەمبەرەکانی خوایە، تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە

ئێمە لـووت و هەمو خێزانەکـەیمان ڕزگـارکردن جگـە لـە پیرەژنـێ کـەژنی لوتبـو لـەناو ئـەو کەسانەدا مابونەوە، ئەهاتە دەرێو توشی سزا بو.

﴿ ثُمَ دَمَرْنا الآخَرِيْنَ. وَانَكُمْ لَتمُرُّونَ عَلَيْهِمْ مَصْبَحِيْنَ. وَبـالّيْلِ افَـلا تَعْقِلُـوْنَ ﴾ لەپاشـا ئێمـە ئەوانەی مابونەوەو باوەڕیان نەهێنابو لـەناو مان بردن و، بەڕاستی ئێـوە بەشـەو بـەڕۆژدا ئـەڕۆن بەسەر شوێنەواری جێگەکانیاناو، ئێوە بەڕێگەدا ئەڕۆن بۆشام بۆبازرگانی. ئایا ئێوەی بێباوەڕانی مەکە بۆ بیر لـەپاشەڕۆژی خۆتان ناکەنەوە کاتێ شوێنەواری ئەوان ئەبینن و تـەمێ خـوار بـبن و باوەڕ بهێنن.

﴿ وَإنَ يُونُسَ لَمِنَ الُمرْسَلِيْنَ. إذْ أبَق إلى الفُلْكِ المَشْحُوْن ﴾ وە بەڕاستی یونسـی کـوڕی مـەتا یەکێکە لـە پێغەمبەرەکان تۆ بیری بەسەرهاتی بکەرەوە کاتێ هەڵـهات بـەبێ دەستوری خـوای پەروەردگاری خۆیو، ئومێدی بـەوە نـەما دانیشـتوانی ( نەینـەوا ) بـاوەڕی پیبـهێنن کـە خـوا ڕەوانەی کردبو بۆلایان و،ڕۆیی بۆلای دەریای ڕۆم و کەشتیەکی پڕ کەل و پـەل و ئـادەمیزادی دەست کەوت و داوای کرد سواری کەشتیەکەی بکـەن و سـواریان کـرد. هـەندێ لـەزانایان ئەڵێن: یونس دانیشتوی شاری نەینەوایە.

﴿ فَساهَمَ فَكانَ مِنَ الُمدْحَضِيْنَ. فَالتَقَمَهُ الحُوْتُ وَهُوَ مُلِيْمٌ ﴾ دوایی ئەوەی کەشتیەکە کەوتە ڕێگە بەناو دەریادا، ڕەشەباو گەردەلول هەڵی کـرد بەسـەریاناو شـەپۆلی گـەورە ئـاو لـەهـەمو لایەکەوە ئەهات بۆلای، نزیکبو بکەوێتە ژێر ئـاو، بـەناچاری وەستا. دوایـی لـەبـەر سـوکبونی بارەکەی هەمو کول و پەلی ناو کەشتیەکەیان فڕێ دایە ناو ئاوەکە. بەڵام هێشتا کەشـتیەکە لـە جم و جۆڵ نەوەسـتا، دانیشـتوانی نـاو کەشـتیەکە داوایـان کـرد کـە پشـك ڕابکێشـن بـەناو دانیشتوانی ناوکەشتیەکە بەر هەر کەسێکا کەوت خۆی فڕێ بداتـە نـاو ئـاوی دەریاکـە. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ: دوایی پشکیان ڕاکێشاو کەوتە سەر یونس و، بوبە یەکێ لـەو کەسـانە شکستی خواردو، خۆی فڕێدایە ناو ئاوی دەریاوە، دوایـی نەهـەنگێ قوتـی داو،یونـس توشـی لۆمەی خوا بو، چونکە ئارامی نەگرت لـەسەر ئازاری تاقمەکەی خۆی، وەك پێغەمبەرانی تر.

﴿ فَلَولا إنَهُ كانَ مِنَ المسبحين. لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِ إلى يَوْمِ يُبْعَثُـوْنَ ﴾ دوایـی ئەگـەر یونـس لـەو کەسانە نەبوایە بەزۆری پاکی. وریزی بۆخوا دەرنەبڕیایەو یادی خوای نەکردایەتـەوە، بەڕاسـتی لـەسکی ئەو نەهەنگەدا ئەمایەوە هەتاڕۆژێ هەمو ئـادەمیزاد زینـدو ئەکرانـەوە، سـکی ئـەو نـە هەنگە ئەبو بەبەندی خانە بۆی.

﴿ فَنَبَذْناهُ بِالْعَراءِ وَهُوَسَقِيْمٌ . وأنبتنا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنّ يَقطِيْنِ ﴾ دوایی ئێمە یونسـمان فڕەدایـە جێگەیەکی چۆڵ لەدرەخت وئـاو وشینایی وئـادەمیزاد و، یونـوس نـەخۆش و دەردەداری نـاو ئازاری سکی نەهەنگە بوو، لـەتەنیایی و ئازر خۆی ئەترسا، دوایـی ئێمـە ڕواندمـان بەسـەرێیەوە درەختێ لـەکولەکـە، سـێبەری کـرد بەسـەرێیەوەو لـەگـەرمای خـۆری پاراسـت و لـێـی دوور خستەوەو، ترسەکەی نەماو هەستی بە خۆشی کردو ئومێدی زۆرتری پەیدا کـرد بـە میهرەبانی وبەزەیی خوای مەزن.

﴿ وَأَرْسَلْناهُ إِلى مِئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ . فَآمَنُوا فَمَتَّعْناهُمْ إِلى حِينٍ ﴾ وەئێمـە یونسـمان ڕەوانـە کرد بۆلای سەدهەزار لەدانیشتوانی ( نەینەوا ) یا زۆرتر کاتێ تەماشا بکرانایـە وادەرئەکـەوت ئەو ئەندازەیە بن دوایی هەموویان باوەڕیان هێناو داوای لێبوردنیان لـەخوا کـرد کەیـەکم جـار باوەڕیان نەهێنابوو، دواتـر ئێمـە بـەرخوردارمان کـردن هـەتا کۆتـایی تەمـەنیان زۆر بەخۆشـی وئاسودەیی بژین و، بەوێنەی گەلانی پێغەمەرانی تر سزامان نەدان.

بۆ ئاگاداری : خوای مەزن یونسی نارد بـۆلای دانیشـتوانی نەینـەوا، فـەرمانی خـوای پـێ ڕاگەیاندن، ئەوان یەکەم جار باوەڕیان نەهێنا، یونوس کۆچی کرد لایان لـەبەئەوەی ئەترسا ئـەو سزایە خوا بەڵێنی پێ دابوو برژێ بەسەر تاقمەکەیا تووشی ئەمیش بێ، دوای ڕۆیشتنی یونـوس لەلایان هەموویان باوەڕیان هێناو داوای لێ بوردنیان لـەخوا کردو، گـەڕان بـەدوای یونوسدا و خوا لـەوان خۆشبوو، دوایی یونوس گەڕایەوە بۆلایان و، بەگەرمی پێشوازیان لێ کرد.

فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَا إِنَّهُمْ مِنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾

﴿ فاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبناتُ وَلَهُمْ الْبنُونَ ﴾ دوایی تۆ پرسیار بکە لـەو کەسانەی گومانیان وایە فریشتەکان کچی خوان: ئایا بۆ ئەبێ پەروەردگاری تۆ کچـی هـەبێ کـە کـچ لای ئـەوان بـێ نرخەو، ئێـوە کوڕتـان هـەبێ. کەواتـە زۆر جێگـەی سەرسـوڕمان و ڕسـواییە کـەئێوە خۆتـان بەگەورەتر دائەنێن لـەخوا.

﴿ أَمْ خَلَقْنا الْمَلائِكَةَ إِناثاً وَّهُمْ شاهِدُونَ ﴾ ئایا ئێمە کاتێ فریشتەکانمان دروست کرد بەژن، ئەو کەسانە ئامادەبوون لـەوکاتەدا لای ئێمە؟ ئێوە فریشتەکانتان بینیوە بزانن ژنن یـا پیـاو، ئیـتر

چۆنتان زانیوە ژنن. زۆر ئاشکرایە لای هەموو کەسێ ئەو کاتە ئامادە نەبوون و، بەڵگەیشتان نیە هەتا بزانن پیاون یا ژن.

﴿ ألا إنَّهُمْ مِنّ إفكِهِمْ لَيَقُولُونَ وَلَدَ اللهُ وَإنَّهُمْ لَكاذِبُونَ ﴾ ئێـوە ئاگـادارىن لـەدۆرو بوختانـە نارەواکانی ئەو کەسانەی ئەڵێن و گومانیان وایە خوا منالّی بوەو، ئەزانن ناگونجێ خـوا منـاڵی بوبێ و، بەراستی ئەوان درۆئەکەن لـەوەی ئەڵێن: خوا منالّی بوە، خوای مەزن زۆر دورە لـەوەی منالّی بوبێ .

﴿ اصْطفى البنات عَلى الْبَنِيْنَ ، مالَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ . اَفَلا تَذكَّرُونَ ﴾ زۆر درۆ ئەکەن لـەو گومانەی هەیانە خوا کچی هەڵبژاردوە بۆ خۆی و کوڕی دابێ بەوان، چ بەڵگەیەکی ئەوتۆ بـۆ ئێوە هەیەیو، چۆن ئێوە ئەو فەرمانەئەدەن خوا کچی هەیەو ئێوە کوڕتان هەبێ، ئایا ئێوە بـۆ بیر ناکەنەوە لـەبونەوەرانی خواو لـەتوانای خواوا لـەوەی خـوا دووره منـاڵی هـەبێ، دوایـی بۆتـان دەرکەوێ ئەو گومانەی ئێوە پوچەو بیروبۆچونتان نارەواو ناپەسەندە.

﴿ أمْ لَكُمْ سُلْطانٌ مُبِيْنٌ. فَأتُوا بِكِتابِكُمْ إنْ كُنْتُمْ مِنَ الصادِقِيْنَ ﴾ ئایا بەڵگەیەکی ئاشـکرا بـۆ ئێوە هەیە لـەئاسمانەوە بۆتان هاتبێ کەخوا فریشتەکانی بـەژن دروسـت کردبێ، بێگومـان ئێـوە بەڵگەتان نیە بۆ ڕاستی ئەو گومانەتان، دوایی ئەگەر هەتانە ئەو نامەیە بۆتان هاتوە بیهێنن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن؟

﴿ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجَنَةِ نَسَباً وَلَقَدْ عَلِمَت الجَنَةُ إنهُمْ لَمُحْضَرُوْنَ ﴾ وە بێباوەڕان بەگومانی خۆیان دایان ناوە کە خواو لـەنێوان جنۆکەکاندا خزمایەتیو زاوایەتیو خەزورایـەتیو دەسـت و پەیوەند دارە، گومانیان وایە جنۆکەکان دایکی فریشـتەکانن وخـوا بـاوکی ئەوانـەو، بەراسـتی جنۆکەکان ئەزانن. بەراستی ئەو بێباوەڕانە ئەو شتە نارەوایە ئەڵێن، ئامادە ئەکرێن بۆلای ئاگری دۆزەخ و سزا ئەدرێن.

﴿ سُبْحانَ اللهِ عَّما يَصِنِعُوْنَ. إلا عِبـادِ اللهِ الْمُخْلِصِيْـنَ ﴾ فریشـتـەکان ئـەڵێن: پـاکیو دووری بۆخوایە لـەشتێ ئەو بێباوەڕنە باسیان کردوە لـەهاوبەش دانان و کوڕو خەزورایەتی جنۆکەکان. بەڵام ئەو بەندە نیاز چاك و دەرون پاکانە ڕزگاریان ئەبێ لـە ئـاگری دۆزەخ. فریشـتەکان لــەو بەندانەی خوان و، ئامادەناکرێن بۆلای ئاگرو لـەو کەسـانە بـێزارن، ئـەڵێن: فریشـتەکان منـاڵی خوان.



فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا

عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾

﴿ فَانَكُمْ وَما تَعْبُدُونَ. ما انْتُم عَلَيْهِ بَفاتِنِينَ. إلاّ مَنْ هُوَ صالِ الجَحِيْمَ ﴾ دوایی ئێوەی بت پەرست و شتێ ئێوە ئەیپەرستن لە جگەی خـوا، نـەئێوەو نەئـەوان بەهەموتانـەوە هیـچ کەسێ لانادەن لەسەر خوا پەرستیو لایدەن لەرێگـەی ڕاست مەگـەر کەسێ بەسەربەستی ڕێگـەی خراپی گرتبێ، ئەو کەسە ئەگا بەگەرمایی ئاگری دۆزەخ و سزای ئەدری بەو ئاگرە.

﴿ وَما مِنا إلا لَهُ مقام مَعْلُومٌ. وَإنا لَنَحْنُ صافُوْنَ. وَإنا لَنَحْنُ المُسَبْحُوْنَ ﴾ وە ئێمـەی فریشتە ئەڵێین: هیچ یەکێ لە ئێمە نیە مەگەر پلەیەکی تایبەتیو دیـاریکراوی خۆی هەیە لەپەرستنی خواداو لە بەجێ هێنانی فەرمانەکانیو لەو سـنورە دەرنـاچین و تواناـمـان نیـە لـێی لابدەیـن و، بەڕاستی ئێمە ڕیزمان داوە بۆ پەرستنی خوا،هەر وەك ئەوەی ئێـوە ڕێـز ئـەدەن بـەنوێژو بەشتی ترەوە خەریك نابین و، ئێمە بەڕاستی هەمو کاتێ خوا پاك ئەکەینەوەو دوری ئەخەینەوە لە شتێ شایستەی ئەو نەبێ.

﴿ وَإنْ كانُوا لَيَقُولُونَ لَـو أنَ عِنْدَنـا ذِكْرَيْـنَ الأَوَلِيْـنَ. لَكُنـا عِبـادَ اللهِ المُخلَصِـنَ ﴾ وە بەڕاستی بێباوەڕانی قورەیش بەرلەهاتنە خوارەوەی قورئان ئەیان ووت: بەڕاستی ئەگەر بێتە خوارەوە نامەیە لەنامەکانی پێغەمبەرە پێشوەکان ئێمە بەڕاستی لەبەندە نیاز پاك و پوختەکانی خـوا ئـەبین و، باوەڕ بیەو نامەیە ئەهێنین. بەڕاستی نامەیە چاکتر لەو نامانە هات بۆلایان وەك قورئان بێ.

﴿ فَكَفَرُوا بِهِ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئەو نامەیە بەگوێرەی ئاواتی خۆیان هاتە خوارەوە بـۆ لایان و باوەڕیان پێ نەهێنا، دوایی خۆیان ئەزانن توشی چ سزایەکی سەخت ئەبن.

وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنا لِعِبادِنــا الْمُرْسَلِيْنَ . إنَّـهُمْ لَمَنْصُـورونَ . وَإنَّ جندنـا لَـهُمْ الغـالِبُونَ ﴾ وەبەڕاستی بەڵێن وفەرمودەی ئێمە بـۆ پێغەمـەرە ڕاسـتەکان وبـەندە نێردراوەکـانی ئێمـە پێـش کەوتوە کەبەڕاستی ئەوان سەرئەکەون و یاریدەیـان ئـەدرێ و، بەڕاسـتی سـوپای بـاوەڕدارانی پێغەمەرەکانی ئێمە، سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکانیانا هەربۆ ئەوانە لەهەردوو جیهاندا.

﴿ وَتُوَلَّ عَنْهُمْ حَتّى حِيْنٍ . وَأبْصِرْهُمْ فَسَـوْفَ يَبْصِـرُونَ ﴾ دوایـی تـۆ واز لـەبت پەرسـتان بهێنەو گرنگی بەبێباوەڕی ئەوان مەدە هەتا کاتی سەرکەوتنی تۆ دێت و خوا سەرت ئەخاو، تۆ کەمێ چاوەڕوانی ئەوان بکە لەپێش ئەوەی ببینی ئەو کوشتن و بەند کردنە تووشی ئەوان ئەبێ، دوایی ئەوان بەچاوی خۆیان ئەبینن سەرکەوتنی تـۆو یارمـەتیدانی خـوا بۆتـۆو، سەرشـۆڕی و ڕسوایی ئەوان، ئەوەبوو بەچاوی خۆیان بینیان لەڕۆژی بەدرو لە جەنگی ئەحزابدا بەچ جـۆرێ تووشی سزاو ڕسوایی بون، کاتێ ئەو ئایەتەی ( ١٧٥ ) هاتە خوارەوە. بت پەرسـتان ووتیـان چ کاتێ ئەو سزایە دێت. ئەگەر ڕاستە بابێت بۆلامان؟ خوا فەرموی :

﴿ أفَبِعَذابِنا يَسْتَعْجِلُونَ فَأذا نَزَلَ بِساحَتِهِمْ فَساءَ صَباحُ الْمُنْذِرِيْنَ ﴾ ئایا دوای بت پەرستان بۆ داوائەکەن سزای ئێمە تووشیان ببێ بەرلەکاتی دیاری خـۆی و، گومانیـان وایـە توشـیان نابێ بێگومان ئێمە سزایان ئەدەین، دوایی کاتێ سزای ئێمە هاتە خوارەوە بۆسەر جێگەو شوێنی ئەوان بەکوتوپڕی بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن ، دوایی ئەوە خراپ ڕۆژێکە بەیانی ئـەو بـێ باوەڕانـە ترسێنراون بەو سزایە لەلایەن پێغەمەرەکانەوە .

﴿ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتّى حِيْنٍ . وَأبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾ دوایی تۆ واز لەو بت پرستانە بهێنە و گرنگی بەوان مەدە هەتا سەرکەوتنی دێت و خوا سەرت ئەخاو، تۆ ئەو سـزایە دێتـە خـوارەوە ببینە. دوایی ئەوان ســەرکەوتنی تـۆو ڕسـوایی وسەرشۆڕی خۆیـان ئـەبینن و، ئـەزانن چیـان بەسەردێ. دووپات کردنەوەی ئەو ڕستانە دڵنیایی بونە لەوەی گومان لەهاتنە خـوارەوەی ئـەو سزایەدا نیە.

﴿ سُبْحانَ رَبِّـكَ رَبِّ العِزَّةِ عَمّـا يَصِنِعُـونَ . وَسَـلامٌ عَلـى الْمُرْسَلِيْنَ . وَالْحَمْـدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِيْنَ﴾ خوای مەزن پاك و دورە لەشتێ شایستەی پەروەردەکەری تـۆ نیـە کـەبت پەرسـتان باسی ئەکەن، پەروەردەکەرێکە خاوەنی گەورەیی و دەسـتەڵاتەو، ئاشـتی ودووربـون لەهـەموو خراپەیە لەسەر پێغەمەرەکانیێ و، هەموو سوپاس و ستایشی بۆ پەروەردگاری هەموو بونەوەرانـە لەسەر لەناوبردنی دوژمنانی ئاین و، لەسەر یاریدانی پێغەمەر .

پرسیار: زۆرجار بینراوە باوەڕداران لەجەنگدا شکستیان خـواردوەو، هـەندێ لەپێغەمـەران کوژراون، خوا ئەفەرموێ: سەرئەکەون و یارمەتیتان ئەدەین؟

وەڵام: سەرکەوتن چەند جۆری هەیە: هـەندێ جـار بەبەڵگـەو بـەهێز ئـەبێ. وایـش ئـەبێ بەچەك. وائەبێ بەئارام گرتن بەرانبەر ئازارو کارەسات. کەواتە ئەگەر باوەڕداران هـەندێ جـار شکست بخۆن بەهۆی کەم چەکییەوە ئەنجامیان سەرکەوتن ئەبێ. بەتایبەتی لەپاشەڕۆژدا.

# ﴿ سورەتی ســاد ﴾

لەمەککە هاتوەتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی (٨٨) ئایەتن.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾

( بسم اله الرحمن الرحيم )

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ صٓ ﴾ یانێ بەو پیتەو پیتەکانی تری وێنەی ئەو پیتە ئێمە دەست ئەکەین بەم سورەتانە کە قورئانی پیرۆز لەم پیتانە پێك هاتوەو، ئێوەی بت پەرست گفتوگۆیان پێ ئەکەن و، ئێوە نــاتوانن بەو پیتانە وێنەی سێ ئایەتێلەو قورئانەدا بنین. کەواتە ئەم قورئانە فــەرمودەی خوایــە ودانــراوی موحەمەدو ئادەمیزادی تر نیە، مانای ئەو پیتانە لەسورەتی ئەلبەقەرەو سورەتەکانی تردا کــراوە، زانایان مانی زۆرتریان بۆکردوە.

﴿ وَالْقُرآنُ ذِي الذِكْرِ . بَلْ الَّذِيْنَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَّ شِقاقٍ ﴾ وە سوێندم بەو قورئانەی خاوەنی ڕێزو نرخ وئامۆژگاریە بۆ گەلانی ڕابووردو و داهاتوو: لەلایەن خواوە هاتوەتە خوارەوەو ڕاستەو بێگومانە. بەڵام کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەناو گیرۆدەی خۆ بەگەورە داناندان لەئاستی بەڕاستی و لەناو دژایەتی خواو پێغەمەری خوادان، بۆیە باوەڕناهێنن.

﴿ كَمْ أهْلَكْنا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنّ قَرْنٍ فَنادَوْا وَّلاتَ حِيْنَ مَناصٍ ﴾ ئێمە زۆر تاقممان لە دانیشتوانی خولەکانی پێشوو لە پێش بت پەرستانی مەکەوە لەناو بردوون، دوای ئەوەی سزایان بینی بە ئاشکرایی ئەپاڕانەوەو پەشیمان ئەبونەوەو داوای لێ خۆشبوونیان ئەکردو، کاتی ڕزگاری نەبو، چونکە ئەوان باوەڕیان نەهێنا هەتا توشی سزا نەبون.

﴿ وَعَجِبُوا أنْ جاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِّنْهُمْ وَقالَ الْكافِرُونَ هذا ساحِرٌ كَذابٌ ﴾ وەقورەیشیەکان سەریان سوڕئەما کەهاتوە بۆلای ئەوان پێغەمەرێ لەخۆیان بیانترسێنێ لەسزای خواو لەڕەگەزی خۆیانبێ و، لەپیاوەگەورەکانی فارس و ڕۆم و ، لە فریشتەکانو جنۆکەکان نەبێ و، بێ باوەڕان ووتیان: ئەم موحەمەدە جادو گەرو زۆر درۆزنە.

﴿ أجَعَلَ الآلِهَةَ إلهاً وّاحِداً إنّ هذا الشيءٌ عُجابٌ﴾ ئایا چۆن موحەمەد چەند خوای ئەگێڕێ بەیەك خوا. بەڕاستی ئەوەی موحەمەد ئەیڵێ، زۆر شتێکی سەسوڕێنەرە، چونکە بانگیان ئەکا بۆلای شتێ لە باوباپیرانیانەوە نەیان بیستوە.

پیاوە گەورەکانی قورەیش بڕیاریاندا بچنە لای ئەبو تالیب، لەبارەی پێغەمەرەوە گفتوگۆی لەگەڵ بکەن و، چونە لای و ووتیان : تۆئەزانی ئەم برازایەی تۆ، کۆڕوکۆمەڵەکەی چ شتێ بەئێمە ئەڵێن. ئێمە هاتوینە لای تۆ فەرمانێ دیاری بکەی لەنێوان ئێمە وئەواندا. بەوبۆنەوە ئەبوتالیب پێغەمەری بانگ کردو ووتی: ئەمانە خزمی تۆن و داواتان لێ ئەکەن کەبەیەك جاری داواکانیان پاڵ پێوە نەنێی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: داوای چ شتێ ئەکەن، ووتیان: تۆ واز لەخواکانی ئێمە بهێنە، ئێمەیش واز لەتۆو خواکەت ئەهێنین، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: ئەگەر من داواکانتان وەربگرم، ئێوە یەك داوای من وەرئەگرن ، ووتیان.بەڵێ. بەزۆرترەوە. پێغەمەر فەرموی: بڵێن: ﴿ لاإلهَ إلاّ اللّٰه ﴾ ووتیان زۆر سەیرە، ئێمە داوای چ شتی ئەکەین وئەو چ شتێ ئەڵێ.

﴿ وَانْطَلَقَ الْمَلأُ مِنْهُمْ أنِ أمشوا وَاصْبِرُوا عَلى آلِهَتُكُمْ إنَّ هذا الشَئُ يُراد ﴾ وەبەپەلە پیاوە گەورەکان لەوانەی لای ئەبوتالیب چونە دەرەوەو بەیەکتریان ووت:ئێوە بڕۆن وئێوە ئارام بگرن و بەردەوامبن لەپەرستنی خواکانی خۆتان و لامەدەن. بەڕاستی دژایەتی موحەمەد وپەرستنی خواکانی خۆتان شتێکە کراوە بەمەبەست بۆ ئێمەو، چارەیەترمان نیە جگەی خۆڕاگرتن لەسەر ئایینی خۆتان، موحەمەدیش ئەیەوێ ئێمەو هەمو ئادەمیزاد بکا بەبچوکی خۆی.

﴿ ماسَمِعْنا بِهذا فِي الْمِلَّةِ الآخِرَةِ إنْ هذا إلاّ اخْتِلاقٌ ﴾ ئەوەی موحەمەد ئەیڵێ: کەهەریەك خوا هەبێ ئێمە نەمان بیستوە نەلەباوباپیرانی خۆمانەوە نەلە نەتەوەکانی ترەوە. ئەوەتە گاورەکان ئەڵێن: سێ خوا هەن وجوەکانیش ئەڵێن: عوزەیر خوایە، ئەوەی موحەمەد هێناویەتی هیچ شتی نیە جگە لەوە درۆو بوختان دروست کردنی خۆیەتی.

﴿ أ أنْزِلَ عَلَيْهِ الذِكْرُ مِنْ بَيْنِنا بَلْ هُمْ فِي شَكٍ مِنْ ذِكْرِي بَلْ لَمّا يَذُقوا عَذابِ ﴾ ئایا قورئـان بەتەنها چۆن نێراوەتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد لەنێوان ئێمەداو، ئێمە پلەمان لەو بەرززترە و دارایی و تاقممان لەو زۆرترە، بەڕاستی بێ باوەڕان لەناو گوماندان لەهاتنە خوارەوەی قورئانی ئێمە بۆسەر موحەمەدو، بەڕاستی هەر لەو گومانەدان هەتا کاتێ سزا تووشی ئەوان ئەبێ وبێدار ئەبنەوە، ئەو کاتە ئەزانن موحەمەد ڕاستەو قورئان لەلایەن خواوە هاتوە بۆلای.

﴿ أمْ عِنْدَهُمْ خَزائِنُ رَبِّكَ الْعَزِيْزِ الْوَهابِ ﴾ ئایا لای ئەو بێ باوەڕانەیە گەنجینەی چاکەی پەروەردگاری زۆر بەدەسەڵات وزۆر بەخشندەی تۆ ، بەکاری بهێنن لەشتێ خۆیان بیانەوێ، بە ئارەزووی خۆیان پێغەمەرایەتی بدەن بەکەسێ ئارەزوویان هەبێ وبەگوێرەی دەستوری ئەوان کاربکا. ئەوانە هەموویان هەر بەدەستی خوان.

﴿ أمْ لَهُمْ مُلْكُ السَّماواتِ وَالأرْضِ وَما بَيْنَهُما ﴾ ئایا بۆ ئەوبی باوەڕانەیە خاوەنیەتی ئاسمانەکان وزەوی وشتێ لەنێوان ئاسمانەکان وزەویدان. ئەوبێ باوەڕانە خاوەنی هیچ شتێ نین و لەناو ئاسمانەکان و زەویدا نەکەمو نەزۆر ، ئەگەر بڕوایش ناکەن.

﴿ فَلْيَرْتَقُوا فِي الأسْبابِ ﴾ دوایی با ئەو بێ باوەڕانە لەناو ئەو هۆیانە هەیانە بەرز بننەوە بۆ لای هەر جێگەیە خۆیان ئەیانەوێ ئەگەر ئەتوانن، لەوێ دەسەڵات بگرنە دەست و ، پێغەمەرایەتی ببەخشن بەهەرکەسێ ئارەزوویانە ڕێزداری بکەن، ئەگەر ڕێگەیەك و هۆیکیان دەست ئەکەوێ. بێگومان ئەو ڕێگەیانەیان بۆ پێك نایە.

﴿ جُنْدٌ ماهُنالِكَ مَهْزُومٌ مِنَ الأحْزابِ ﴾ ئەو سوپایە دوژمنایەتی تۆ ئەکەن لەو جێگەیە ئەیانەوێ تۆ بکوژن کەڕۆژی بەدرە تاقمێکی کەمن لەو تاقمانە کۆبونەتەوەو ئەیانەوێ تۆ بەدرۆ بخەنەوە خۆیان ئەکوژرێن و ئەشکێن ورسوا ئەبن و، تۆ سەرئەکەوی بەسەریانا.

كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو الْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ لْـَٔيْكَةِ أُولَٰئِكَ الْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰؤُلَاءِ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ ﴿١٦﴾ اصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَالطَّيْرَ

مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَّعادٌ وَّ فِرْعَونُ ذُو الأَوْتادِ ﴾ خـوای مـەزن دڵخۆشـی پێغەمـەر ئەداتەوە، ئەفەرموێ: پێش بت پەرستانی مەکە تاقمی نوح و، هۆزی عـادو ، فیرعـەونی خـاوەن سوپایەکی بەهێزو بەتوانا، پێغەمەری خۆیانیان بەدرۆخستەوە، زانایـان بیریـان جیـاوازە لـەمانای ﴿ذُو الأَوْتادِ﴾ هەندێکیان ئەڵێن: فیرعەون چەند مێخێکی هەبوە یاری پێ ئەکردن. هەندێ ئەڵێن کاتێ بیویستایە سزای یەکێ بدا هەریەکە لەچوارپەلی ئەبەستەوە بەمێخەکەوە.

﴿ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحابُ الأَيْكَةِ ﴾ وەهۆزی سەمودو تاقمی لوتو دانیشتوانی ئەلئەبکـە پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ ئەخستەوە. (ئەلئەبکە) بەجێگەیە ئەڵێن: دارو درەختێکی چڕوپڕی هەبێ. شوێنی ئەوان دارستانێکی چڕوپڕ بوە.

﴿ أُولئِكَ الأَحْزابُ . إنْ كُلٌّ إلاّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ عِقابِ ﴾ ئەوانە هەموویان تاقمی شەیتان بوون، کۆبونەوە لەسـەر دژایـەتی پێغەمـەرەکانیان، هـەموو یـەکێ لەوتاقمانـە پێغەمـەرەکانیان بەدرۆخستەوە،دوایی پێویستم کرد لەسەریان سزای خۆم. تاقمی نـوح نوحیـان بەدرۆخسـتەوە. هۆزی عاد هودیان بەدرۆخستەوە، فیرعەون موسای بەدرۆخستەوە. دانیشتوانی دارستانی چڕوپڕ شوعەیبیان بەدرۆخستەوە، ئەوانە هەموویان تاقمێ بوون دژی پێغەمەرکانیان هەریەکەیان بەجۆرە سزایە سزایان درا.

﴿ وَما يَنْظُرُ هَؤُلاءِ إلاّ صَيْحَةً واحِدَةً مّالَها مِنْ فَواقٍ ﴾ وەئەو کەسانە موحەمەد وپێغەمەرکانی پێشوویان بەدرۆخستەوە چـاوەڕوان ناکـەن بـۆ لـەناوبردنی خۆیـان مەگـەر چاوەڕوانی تەنـها دەنگێکی زۆر سەخت بکەن گەڕانـەوەی بـۆ نیـە. بەوێنـەی شیری دۆشـراو لـەگوانی مـەڕێ ناگەڕێتەوە بۆلای گوانەکە. یانێ لەکاتی لەناوبردنیاندا مۆڵەتیان نادرێ بەکەمترین ماوە.

﴿ وَقالُوا رَبَّنا عَجِّلْ لَنا قِطَّنا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسابِ ﴾ وەبـێ بـاوەڕان بەگاڵتـە کردنـەوە ئـەیان ووت: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ پاداشتی ئێمە بـدەرەوە بـەگورجی لـە جیـهاندا بەرلـەهاتنی ڕۆژی دوایی بەو بەشەی سزایەی موحەمەد بـەڵێنی داوە ئـەدرێ پێمـان لەجیـهاندا بماندەرێ. داواکەیان پوچە لەچاکەی هەردوو جیهان بێ بەشن.

﴿ اصْبِرْ عَلى ما يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنا داوُدَ ذا الأَيْدَ إنَّهُ أَوابٌ ﴾ تۆ ئارام بگرە لەسـەر شتێ بی باوەڕان بەتۆی ئەڵێن بـەدرۆ و بـەبوختان هـەڵی ئەبەسـتن. بەڕاسـتی پاشـەڕۆژیان نـەمان و ڕسواییەو، تۆ بیری داوودی خاوەن دەستەڵاتی شـکۆداری داوود بکـەرەوە لەجیـهاندا هـەیبو، کاتێ هەڵەیەکی بچووکی کرد خوا لێی خۆشبوو. بەڕاستی داوود کەسی بوو پەشیمان بونەوەی زۆری بو داوای ڕەزامەندی لەخوا ئەکرد.

﴿ إِنَّا سَخَّرْ الْجَبَال مَعَهُ يسبّحْنَ بِالعَشِيِّ وَ الإِشْرَاق وَ الطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَهُ أَوابٌ ﴾ وەئێمـە کێوەکان و باڵندەکانمان بەهەمو ڕەگەزیانەوە لەهەموو لایەکەوە ڕامان کردوون پاك و دوربونـی خوا لەکاری ناشایستە دەربـڕن بـۆ خـوا لـەگـەڵ داودا لـەئێواران ولەخۆرهـەڵاتندا ولـەنێوان ئەواندا، هەموو یەکێ لە کێوو باڵندەکان پەیڕەوی خوا ئەکەن و سەرشۆڕی ویستی خوان.

بۆ زانین: دەربڕینی پاکی و دووری کێوەکان بۆ خوا بریتیە لـەوە کـەخوا پاراستونی لـەجم وجوڵ و، بەڵگەن لەسەر توانای گەوەریی خوا و، هەمو کاتێ وەك لـە پاك دەربڕینی خـوادان و، هەرکەسێ بیریان لێ بکاتەوە پاك و خاوێنی بۆ خوا دەرئەبڕێ، پاك وخاوێنی دەبڕینـی باڵندەکـان جۆراوجـۆرە: فڕینیـان دەربڕینێکـە، دەنگیـان دەربڕینێکـە. هـەموو ڕۆیشـتنێك و وەسـتانێکیان دەربڕینی پاکی خوان وبەڵگەن لەسەر توانای خوا.

﴿ وَشَدَدْنا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطابِ ﴾ وەئێمە پاشـایەتی داودمـان بـەهێزکردبو بەپلەیەکی زۆر گەورە و بەپاسەوان وسوپای زۆری گیانداران و، ئێمـە زانیـاری وپێغەمەرایـەتی وگفتوگۆیە چاك وخراپ جوێ بکاتەوەو گومان و دوودڵی وەرنەگرێ بەخشیمان بـە داوود و، هەموو شتێکی لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنا.

وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾

زانایان ئەڵێن: داوود پێغەمەر ڕۆژەکانی خۆی بەش کردبوو بەچوار بەش : ڕۆژێکی بۆ پەرستنی خوا. ڕۆژێکی بۆ فەرماندان لەنێوان دانیشتواناو نەهێشتنی گیروگرفتیان. ڕۆژێکی بۆ ئامۆژگاری کردن. ڕۆژێکی بۆ ڕابواردن و پشوودان لەناو خێزانەکانیا، لەڕۆژی پشوودانیا پاسەوان دانرابوو، ئەبوایە هیچ کەسێ تەهاتنایە بۆلای داوود، لەو ڕۆژەدا لەجێگەی ڕابواردنیدا دانیشتون، لەناکاودا هەندێ لەفریشتەکان بەفەرمانی خوا لەشێوەی ئادەمیزادا بەدیواری کۆشکەکەیا هەڵگەڕان وسەرکەوتن و چونە لای داوود، کەچاوی پێیان کەوت ترسا لێیان، ئەوانیش ووتیان: مەترسە ،ئێمە کەسانێکین ناکۆکیمان لەنێواندا پەیدابوە، هاتووین بۆلای تۆ بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکیە، فەرمان بدە لەنێوانماندا و، لەسنوری ڕاستی دەرمەچۆوستەم بەڕەاو مەبینە، ستەم لێ کراوو ووتی: ئە وبرایەی من ستەمم لێ ئەکاو، خاوەنی نەوەدوو نۆ مەڕە و، من یەك سەر مەڕم هەیە، ئەیەوێ ئەم سەرە مەڕەیش لەمن بسێنێ بەهۆی زمانی خۆی و، بەوە بەدەمەقاڵەمان، بەو زمانە لوسەی خۆی بۆڕی داووم وچاری ناکەم، داوود گوێی لێ گرتن و، کردەوەی خاوەن مەڕە زۆرەکەی لا ڕەوانەبوو، فەرموی : تۆ ستەمکاری بەهۆی ئەو شتەی کردوتە، زانایان ئەڵێن: ئەو شتەیش ئەوەبوو: داوود شتێکی نایابی لای کەسێك دیبو، لای خۆشبو بۆخۆی بێ، ئەو جۆرە ئاواتەیش لەپلەوپایەی پێغەمەرایەتیەوە دووربوو، بۆیە خوای مەزن لەوکارە ئاگاداری کرد لەو ئاواتەی خۆی پەشیمان ببێتەوە، ئیتر ئەو شتە دارایی بوبێ یا شتی تر گرنگ نیە و، هەواڵەی زانستی خوایە، هەرچەندە خاوەنی نامە دەست لێ دراوەکان هەندێ شتیان ووتوە شایستەی پلەی پێغەمەران نیەو زۆر بێ شەرمیە. بۆڕوون کردنەوەی ئەو ڕووداوە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَهَلْ آتاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرابَ ﴾ وەئایا نەهاتوە بۆلای تۆ هەواڵی زۆر سەرسوڕێنەری دوو کەس داواکارییان لەیەکتری هەبو، تۆ بیر بکەرەوە لەو کاتەی ئەو کەسانە بەرزبونەوە بەدیواری ئەوجێگەیە داوود ئەچوە ناوی بۆ پەرستنی خوا.

﴿ إِذْ دَخَلَ عَلى داود فَفَزِعَ مِنهُمْ ﴾ کاتێ لەناکاودا ئەو کەسانە بەبێ پرس چونە لای داوود، داوود کەچاوی کەوت بەو کەسانە ترسا لەوان، بەچ جۆرێ بەسەر ئەو هەموە پاسەوانەدا ئەوان هاتونەتە ژورەوەو دەرگا نەکراوەتەوە .

﴿ قَالُوا لَا تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَى بَعْضُنَـا عَلَـى بَعْضٍ ﴾ ئەو کەسانەی هاتبوونە ژوورەوە بە داوودیان ووت: تۆ مەترسە، ئێمەدوو کەسین داواکاریمان لە یەکتری هەیە، هەندێکمان دەست درێژیمان کردوەتە سەر هەندێ ترمان بەبێ ئەوەی ڕاستبێ. هاتووین بۆلای تۆ.

﴿ فَاحْكُم بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَاهْدِنَا إِلَى سَوَاءِ الصِّرَاطِ ﴾ دوایی فەرمانی یاسایی بدە لە نێوان ئێمەدا بە جۆرێکی ڕاستی و دادپەروەری و، تۆ لە دادپەروەری لامەدە و لە سنووری خوا دەرمەچۆ، شارەزای ئێمە بکە بۆلای ڕێگەی ڕاست و ئاشکرا و ئەم لاولای تێدا نەبێ. ئەمەیش کێشەی نێوانمانە.

﴿ إِنَّ هَذَا أَخِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِيَ نَعْجَةٌ وَاحِدَةٌ ﴾ بەڕاستی ئەم برا ئایینیەی من نەوەد و نۆ سەرمەڕی هەیە و، من تەنها یەك سەر مەڕم هەیە، شکاتی خۆمانمان هێناوە بۆلای تۆ.

﴿ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِي فِي الْخِطَابِ ﴾ دوایی ئەم برا ئایینیەی من دەڵێ بە من: تۆ ئەو تاکە مەڕە خۆت بکە بەشی من و بیکەرە ناو مەڕەکانی منەوە، زاڵ بووە بەسەر مندا بەگفتوگۆی پاراوی خۆی و، لە من زۆرزانترە و، بەدەم چاری ناکەم وە لە جیهانیشدا لە من بەدەستەڵاتترە، بۆیە هاتووینەتە لای تۆ چارەسەرمان بکەی. داوود گوێی لە گفتوگۆی هەردوولایان گرت و کارەکەی بۆ ڕوون بوویەوە.

﴿ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ ﴾ داود فەرمووی: بەڕاستی ئەو برایەی تۆ ستەمی لەتۆ کردوە، بەوەی داوای لەتۆ کردوە کە ئەو مەڕەی تۆ بکاتە لای مەڕەکانی خۆی و بیکا بە بەشی خۆی. داوود بەبێ وەڵامدانەوەی ئەوی تریان و داوای شایەت لەم بکائەو فەرمانەی دەرکرد و، ئەبوایە داوای لە هەردووکیان بکردایە بەپێی یاسای دادگا. فەرمووی:

﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ ﴾ وە بەڕاستی زۆر کەس لە دۆست و هاوکار هەندێکیان دەستدرێژی ناڕەوا ئەکەنە سەر هەندێتریان، زۆردارەکانیان مافی بێهێزەکان داگیر ئەکەن.

﴿ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ﴾ جگە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕدار و کردەوە چاکەکانیان کردبێ و، ئەو کەسانە زۆر کەمن لەناو ئادەمیزاددا. ئێتربا ژمارەیان کەمبێ. بەڵام ڕەوشتیان بەرزە.

دوای ئەوەی داوود فەرمانی خۆی دەرکرد لە نێوان ئەو دوو تاقمەدا داواکاریەکەیانی جێبەجێکرد. بەبێ داواکردنی شایەت و، وەڵامدانەوەی داوالێکرا و لەسەرەتاوە، ئەوەیش پێچەوانەی دادپەروەریە، هۆشی هاتەوە بەخۆیا و، بۆی دەرکەوت خوای مەزن بەو ڕووداوە تاقی کردوەتەوە، هەتا بۆ جاریتر کاری ناشایستەی وا نەکا نەگونجێ لەگەڵ پلەی پێغەمەرایەتیدا، چاو نەبڕێتە دارایی و شتی تری دانیشتووان.

﴿ وَظَنَّ دَاوُودُ أَنَّمَا فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴾ و داوود زانی و گومانی برد بەڕاستی تاقیان کردوەتەوە و، ویستویانە بەو ڕووداوە بەهۆشی بێرینەوە، جاریتر کاری ناڕەوا لەو پەیدا نەبێ.

دوای بەهۆش هاتنەوە، داوای لێبوردنی لەپەروەردگاری خۆی کرد و، کەوت بەڕوودا و سوژدە برد بۆ خوا و، گەڕایەوە بۆلای خوای گەورە و، لەکردەوەی خۆی پەشیمان بوویەوە.

﴿ فَغَفَرْنَا لَهُ ذَلِكَ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ ﴾ دوایی داوای لێبوردن ئێمە خۆشبویین لەو هەڵەیەتوشی داوود بووبوو، بەڕاستی بۆ داوود هەیە نزیکبوونەوە لە ئێمە و پلەیەکی تایبەتی لای ئێمە هەیە دوای لێخۆشبوونی و، بۆیشی هەیە گەڕانەوەیەکی شیرین لە ڕۆژی دواییدا بە چوونی بۆناو بەهەشت لای ئێمە.

بۆ زانین: هەرشتێکی تر جگە ئەوانەی باسکران لەبارەی داوودەوە: لــە بـاس و خواسـت و بوختانی جوەکان کە شایستەی پیاوچاکان نین چ جای پێغەمەران، پێویستە بەرپێچ بدرێنەوە، بـۆ دەرکەوتنی ڕێزی داوود تەماشای ئەو ئایەتەی دوایی بکەن بۆتـا ڕوون ئەبێتـەوە بـەرزی پلـەی داوود.

يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾

﴿ يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِـالْحَقِّ ﴾ ئـەی داوود: بەڕاسـتی ئێمە تۆمان کردوە بە جێگەدار لەناو زەوی‌دا، بەرپرسیاری لەبەردەم ئێمەدا بۆ جێبەجێ‌کردنی کار و کردەوەی ئادەمیزاد و، بۆ بڵاوکردنەوەی کاری چاك لە جیهاندا، دوایی تۆ فـەرمان بـدە لـەناو ئـادەمیزادا، گیروگرفتیـان جێبـەجێ بکـە بەڕاسـتی و بەدادپـەروەری، هـەموو کەسـێ جێگەنشینی خوایە. نەك بەوێنەی پێغەمەران.

﴿ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ وە تۆ دوای ئارەزۆی دەروونی خـۆت مەکـەوە، دوایی تۆ لابدا لە ڕێگەی ئایینی خوا، پلەی پێغەمەرایەتی خۆی لـەخۆیا داوای ئـەوەت لێ‌ئـەکا دوای ئارەزۆی خۆت نەکەوی.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَـدِيدٌ بِمَـا نَسُـوا يَـوْمَ الْحِسَـابِ ﴾ بەڕاسـتی کەسانێکی ئەوتۆ لابدەن لە ڕێگەی ڕاستی ئایینی خوا، بۆ ئەوان هەیە سزایەکی سەخت، بەهۆی لەبیرچوونەوەیان بۆ ڕۆژی پرسیارکردن لـەوان، ئەگەر لە جیهاندا لە ڕێگەی ئایین لاتان نەدایـە ئەم ڕۆژەتان لـەبیر نەئەچوو.

﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلًا ﴾ وە ئێمــە ئاسمـان و زەوی و شـتێ لـەنێوان ئەواندایە بەبێ‌سود و بەبێ هودە دروست نەکردوە. بەڵکو دروستمان کردوون بکرێن بەبەڵگە لـەسەر توانای ئێمە و،ناردومانەتە خوارەوە بۆ خوا پەرستن و دادپەروەری، دوای ئارەزۆی‌خۆتان نەکەون و فەرمانبەرداری خوابن.

﴿ ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ ﴾ دروستکردنیان بەبێ سوود، گومانی کەسانێکی ئەوتۆیە، باوەڕیان نەهێناوە، دوایی نەمان و سزایەکی سەخت بۆ کەسـانێکی ئەوتۆیـە باوەریان نەهێناوە بەسزای ئاگری دۆزەخ.

﴿ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴾ ئایا ئێمە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنـاوە و کـردەوەی چاکـەکانیان کـردوە ئـەیان گێڕین بەوێنەی کەسانێ خراپە بلاو ئەکەنەوە بەهاوبەشدانان بۆ خوا و بەبت پەرستی، ئایا ئێمــە کەسانێکی ئەوتۆ لـەخوا ئەترسن و خۆیـان لــە گونـاه ئـەپارێزن ئـەیانگێڕین بەوێنـەی کەسـانێ لـەخواناترسن و خۆیان لـەگوناه ناپارێزن؟ بێگومان ئەو کەسانە وێنەی یـەك نـین. بـاوەڕداران و خۆپارێزان لـەبەهەشتان. بێ‌باوەڕان و خراپەکەران لـەدۆزەخدان.

﴿ كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ ﴾ ئـەو قورئانـە نامەیەکـە ناردوومانەتە خوارەوە بۆلای تۆ خاوەنی سود و پیرۆزیە بۆ ئادەمیزاد، لـەبەر ئـەوەی بیربکەنـەوە لـەوانە و بەڵگەی ئایەتە پیرۆزەکانی و، لـەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی خاوەنی ئـەقڵن ئامۆژگـاری وەربگرن.



عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾

﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ وە ئێمـە بەخشـیومانە بـەداوود و سـولـەیمانی کوڕی، چاك بەندەی ئێمە بو سولـەیمان. بەڕاستی سولـەیمان بەزۆری ئەگەڕایەوە بۆلای فـەرمانی خوا و، بۆلای کردەوەی چاك.

ووشەی (داوود) بەزمانی عیبری بەمانای خۆشەویستیە و ووشەی (سلیمان) بە مانا ئاشتی و بێ وەی.

بۆ زانین: سولـەیمان بەخێوکردنی چـارەوێ لا مەبەسـتبو، لـەبـەر ئـەوە بـۆ جـەنگ پێکـردن پێویستی پێیان هەبوو، لـەبەر پەرەپێدانی ئایینی خوا. نەك بۆ مەبەستی جیهان، جاربـەجارێ: ئـەو چارەوێنانـەیان ڕائـەنوان لـەبـەر دەمیا، هـەتا بزانـێ چـۆن بـەخێوکراون و فـەرمانبدا چاکـتر بەخێوبکرێن، بۆ ئەو مەبەستە چارەوێکان بەسوارەکانیانەوە ئەهاتن و ئەڕۆیشتن هەتا لـە چاو وون ئەبوون و، جارێ تر ئەگەڕانەوە هەتا ئەچوونە ناو تەویلـەکانیان، لـەو بارەوە خوا ئەفەرموێ:

﴿ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِالْعَشِيِّ الصَّافِنَاتُ الْجِيَادُ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتـە بکـەرەوە: ئـەو چارەویانـە لـەسەر سێپەل ئەوەستن و چوارەمیان بەرز ئەکەنەوە، بەتیژی ئەڕۆن و نومایش ئـەکران بەسـەر سولـەیماندا، دوای نیوەڕۆ، ئەو جۆرە وەستانە ڕەسەنی و پەسەندی چارەوێکان دەرئەخا.

﴿ فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّى تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ ﴾ دوای ئـەوەی نومایشی چارەوێکان دەستی پێکرد سـولـەیمان ووتـی: بەڕاستی مـن ڕۆیشـتن و نومایشـی ئـەو چارەویانەم پێخۆشە، بەوێنـەی خۆشویسـتنی هـەموو چاکەیـە، ئـەو کـارەم کـردوە بەفـەرمانی پەروەردگاری خۆم، بۆ بەهێزکردنی ئایینی خوا بەجەنگ کردن بەو چارەوێیانە، نەك بەفـەرمانی خۆم و خۆشەویستی سامان، هەروەها نومایشی ئەو چارەوێیانە بەردەوامبێ هەتا هـەموویان وون ئەبن ولـەبەرچاونامێنن و نایان بینم.

﴿ رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ ﴾ لـە پاشا سولـەیمان ووتی بە پیاوەکـانی: ئێـوە ئەو چارەوێیانە بەسوارەکانیانەوە بگێڕنەوەبەسەر مندا جارێتر، دوایـی سـولـەیمان دەسـتی کـرد بەدەست پێداهێنانی قاچ و ملی چارەوێکان، لـەبەر خۆشەویستی و لاواندنەوەیان.

خەریکبوونی سولـەیمان بە مۆچاندن و، وەرزش بە چارەوێکان درێژەی کێشا و، کـاتی زۆری بەوانەوە ئەبردە سەر و، دارایی زۆری لـەوانەدا بەکارئـەهێنا بـەجۆرێ نزیکبـوو یـادو پەرسـتنی خوای لـەبیربچێتەوە، بۆیە خوا تاقی کردەوە و، توشی نەخۆشـی و لاوازی کـرد، نـەی ئـەتوانی کاروباری پاشایەتی ڕاپەڕێنێ ئـەو نەخۆشـیە پـەرەی سـەند بـەجۆرێ کاتـێ دانیشـتایە لـەسـەر

کورسیەکەی بەوێنەی لەشێکی بێگیان بو دوای ڕۆیشتنی ئەو نەخۆشیە بەسەریا، خـوای مـەزن لێی خۆشبوو، ڕزگاری کرد لەو نەخۆشیە، بەوێنەی جاران لەسەر کورسـیەکەی دانیشـتەوە، کاروباری پاشایەتی بەڕێوەئەبرد و، زۆرتر لە جاران فراوانی ئاوەدانی نیشـتمانەکەی زۆرتربـوو، لەو بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُـمَّ أَنَـابَ ﴾ وە بەڕاسـتی ئێمـە سـولەیمانمان تاقیکردەوە بە نەخۆشیەکی زۆر گران کە نەی ئەتوانی کاروباری فەرمانڕەوایی ببا بـەڕێوە و، ئێمە دامان لەسەر تەختی خۆی و، دانیشێ لەسـەری بەوێنـەی لەشـێکی مـردوو ئەتلایـەوە بـە ئازارەوە و، لەپاشـا گەڕایـەوە بـۆلای کاروبـاری پاشـایەتی و پەرسـتنی خـوا و، لـەو کـارەی کردبووی پەشیمان بوویەوە.

﴿ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّـابُ ﴾ سـولەیمان ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تۆ لەو هەڵەیەی من خۆش بە و، تۆ سامان و پاشـایەتیە ببەخشـە بەمن ئاسان نەبێ و ئامادە نەکرێ بـۆ هیـچ کەسـێ دوای مـن. بەڕاسـتی هـەرتۆ هـەموو شـتێ ئەبەخشی بە ئادەمیزاد و جگە ئادەمیزاد.

﴿ فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَـاء حَيْثُ أَصَـابَ ﴾ دوایـی ئێمـە بامـان ڕام کـرد بـۆ سولەیمان، ئەو بایە بڕوا بە فەرمانی سولەیمان و، بەنەرمی و ئاسانی سولەیمان ببا بۆ هەرجێگەیـە نیازی بکا و بیەوێ بڕوا بۆ ئەو جێگەیە، بەبێ ئازارێ توشی ببێ.

﴿ وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاء وَغَوَّاصٍ وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَـادِ ﴾ وە ئێمـە ڕامـان کردبـو بـۆ سولەیمان لە شەیتانەکان و هەموو ئەندازیار و شـارەزا و پسپۆڕ لـە دروسـتکردنی کۆشـك و تەلاردا، هەموو یەکێ لەوانەیان شارەزابن بۆ خۆ قوتا کردن بەناو دەریاکاندا بۆ دەرهێنانی شتی بەنرخ و، تاقمێ تری سێهەممان بۆ ڕام کردبوو لە شەیتانە یاخیـەکان و بێفـەرمانی سـولەیمانیان کردبوو، بەسترابوونەوە بە زنجیر و پێونی ئاسنەوە.

﴿ هَذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ ئەو سامان و پاشایەتیە و ئـەو هـەموو شـتانە بەخششی ئێمەیە، بەتۆمان بەخشیوە، دوایی تۆ ببەخشە لەو شتانە پێمداوی هەرشـتێ ئـارەزوت هەیە بیبەخشی بەهەرکەسێ ئەیبەخشی و، یابێ بیبەش بکـە لـەو شـتانە هەرکەسـێ ئـارەزوت هەیە، ئەو بەخششەی ئێمە بەتۆ نایەتە ژمارە، بەزۆر و بەکەم بیبەخشـە بـەبێ کێشـانەوە پێوانـە دوایی نایە.

﴿ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ ﴾ وە بەڕاستی بۆ سولیەمان هەیـە پلەیـەکی بـەرز لـە جیهاندا و، گەڕانەوەی شیرین و پاك لەلای ئێمە لە ڕۆژی دواییدا بەچوونی بۆ بەهەشت.



وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾

ئەیوب پێغەمەر پیاوێکی سامانداز و باوەڕدار بـووە، چاکەکـەر و ئـارام گربـوە، لەنـەوەی (عیسو)ی کوڕی ئیسـحاقی کـوڕی ئیبراهیمـە، دانیشتووی گونـدێ بـوە لـەنێوان دیمەشق و ئەزروعاتا. ژنێکی بوە ناوی (ڕەحمە)بوە لـەنەوەی یوسفی کوڕی یـەعقوب بـوە، وێنـەی ئـەیوب باوەڕدار و چاکەکەربوە. خوای مەزن سامانی زۆر و پلەوپایـەی بـەرز و کـوڕ و کچـی زۆری پێبەخشیبوو، بەڵام ئەیوب لـەگەڵ ئەو هەموو سامانەدا ئەوەندەی ئەخوارد و ئەپۆشـی کـە پێـی بژی، پارچە قوماشێکی نەئەپۆشی و پاروە نانێکی نەئەخوارد بیزانیبایە کەسی هەیە پێویستی بــەو شتانە هەیە ئەیدایە.

ئەیوب زمانی لـە سوپاسی خوا نەئەوەستا و لـە یادی خوا بێدەنگ نەئەبوو، سەری لـە خزم و دراوسێکانی ئەدا و چاکە زۆری لـەگەڵ ئەکردن، چاودێری چاکی جوتیـاری کشـت و کـاڵ و شوانی ئاژەڵەکە خۆی ئەکردن و یارمەتی ئەدان لـەهەموو کارێکیانا، زۆربوایە یا کەم.

بـەڵام ئـەییوب تاقمەکـەی لـەتاریکی گومڕاییـدا خنکـابوون و پـەروەردگاری خۆیانیـان نەئەپەرست و سوژدە و کڕنوشیان بۆ نەئەبرد، لـەگەڵ ئەوەیشدا لایـان خۆشەویستبوو چونکـە دەسـتگیرۆیی زۆری ئـەکردن، جگـە لەسێ کەس باوەڕیـان بـەخوا نـەبوو، ئـەیوب لــەناو کۆڕوکۆمەڵیاندا دائەنیشت و باسی خوای بۆ ئەکردن. بیری لـەوە ئـەکردەوە ڕێگـە بدۆزێتـەوە ڕزگاریان بکا لـە تاریکی بێباوەڕی بۆلای ڕووناکی باوەڕبەخوا.

شـەیتان کاتـێ ئـەو ڕێـزەی ئـەیوبی بینـی لـەناو ئـادەمیزادا و لــە ڕووی زەوی‌دا زۆری پێناخۆشبوو لـەگــەڵ ئەوەشـدا لای خـوا پلەوپایـەی بـەڕێزە، سـوێندی خـوارد بەهـەرجۆری بۆیبکری توشی خراپەی بکا. بەڵام باوەڕ و ترسی ئەیوب لـەخوا ڕێگەی لـە شەیتان بەستبو نەی ئەتوانی دوودڵی بخاتە ناو دڵی ئەیوب و لای‌بدا لـەپەرستنی خوا.

ڕۆژی لە ڕۆژان شتێکی واڕویدا ڕێزی ئەیوب لەناو هەندی لە تاقمەکەی کـەم بکاتـەوە و هەلی چاکی بۆ پێك هات گومان بخاتە دەروونیان بۆ دابەزینی پلەی ئەیوب، ئەو شتەیش ئەوەبوو هەندێ لە تاقمەکەی پێویستیەکیان بە پاشا هەبو، لەگەڵ ئەیوبا چون بۆلای هەتا یارمەتیمان بدا لای پاشا. بەلام ئەیوب بەبێ دەنگی وەستا و بیروڕای خۆی دەرنەبڕی و، پاشایش کارەکەی بـۆ نەکردن، هەرچەندە کارەکەیشیان خراپ نـەبوو، تاقمەکـەی لـە دلّـدا لـە بـێدەنگی ئـەیوب توڕەبوون، شەیتان خستبویە دەرونی تاقمەکەی ئەیبوبەوە کـە ئـەیوب پیـاوێکی دووڕوە، دڵ و زمانی وەك یەك نین و، هەر سودی تایبەتی خۆی ئەوێ، بۆیە لای پاشا بێدەنگ بوو هەتا کـاری خۆی بە ئاسانی بڕوا لە لای پاشا.

لە لایە ترەوە کارەساتی نالەبار ڕوی کرد بۆلای ئەیوب، دارایی و ئـاژاڵ و کشـت وکـاڵی لەناوچو، خانوەکەی ڕووخا بەسەر مندالّەکانیدا و هەموویان مردن. خۆیشی نەخۆش کەوت و درێژەی کێشا ئەو نەخۆشیە زۆر گرانەی ئەو، بەلام هەر سوپاســی ئـەکرد وئـارامی ئـەگرت و ئۆفێکی نەکرد لەبەردەم فەرمانی خوادا،نەخۆشیەکەی درێژەیکێشا و، هیچ دەرمانـێ سـودی پێنەبەخشی، ئەیوب بە ئازاری خۆیەوە ئەتلایەوە، دۆست و خزم لەویان نەئەپرسی و لـەبیریان چووبووەوە جگە لە ڕەحمەی ژنی، ئەویش هیچ دارایی بەدەستەوە نەمابەکاریبهێنێ بۆ بەخێوکردنی خۆی و ئەیوب ناچار بوو پەلکەیە لەپەلکە جوانەکانی خۆی بفرۆشێ بە مۆزەخانـە و نرخەکـە بەکار بهێنێ.

شەیتان هەلی بۆ ڕەخسا و، خستیە دەروونی ڕەحمەی ژنی ئەیوب کە بـە ئـەیوب بلّـێ: ئـەو شتانەی تووشی ئەوبوون خوا بەوی نەکردوە، شەیتان ئــەوی توشـی ئـەو کارەسـاتانە کـردوە. کەواتە شتێکی وابکات شەیتان ڕازی بکا، دوایی ئەیوب بەدەنگێکی لاوازەوە ووتی : ســوێندم بەخوا، ئەگەر لەم نەخۆشیە ڕزگارم بوو، ئەبێ سەد دارت لێبدەم، ڕەحمەی ژنی ئـەیوب وازی لە ئەیوب هێنا و، چوو بۆلای ئەو سێ کەسـانە ڕۆژێ لـە ڕۆژان دۆسـتی ڕاستەقینەی ئـەیوب بون، هەتا گوێ بگرن لە گفتوگۆی ئەیوب و، بە ئەیبویان ووت: ئەو شتەی بەسەرتۆدا هـاتووە بەسەر کەسی تردا نەهاتووە، چ شتێکت کردوە هەتا توشی ئــەم کـارە بوویـت؟ هاوڕێکانیشـی وازیان لە ئەیوب هێنا، ئەو کارەی ئەوان و ژنەکەی کردیان ئازاری زۆری گەیاند بە ئـەیوب و زۆری لا گرانبو، بۆیە زۆر بە نیازی پاکەوە لە خوا پاڕایەوە، ووتی: ئــەی پـەروەردگاری مـن: بەڕاستی من بەهۆی شەیتانەوە تووشی ئازار بووم، تۆیش لە هەموو کەسێ میهرەبان تـری، لـەم نەخۆشیە ڕزگارم بکە هەتا بتوانم یادی تۆ بکەم و بتوانم پەرستن بۆ تۆ بکەم.

خوای مەزن میهرەبانی خۆی بەکارهێنا بۆ ئەیوب، سروشی ناردە خوارەوە بۆلای فەرمووی: قاچی خۆت بدە لە زەوی ئاوێ دێتـە دەرەوە و خۆتـی پێبشـۆرە، زامـەکانت سارێژ دەبـن و، بیخۆرەوە ناوەوەشت ڕزگاری ئەبێت. ئەیوب بەو جۆرەی خوا فەرمووی کردی ڕزگاری بوو لە نەخۆشی و لـە جاران چاکتر و هەموو لەشی سارێژبووە.

ڕەحمە ژنی کە هاتەوە بۆلای سەیری کرد پیاوێکی لەش ساغ لە جێگە ئەیوبدایە و نەیناسی هەتا بانگی لێکرد، ئەو کاتە داوای لێبوردنی لە ئەیوب کرد، ئەیوب ووتی خۆ تۆ ئەزانی منن سوێندم خواردووە، ئەگەر لەم نەخۆشی‌یە ڕزگارم بێ سەد درات لێبدەم. خوای مەزن سروشی نارد بۆلای ئەیوب و فەرمووی: لەبەر ئەوەی سوێندەکەت نەکەوێ، سەد داری بچووك ببەستە بەیەکەوە و، بەیەك جار بیدە لەو ژنەی خۆت، دووایی خوای مەزن بە دوو چەنانە منداڵ و دارایی و زەوی و زاری پێبەخشیەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕووداوانە خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴾ و تۆ پیری ئەیوبی بەندەی ئێمە بکەرەوە، کاتێ ئەیوب ئەپاڕایەوە لە پەروەردگاری خۆی و ئەیووت: بەڕاستی من شەیتان نووشی ئازاری سەخت و سزای‌گرانی کردووم، ئەیەوێ بەبۆنەی ئەوەی سامان و منداڵەکانمان نەماون و، خۆیشم نەخۆشم بیروباوڕم بلەخشێنێ، ناوەستێ و بەهەموو جۆرێ لەهەوڵدایە بۆ ئەو مەبەستەی خۆی.

دوای ئەوەی ئەیوب نەخۆشی‌یەکەی درێژەی کێشا و زۆری ئازاردا پەنای برد بۆلای خوا و پاڕایەوە لەو نەخۆشی‌یە ڕزگاری‌بکا، خوای مەزن پاڕانەوەکە وەرگرت و، فەرمووی بە ئەیوب:

﴿ ارْكُضْ بِرِجْلِكَ هَذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴾ تۆ پێی خۆت بدە لە زەوی، دوایی ئاوێکی سارد و شیرین لەو زەویە دێتەدەرێ، بەو ئاوە خۆت بشۆرە برینی دەرەوەی لەشت سارێژ دەبێ و، بیشیخۆرەوە برینی ناوەوەی لەشت نامێنێ، وەك جارانت لێدێتەوە.

﴿ وَوَهَبْنَا لَهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾ وە ئێمە دوای ئەوەی ڕزگارمان کرد لەنەخۆشی، ئێمە خێزانەکەیی و، وێنەیە تری خێزانەکەیمان پێبەخشی بەدوو چەنانە؛ لەبەر میهرەبانی لە لایەن ئێمەوە بۆ ئەیوب و، لەبەر ئامۆژگاری کردنی ئەوانەی خاوەنی ئەقڵی ئەوانن.

ئەیوب لەبەر ئەوەی ڕەحمە لە کاتی نەخۆشی‌یەکەی‌دا گفتوگۆیەکی ناڕەوای بە ئەیوب ووتبوو، سوێندی خواردبوو ئەگەر لەم نەخۆشی‌یە ڕزگارم بێ سەد دارت لێئەدەم، لەبەر ئەوەی سوێندەکەی نەشکێ، خوا فەرموێ:

﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ ﴾ و تۆ کۆمەڵێ داری ووردو جگەی درەخت بگرە بەدەستەوە، دوایی تۆ ئەو کۆمەڵە درەختە وورردانە بدە لە ڕەحمەی ژنی خۆت و، سوێندەکەت ناکەوێ و گوناهبارنابی.

﴿ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِّعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەیوبمان دەست کەوتبوو بەجۆرێ ئارامی گرتبوو لەسەر ئەو هەموو ئازار و کارەساتانەی تووشی بووبوو، ئەیوب چاك بەندەیەکی ئێمەیە. بەڕاستی ئەیوب بەزۆری ئەگەڕایەوە بۆلای خواو، پەنای بۆلای خواو، پەنای بۆلای ئەو ئەبرد بەتەنها.

﴿ وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ أُوْلِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَار ﴾ وە تـۆ بـیری ئیـبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبی بەندەکانی ئێمە بکەرەوە، هەموویان خـاوەنی کـردەوەی چـاکی ئاشـکرا و بیرکردنەوەی نهێنی بوون، خاوەنی پەرسـتن و زانینـی یاسـای ئـایین بـوون و سوپاسـی خوایـان ئەکرد.

﴿ إِنَّا أَخْلَصْنَاهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى الدَّار ﴾ بەڕاستی ئەوان لـەو پیاوە پاك و هـەڵبژێراوەی نـاو ئادەمیزاد بون بۆلای ئێمە. شایستەی ئەوەبون بکرێن بە پێغەمەر و، فەرمانی ئێمە ڕابگەیـەنن بـە ئادەمیزاد.

﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَار ﴾ وە بەڕاستی ئەوانمان بە جۆرێکی پاك و بـێ گـەرد دروست کردبوون بۆ ئەوەی هەموو کاتێ بیر لـە ڕۆژی دوایی بکەنەوەو کار بۆ ئەو ڕۆژە بکەن و، ئادەمزاد بانگ بکەن بۆلای ڕۆژی دوایی.

﴿ وَاذْكُرْ إِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَذَا الْكِفْلِ وَكُلٌّ مِّنْ الْأَخْيَار ﴾ وە تۆ بیری ئیسماعیل و ئەلیەسەع و زولکیفل بکەرەوە و، هەموو یەکێ لـەوان لە پیاوچاکان و هەڵبژاردەی ئادەمیزادبوون.

بۆ زانین: ئەلیەسـع کـوڕی ئوختوبـە، ئیلیـاس کـردی بـە جێگـەداری خـۆی بەسـەر بەنوئیسرائیلیەکاندا و، دوایی کرا بە پێغەمەر. زولکیفل ئامۆزای ئەلیەسعە، بۆیە نـاوبراوە بـەو ناوە یانێ خاوەنی بەخێوکردن؛ چونکە زۆربەی پێغەمەران کە ڕایان ئەکرد خۆیان ڕزگار بکـەن لـە کوشتن بەخێوی ئەکردن و، مانای زۆرتریشی بۆکراوە.

هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَآخَرُ مِن شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ الْقَرَارُ ﴿٦٠﴾

قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾ وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾

﴿ هَذَا ذِكْرٌ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ ﴾ ئەوەی باسکرابو لەبارەی چاکەی پێغەمەرانەوە ڕێزێکی زۆر گەورەیە بۆتۆ کە ئامۆژگاری نەتەوەکانی لەمەوپاشیان پێ بکەو، بەڕاستی بۆ ئەو کەسانە هەیە لەخوائەترسن و، خۆیان لەبێ فەرمانی خوا ئەیارێزن شیرین گەڕانەوە و جێگەی چاك.

﴿ جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ ﴾ ئەو جێگە شیرین و چاکە بریتیە لە چەندین بەهەشتی بەرین و جێگەی دانیشتنی بەردەوام، دەرگای ئەو بەهەشتەیان بۆ کراوەتەوە، پاسەوان و دەرگاوانیان نیە، بە ئارەزوی خۆیان ئەچنە ناویان.

﴿ مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴾ دائەنیشن لەناو ئەو بەهەشتانەدا زۆر بەخۆشی ڕائەبوێرن، لەناو ئەو بەهەشتانەدا داوای میوەی جوان ئەکەن، ڕاخەری نایابیان هەیە.

﴿ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴾ وە لەلای ئەواندا چەندین ژنیان هەیە چاویان بۆ جگەی مێردی خۆیان ناڕوانێ و، هەموویان لەیەك تەمەندان.

﴿ هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ إِنَّ هَذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ ﴾ بە باوەڕداران ئەبێژرێ لە لایەن فریشتەکانەوە: ئەوانە ئەو شتانەن بەڵێنی پێدرابوو لە جیهاندا بدرێ بە ئێوە لە ڕۆژی پرسیار و پاداشت وەرگرتندا. بەڕاستی ئەوانە خواردەمەنی و ڕابواردنی ئێمەیە و، دواهاتن و نەمان بۆ ئەو خواردەمەنی‌یە نیە.

﴿ هَذَا وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴾ ئەوە باسکرا بەشی باوەڕدارانە و، بەڕاستی بۆ ئەو کەسانە هەیە لە سنووری خوا لایانداوە، پێغەمەرەکانیان بەدرۆخستوەتەوە خراپترین جێگەیە بۆی ئەگەڕێنەوە کە بریتی‌یە لە دۆزەخ ئەو تاوانبارانە ئەچنە ناوی، دوایی ئەو جێگەیە خراپ ڕاخەرێکە بۆ ئەوان.

﴿ هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ وَآخَرُ مِن شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ ﴾ ئەوەی لە دۆزەخدایە ئاوێکی زۆر گەرم و کیم و زوخی دانیشتوانی دۆزەخە، دزایی ئێوە با ئەو سزایە بچێژن و لەوانە بخۆن، ئەو سزایەی ئەوان هەر ئەوانە نیە و، بەڵکو سزای تر لە وێنەی ئەو سزایانە بەجۆراوجۆر هەیە ئەچنە ناویان یەك لەدوای یەك.

﴿ هَذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّار ﴾ تاقمێ لە تاوانبـاران لـە پێشـەوە ئەچنە ناو ئەو دۆزەخە، دوایی کاتێ تاقمێـێ تـر دوای ئـەوان چونـە نـاو دۆزەخـەوە، لەلایـەن فریشتەکانەوە بە تاقمە پێشووەکان ئەبێژرێ: ئەمانە تاقمێکن دێنە ناو دۆزەخ لەگەڵ ئێوە، تاقمە پێشووەکان بە تاقمە دواینەکان ئەڵێن: خۆشی و ئاسایش بۆ ئێوە نەبێ. بەڕاستی ئەوان ئەچنە ناو دۆزەخ و سزایان ئەدرێ.

﴿ قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ الْقَرَارُ ﴾ تاقمە ژێردەستەکان کە دوایـی ئەچنە ناو دۆزەخ بەتاقمە سەرۆکەکانیان ئەڵێن کە لە پێشـەوە چونەتـە نـاو دۆزەخ: خۆشـی و ئاسایش بۆ ئێوە نەبێ چونکەئێوە ئەو سزایە پێشکەشی ئێمە کردووە، داوای بێباوەڕیتان لە ئێمە کرد، دوایی خراپ جێگەیە کە ئێمە هەمو لایەکمان ئەچینە ناوی و، ئارامی تێدا ئەگرین.

﴿ قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّار ﴾ بێباوەڕە ژێردەستەکان ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: دوایی تۆ زۆرتر بکە بۆ ئەو کەسەی بێباوەڕی پێش کەش بە ئێمە کـردووە سزای دووچەنانەیان لەناو ئاگری دۆزەخدا، چونکە ئەوان بون بەهۆی گومڕایی ئێمە.

﴿ وَقَالُوا مَا لَنَا لَـا نَـرَى رِجَالًـا كُنَّـا نَعُدُّهُـم مِّنَ الْأَشْـرَار ﴾ وە هـەردوولای بێبـاوەڕان لـە دۆزەخدایە بەیەکتری ئەڵێن: چ شتێك پەیدابووە بۆ ئێمە چەند پیاوێ نابینین ئێمە لە جیهاندا بـە پیاوخراپ و بێنرخ ئەمان ژماردن؟. جێگـەی سەرسـوڕمانە لـێرە نـابینرێن، وا دیـارە لـێرەنین، مەبەستیان لەو پیاو خراپانە: سوهەیب و بیلال و عەمار و خەباب و سەلمانبوون.

﴿ أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ ﴾ ئێمە لە جیهاندا گاڵتەمان بەو پیاوانە ئـەکرد، بەڕاستی لەسەر ڕاستی بوون و ئێمە لەسەر گومڕاییدا بووین. یا لەگەڵ ئێمەدان لە دۆزەخـدا. بەڵام چاوی ئێمە لەوانی لاواداوە و، ئێمە نایان بینین و، نازانین لـە چ جێگەیەکن. بێگومان ئـەو پیاوانە لە بەهەشتان و، بێباوەڕان لەدۆزەخدان بۆیە نایانبینن.

﴿ إِنَّ ذَلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّار ﴾ بەڕاستی ئەو شتانەی باسکران لەبارەی هەردوو تـاقمی بێباوەڕان و ڕاست و بێگومانە، ئەوانەیش گفتوگۆ و دوژمنایەتی دانیشتووانی دۆزەخە لەگـەڵ یەکتری.

بۆ زانین: لای تاوانباران هەرکەسێ بـە مـاندووبوونی خـۆی بـژی و لـە دژی ستەمکاراندا ڕاپەڕی و داوای یەکسانی و ماف پـەروەری بکـا پیـاوخراپ و دڕندەیـە. بـەڵام ستەمکاران و نیشتمان فرۆشان و ئەو کەسانەی دانیشتووان بچەوسێننە بەڕێز و پیاوچاکن.

قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَأٌ

عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ
إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ
لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ
مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ
أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ
يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ
مِنَ الْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ
﴿٧٦﴾ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَىٰ يَوْمِ
الدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ
الْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ
لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾
قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ
مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ
﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ ﴾ بەڕاستی من ئێوە ئەترسێنم بەشتێ توشی ئێوە ئەبێ لە ڕۆژی دواییــدا، ئەگەر ئێوە بەردەوامبن لەسەر بێباوەڕی خۆتان و، لەسەر بت پەرستی.

﴿ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَــا بَيْنَــهُمَا الْعَزِيــزُ الْغَفَّــارُ ﴾ و بەڕاستی من بە ئێوەی ڕائەگەینم هیچ ئایینێ نی‌یە جگەی ئایینی ئیسلام و بەڕاستی هیچ خوایە نیە شایستەی پەرستنبێ جگەی خوایەکی تەنـهای زۆر بەدەسـتەلات، پەروەردەکـەر و بەڕێوەبـەری

ئاسمانەکان و و زەوی و شتێ لەنێوان ئەواندان، خوایەکە زۆر گەورە و، لێبوردنی زۆرە بۆ ئـەو کەسانەی بەنیازی پاکەوە پەشیمان ئەبنەوە.

﴿ قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴾ تـۆ بلـێ بـە بێبـاوەڕان: ئـەو شتەی مـن ئێـوەی پێ‌ئەترسێنم و ئەڵێم:

هیچ خوایە نیە شایستەی پەرستنێ جگـەی خـوای تـاك و تەنـها هـەواڵێکی زۆر گەورەیـە شایستەی وەرگرتنە ئێوە وازی لێ‌ئەهێننو بێ‌ئاگان لەو هەواڵە گەورەیە.

﴿ مَا كَانَ لِي مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَى إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾ مـن هیـچ جـۆرە زانیـاریێکم نـەبووە بەگفتوگۆی تاقمە پایەبەرزەکان لـە فریشتەکان کاتێ گفتوگۆیان ئەکرد لـەگەڵ یەکتری لـەبارەی دروست کردنی ئادەمەوە و، هیچ شتێکم لەوبارەیەوە نەئەزانی.

﴿ إِن يُوحَى إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِـينٌ ﴾ بەڕاستی ئـەو گفتوگۆیـەی ئـەوانم زانـی بـەهۆی سروشەوە بو خوا ناردی بۆلای من. بەلام من هەر پێغەمەرێکم ئێوە ئەترسێنم لـە سـزای خـوای مەزن و بۆتانی ڕوون ئەکەمەوە پاداشتی ئەو شتانەی ئێوە بیکەن و ئەوانـەی ئێـوە نـەیان کـەن، هەرشتێ خوا پێم نەفەرموێ نایزانم.

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِن طِينٍ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُـوا لَـهُ سَاجِدِينَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە پەروەردگاری تۆ بە فریشـتەکانی فـەرمو: بەڕاسـتی مـن مرۆڤێ دروست ئەکەم لەخاك و ناوی ئەنێم ئادەم، دوایی کاتـێ مـن پەیکـەر و نەخشـەی ئـەو مرۆڤەم ڕێکخست بەتەواوی، ژیانم کرد بەلەشیا، لەو گیانەی من دروسـتم کـردووە و بـو بـە زیندەوەرێکی تەواو، ئێوە بکەون بەڕودا لەسەر زەوی و، ڕێزی بگرن سوژدەی بۆ ببەن.

﴿ فَسَجَدَ الْمَلَائِكَـةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ . إِلَّا إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ و دوای دروستکردنی ئادەم فریشتەکان هەموویان سوژدەیان برد بۆ ئادەم، جگە لـە ئیبلیـس سـوژدە بـۆ نەبرد و، خۆی بەگەورەتر دانا کە ئەو شنەی فریشتەکان ڕێزی ئادەمیان پێگرت ئەمیش بیکـا و، بەو بۆنەوە خۆی بردە ڕیزی بێباوەڕانەوە.

﴿ قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْعَالِينَ ﴾ خـوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس: چ شتێ ڕێگەی گرت و نەی هێشت کەتۆ سـوژدە ببـەی بـۆ شـتێکی ئەوتۆ من بەهۆی توانای خۆمەوە دروستم کردووە، ئایا تۆ خۆتت بەگەورە داناوە، بەبێ ئـەوەی شایستەی گەورەیی بێ، ئایا تۆ خۆتت بەبـەرزتر لـەو کەسـانە دانـاوە شایسـتەی بـەرزی بـن، بەوێنەی فریشتەکان؟ ئەو فەرمودەی خوایـە: ئـەوە ناگەیـەنێ خـوا دوو دەسـتی هـەبێ، بـەلام زۆربەی کارەکانی ئادەمیزاد بـەدوو دەسـت ئـەکرێ، بـۆ بیرخسـتنەوەی ئـەوان بـەو جـۆرەی فەرمووە.

﴿ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ ﴾ ئیبلیس ووتی: بۆیە سوژدەی بـۆ نابـەم چونکە من لـەو شتە چاکترم، منـت دروسـتکردوە لـە ئـاگر و، ئـەو شـتەت دروسـت کـردوە لـەخاك، ئاشکرایە ئاگر چاکترە لـە خاك، ئەوەی لـەبیرنەمابوو بنچینەی ژیان هەر بەهۆی ئاوەیە.

﴿ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَى يَوْمِ الدِّينِ ﴾ خـوا فـەرموی بەشـەیتان: دوایی تۆ لە بەهەشت و، لەناو ئاسمانەکان و فریشـتەکان بـڕۆرە دەرەوە، دوایـی تـۆ بەڕاسـتی دەرکراوەی لەبەزەیی من و لە میهرەبانی من و، بەڕاستی بێبەشبوون لـە بـەزەیی مـن لەسـەر تۆبێ، هەتا ڕۆژی پاداشت و پرسیار.

﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ﴾ شەیتان ووتی: ئەی پەروەردگاری من: دوایی تۆ دوانجە و مۆڵەتی من بدە و مەمرێنە هەتا ڕۆژێ هەموو گیانداران زیندوو ئەکرێنەوە، خوا فەرمووی: بەڕاستی تۆ یـەکێ ئـەبی لـەو کەسانە مۆڵـەتیان ئەدرێ، هەتا ڕۆژی کاتی دیاریکراو کە ڕۆژی نەفخەی یەکەمە و، هەموو گیاندارانـێ ئـەمرێ، بەشەیتانیشەوە.

﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّـهُمْ أَجْمَعِينَ إِلَّـا عِبَـادَكَ مِنْـهُمُ الْمُخْلَصِـينَ ﴾ ئیبلیـس ووتـی: دوایـی بەگەورەیی تۆ سوێند ئەخۆم: بەڕاستی من هەموو ئادەمیزاد سەرجەم لائەدەم لە ڕێگەی پەرستنی تۆ، جگە لەو بەندانەی تۆ نیاز پاك و هەڵبژێرا و باوەڕدارن. ئەوانە من نـاتوانم لایـان بـدەم لـە ڕێگەی ڕاست.

﴿ قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْـهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ خـوا فـەرموی: هەموو ڕاستیە لە منەوە پەیدا ئەبێ و، من هەر بەڕاسـتی ئـەڵێم: بەڕاستی مـن دۆزەخ لـەتۆ و کەسێ دوای تۆ بکەوێ لە ئادەمیزاد پڕ ئەکەم لەوان بەگشتی.

﴿ قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴾ تۆ بڵـێ: مـن لەسەر ڕاگەیاندنی ناوەڕۆکی قورئان بە ئادەمیزاد داوای پاداشت و کرێ لـەوان ناکـەم و، مـن لەو کەسانەیش نیم لەخۆمەوە ئەو قورئانەوە دابنێم و خۆم هەڵیبەستم، ئەو قورئانە هیچ شتێ نیە مەگەر ئامۆژگاری کردنە بۆ هەموو بوونەوەران.

﴿ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێوە کە قورئان بەدرۆئەخەنەوە لە دوای ماوەیەتری کەم، ئێوە ئەزانن هەواڵەکانی قورئان ڕاستە و گومانی تێدا نیە، هـەر لـە جیـهاندا بۆتـان ڕوون ئەبێتەوە بەچاوی خۆتان ئەی بینن کۆمەڵ کۆمەڵ ئادەمیزاد دێنە ناو ئایینی ئیسلام و، لـە ڕۆژی دواییشدا باشتر ڕاستییان بۆ دەرئەکەوێ.

**بە یاریدە خوا ڕۆژی یەک شەممە ٢٠-٧-٢٠٠٠ کۆتایی پێهات**

**بەرانبەر بە یەکەم ڕۆژی ڕەبیعی دووهەمی ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی**

# ﴿ سورەتی زومەر ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. جگە لە ئایەتەکانی (٥٢-٥٣-٥٤) ژمارەی ئایەتەکانی (٧٥) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٤﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ ناردنە خوارەوەی ئەم نامەیە لەلایەن خوایێکی زۆر گەورەیە، هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، لە لایەن کەسی ترەوە نەهاتوەتە خوارەوە.

﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴾ بە ڕاستی ئێمە ئەو نامەیەمان بەڕاستی ناردوەتە خوارەوە، گومان ڕوی تێ ناکا، دوایی تۆ خوا بپەرستە، ئاینی پاك بکەرەوە لە هەموو ناشایستەیە لەبت پەرستی و دووڕوویی.

﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ﴾ ئێوە ئاگاداربن هەر تەنها بۆ خوایە ئایینی پاك لە هەموو خراپە و کاری ناشایستە و، کەسانێکی ئەوتۆ جگەی خوایان وەرگرتوە بەیاریدەر و بەخوا.

﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ ئەڵێن ئێمە ئەو بتانە ناپەرستین مەگەر هەر لەبەر ئەوە ئێمە نزیکمان بکەنەوە بۆلای خوا بەنزیکبوونەوەی تەواو. بەڕاستی خوا فەرمان ئەدا لە نێوان باوەڕداران و بێباوەڕاندا لەو شتەی ئەوان جیاوازی بیروڕایان هەیە لەودا، دوایی باوەڕداران ئەخاتە ناو بەهەشت و، بێ باوەڕان ئەخاتە ناو دۆزەخ.

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴾ بەڕاستی خوا ڕێگەی ڕاست شارەزای کەسێ ناکا درۆزنبێ و بڵێ: ئەو بتانە بۆم ئەپارێنەوە، باوەڕدار نیە؛ چونکە جگەی خوای پەرستوە، دوای ئەوەی ئێمە ئەقڵمان داوەتێ و، ئەو جگەی خوای هەڵبژاردوە بۆ خوایەتی خۆی.

﴿ لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَدًا لَاصْطَفَى مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾ ئەگەر خوا بیویستایە کە منالێ بۆخۆی وەربگرێ، بەڕاستی هەڵی ئەبژارد لەو شتەی خۆی دروستی ئەکا شتێ ئارەزۆی هەبوایە و، ئەی‌کرد بە منالْ بۆخۆی، پاکی و دووری بۆ خوایە کە منالی هەبێ، خوا ئەو خوایەیە تاك و تەنهایە، زۆر بەتوانایە، پێویستی بەمنالْ و هاوبەش نی‌یە.

خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٥﴾ خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٧﴾

﴿ وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ ﴿٨﴾ ﴾

﴿ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ﴾ خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردون بەخاوەنی سود؛ بۆ ئەوەی ئێوە بیانکەن بە بەڵگە لەسەر توانای خوا و، بۆ ئەوە ئێوە ئاوەدانیان بکەنەوە بۆ سوودی خۆتان.

﴿ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ﴾ خوا کاتی هەریەکە لەشەو و ڕۆژ ئەکا بەناو کاتی ئەوی تریانا، هەریەکەیان درێژ بو ئەوی تریان کورت ئەبێتەوە. شەو ئەپێچێتەوە بەسەر ڕۆژدا و تاریکی دەرئەکەوێ.

خاوەنی (في ظلال القرآن) ئەفەرموێ: ئەم ڕستانە ئاماژەن بۆ خڕی زەوی. (کە بەڕاستی زەوی ئەسوڕێتەوە بەدەوری خۆردا. ئەو بەشەی زەوی بەرانبەر بە خۆرە ڕوناکی‌یەکەی زەوی دائەپۆشێ و ئەبێ بەڕۆژ، ئەو بەشەکەی تری ئەبێ بەشەو) هەر بەو جۆرە شەو و ڕۆژ دێن بە دوای یەکدا، کاتێ شەو درێژ بو ڕۆژ کورت ئەبێتەوە، کاتێ ڕۆژ درێژ بو گەرمای خۆر زۆرتر ئەبێ، ئەبێتە هۆی گەشە پێکردنی بەروبوم، کاتێ شەو زۆر بو، ئەبێتە هۆی بارینی باران و زۆربوونی ئاوی دەریاکان و کانیەکان و ناوەوەی زەوی.

﴿ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴾ وە خوا خۆر و مانگی ڕام کردوە و، هەریەکەیان ئەڕۆن و ئەسوڕێتەوە بە بازنەی دیاریکراوی خۆیانا هەتا کاتێ بۆیان دیاری‌کراوە کە هاتنی ڕۆژی دواییە. بەو ڕۆیشتنەی ئەوان چوار وەرزە پەیدائەبێ: زستان. بەهارد. هاوین. پایز. بەگوێرەی سوڕانی زەوی بەدەوری خۆیا، هەروەها مانگ هەمو شەو و ڕۆژێ ئەسوڕێتەوە بەدەوری زەوی‌دا و (١٢) مانگ پەیدا ئەبێ، ئەوانە هەمویان بۆ سودی ئادەمیزادە و، بۆ بوژانەوەی درەخت و گیا و شتی تر. ئێوەی ئادەمیزاد ئاگاداربن خوا زۆر گەورە و بەدەستەڵاتە، لێخۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە و داوای لێبوردن لە خوا ئەکەن.

﴿ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ خوا ئێوەی ئادەمیزادی دروستکردوە لە تاکە کەسێ وەك ئادەم بەهۆی دڵۆپێ ئاوەوە لەلای پیاوەوە ئەچێتە منالْدانی ژن. لە پاشا خوا دروستی کردوە لەسەر شێوەی ئەو کەسە ژنکەی خۆی کە حەوایە.

﴿ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنْ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ ﴾ وه خوا دروستی کردووه بۆ سودی ئێوه: له چوارپێ بەسەزمانەکان هەشت جۆره هاوجوت: له هوشتر نێرو مێیه. له رەشەوولاخ دووان. لەمەڕ دووان. له بزن دووان. هەرچەنده هەموو گیانداریێ دوو جۆرن . بەلام ئادەمیزاد بەزۆری ئەو چوارپێیانه بەکاردێنن.

﴿ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ﴾ خوا ئێوەی زیندەوەرانی دروست کردوه لەناو منالدانی دایکەکانتانا دروستکردن له دوای دروستکردن. یەکەم تۆوی ژن و پیاو، دواتر بەخوێن، دوایی به گۆشت و ئێسك، دوایی به ئادەمیزادێکی تەواو، لەناو سێ تاریکیدا: تاریکی منالدان. تاریکی سکی دایك. تاریکی هاورێ منالّ.

﴿ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ ﴾ ئەو کەسەی ئەو هەموو شتانەی دروست کردوه خوایه که پەروەردگاری ئێوەیه، هەر بۆ خوایه ئەو بونەوەره زۆرانه و، ئەو خاوەنیانه، هیچ خوا نیه شایانی پەرستنێ مەگەر هەر ئەو، دوایی ئایا ئێوه بۆ لادران له پەرستنی خوا و، بیر له پەرستنی جگه خوا ئەکەنەوه؟

﴿ إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾ ئەگەر ئێوه بەردەوامبن له سەربێباوەڕی و سوپاس نەکردنی خوا، دوایی بەڕاستی خوا پێویستی به نوێژ و ڕۆژووی ئێوه نیه، سودی ئەوانه بۆ خۆتانه و، خوا ڕازی نیه بەبێ باوەڕی بۆ بەندەکانی و لای پەسەند نیه و، ئەگەر ئێوه سوپاسی خوا بکەن خوا ڕازییه بەو سوپاسکردنەی ئێوه و پاداشتان ئەداتەوه.

﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُمَّ إِلَى رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ ﴾ وه هیچ کەسێ هەلناگرێ باری گوناهی کەسێکی تر و؛ هیچ کەسێ سزای نادرێ بەهۆی گوناهی کەسێکی ترەوه، هەمو کەسێ پاداشت و تۆلەی کردەوەی خۆی وەرئەگرێ، له پاشا ئێوه گەڕانەوەتان بۆلای پەروەردگاری خۆتانه.

﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ دوایی پەروەردگاری ئێوه هەوالّ ئەدا به ئێوه بەشتێ ئەیکەن له جیهاندا. به ڕاستی پەروەردگاری ئێوه ئەزانێ بەشتێ له دلتانایه و پەنهانتان داوه.

﴿ وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ﴾ وه هەرکاتێ ئازار توشی ئادەمیزاد ببوایه لەهەر جۆرێ بوایه ئەپاڕایەوه له پەروەردگاری خۆی، هەر بۆلای ئەو ئەگەڕایەوه نەك بۆلای کەسایکی تر.

﴿ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ ﴾ له پاشا کاتێ پەروەردگار بەخشی بەو کەسه چاکه و خۆشیه له لایەن خۆیەوه له بیری ئەچووەوه ئازارێ توشی ئەو بوبو لەوەوبەر ئەپاڕایەوه خوا لایبا لەسەری.

﴿ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ ﴾ وە دای ئەنا بۆ خوا چەندین هاوێنەیە بۆ خوا لەپەرستندا، لەبەر ئەوەی کەسانی تر چاوی لێبکەن و لایانبدا لە ڕێگەی ئایینی خوا.

﴿ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ ﴾ تۆ بڵێ بەو بێباوەڕە: تۆ بەو بێباوەڕیەی خۆتەوە ڕابوێرە و بەرخوردار بەلە کەمێکات لە جیهاندا بەو تەمەنە کورتەوە. بەڕاستی تۆ دوای مردنت لە دانیشتوانی ناو ئاگری دۆزەخی و، بە توندی پرسیارت لێئەکرێ لەو ڕۆژەدا.

أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِى ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾

﴿ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ﴾ ئایا کەسێ بەردەوام بێ لەسەر پەرستنی خوا لە هەمو کاتەکانی شەودا بە سوژدەبردن بۆ خوا، یا بەڕاوەستانەوە بۆ نوێژکردن، لە ڕۆژی دوایی بترسێ و، بە ئومێدی بەزەیی و میهرەبانی پەروەردگاری خۆی بێ، وەك کەسێ وایە لە شەودا بخەوێ و لەخوا نەترسێ و بە ئومێدی پاداشتی پەروەردگاری خۆی نەبێ لە پاشەڕۆژدا؟

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ ﴾ تۆ بڵێ: ئایا کەسانێکی ئەوتۆ بزانن بە شتێ خوا ئامادەی کردوە لە پاداشت و لە سزا و، کەسانێکی ئەوتۆ بەو شتانە نەزانن و باوەڕیان پێیان نەبێ وەك یەك وان. بێگومان وێنەی یەك نین. بە ڕاستی ئەو کەسانەی خاوەنی ئەقڵن پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرن و بیر لە گەورەیی و میهرەبانی خوا ئەکەنەوە.

بۆ زانین: مەبەست لە زانا لەو ئایەتەدا ئەو زانایەن خۆیان ئەکەن بەقوربانی بۆ بەختیاری ئادەمیزاد لە هەردوو جیهاندا و، بۆ ڕزگارکردنیان لە چەرمەسەری و چەوساندنەوەی تاوانباران و داگیرکەران و، نەخوێندەواری و هەژاری لەناویاناهەڵگرن. مەبەست ئەو کەسانە نین نامەی زۆر بخوێنن و فێری جۆرەها زانست و زانیاری بن و، هێزی سروشت بخەنە کار و ئەقڵی ئەلەکترۆنی و کۆمپیوتر و چەکی کۆمەڵ کوژ دروست بکەن و، گازی کیمیاوی برێژن بەسەر بێ تاوانانا.

﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ﴾ تۆ بڵێ: ئەی ئەو بەندانەی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە لە پەروەردگاری خۆتان بترسن و خۆتان لەبێ فەرمانی خوا بپارێزن. نیشانەی باوەڕدار ئەوەیە لە خوابترسن، بۆ کەسانێکی ئەوتۆ هەیە لەم جیهانەدا چاکە بکەن پاداشتێکی زۆر و گەورە لە ڕۆژی دواییدا و ئەچێتە ناو بەهەشت.

﴿ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ وە زەوی خوا فراوانە. کەواتە ئەگەر بۆ ئێوە ئاسان نەبو لە جێگەیە خوا پەرستی بکەن، ئێوە کۆچ بکەن بۆ جێگەی تر بتوانن خوا پەرستی بکەن؛ لەبەر ئەوەی سوودی هەردوو جیهان پەرە بسێنێ، ئەگەر جێگەکانی تریش وێنەی نیشتمانی خۆتانبو، پێویستە تواناى خنۆتان بخەنە کار بۆ پاراستنی بیروباوەڕی خۆتان بەهەر جۆرێ بێ و بەرگری لە خراپە بکەن، ڕەوشتی بەرز بکەن بە چەکی خۆتان، پەنا مەبەن بۆلای کوشتن و دەست درێژی بۆ سەر دانیشتوان و، ستەم بەکاربهێنن و گوند و شارەکان بروخێنن. ئارام گرتن چاکترین چەکە، بە ڕاستی بەبێ ژمارە بە تەواوی پاداشت ئەدرێ بەو کەسانە ئارام ئەگرن لەسەر ئازار و ئاینی خۆیان ئەپارێزن.

﴿ قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی من فەرمانم پێدراوە کە خوا بەتەنها بپەرستم بە نیازی پاکەوە ئایین هەر بۆ خوا بەکار ئەهێنم و، دووربێ لە هاوبەشدانان بۆ خوا و دوو ڕوویی تێدا نەبێ.

﴿ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ وە من فەرمانم پێدراوە؛ بۆ ئەوەی یەکەمین کەس بم موسڵمان ببم لەناو ئوممەتی خۆمدا و، نیازپاکترین موسڵمان بم، مل کەچی فەرمانی خوا بم لە هەردوو جیهاندا.

﴿ قُلْ إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی من ئەترسم لە سزایەکی زۆر گەورە ئەگەر من بێفەرمانی پەروەردگاری خۆم بکەن. ئیتر ئێوە چۆن داوا ئەکەن لە من هاوبەشیتان بکەم لە بت پەرستندا و، واز لە خواپەرستی بهێنم؟

﴿ قُلِ اللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَهُ دِينِي فَاعْبُدُوا مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِ ﴾ تۆ بڵێ دووبارە بە بت پەرستان: من هەر بەتەنها خوا ئەپەرستم، بە نیازی پاکەوە بەبێ هاوبەشدانان و دووڕوویی، ئایین پەرستنم هەر بۆ خوایە، دوایی ئێوەی بت پەرست هەر شتێ ئارەزۆتان لە جگەی خوا بپەرستن، هەر خۆتان توشی سزا ئەبن.

﴿ قُلْ إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی ئەو کەسانەی توشی زیان ئەبن ئەو کەسانەی ئەوتۆن زیانیان لە خۆیانداوە بە چونیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ و، زیانیان لە خێزانەکانی خۆیانداوە و، لە ڕێگەی ڕاست لایان داون و، هەموویان توشی زیان ئەبن لە ڕۆژی دواییدا. ئێوە ئاگاداربن: ئەو زیانە زیانێکی ئاشکرایە بۆ بێباوەڕان.

﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ﴾ بۆ ئەو زیانۆمەندانە هەیە چەند چینێ لە ئاگربوە بە سێبەر و سەرەخەر لە ژوریانەوە و، لە ژێریشیانە تاقمێ تر لە ئاگر بوە بە ژێرە خەریان.

﴿ ذَلِكَ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهِ عِبَادَهُ يَا عِبَادِ فَاتَّقُونِ ﴾ ئەو شێوە ئاگرەی باسکرا خوا بەندەکانی خۆی بەو ئاگرە ئەترسێنێ ئەی بەندەکانی ئێمە: ئێوە لە خوابترسن و خۆتان لەو سزا گەورەیە بپارێزن.

وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي النَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَعْدَ اللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٢١﴾

﴿ وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَى فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ خۆیانیان دورخستوەتەوە لە بتەکان کە ئەوان بیانپەرستن و، گەڕاونەتەوە بۆلای خوا، بۆ ئەو کەسانە هەیە موژدەیەکی زۆر خۆش لە لایەن فریشتەکانەوە بە پاداشتی خوای مەزن بۆیان، دوایی تۆ موژدە بدە بە بەندەکانی من.

﴿ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ گوێ لە فەرمودەی قورئان ئەگرن و لەمەبەستەکەی ئەگەن و، دوایی ئەو کەسانە پەیڕەوی ئەوەیان ئەکەن چاکترە و پاداشتی زۆرترە و سود بەخشترە بۆ هەردوو جیهان.

بۆ نمونە: خوا فەرمانی داوە بەکردنی نوێژ بە چوار ڕکات و، بەکورت کردنەوەی لە کارواندا و، هەردووکیان چاکن. بەلاّم کورتکردنەوەی چاکترە و، ئەگەر ستەمی لیّ کردی ئەتوانی تۆڵەی لیّ بکەیتەوە. بەلاّم لێیبوری چاکترە. هەروەرها گفتوگۆی ئادەمیزادیش ببیسە و، کامیان چاکتر و خاوەن سودتربو ، ئەوەیان بکە، فەرمودەی خوا هەمووی چاکە، هەرکەسێ بیلێ، با وەکو کەسێکی خراپیش بێ.

﴿ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾ ئەو کەسانەی دوای چاکترین فەرمودەی خوا ئەکەون کەسانێکی ئەوتۆن خوا ڕانمویی کردوون بۆلای ڕێگەی ڕاستی ئایین و، ئەو کەسانە ئەوانەن خاوەنی ئەقڵن و چاك و چاکتر لە یەك جوێ ئەکەنەوە.

﴿ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي النَّارِ ﴾ ئایا دوایی کەسێ خوا پێویستی کردبێ فەرمودەی سزادانی خۆی لەسەری، وێنەی کەسێکە خوا موژدەی دابێ بە ڕزگارکردنی. بێگومان وێنەی یەك نین. ئایا دوایی تۆ ڕزگار ئەکەی کەسێ لەناو ئاگری دۆزەخدایە بەهۆی بێباوەڕیەوە، خوا ئەقڵی پێداوە، بێگومان تۆ ناتوانی ڕزگاری بکەی، چونکە ڕزگاربوون بەهۆی باوەڕەوە ئەبێ.

﴿ لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ ﴾ بەلاّم کەسانێکی ئەوتۆ لە خوا ترساون و خۆیانیان پاراستوە لە بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆیان، بۆ ئەو کەسانە هەیە لە بەهەشتا چەندین کۆشکی بەرز لەسەر ئەو کۆشکانەوە چەندین کۆشکی تری بەرز دروست کراون، ئەڕوا بە ژێریانا و بەم لاولایاندا چەندین ڕوباری ئاوی شیرین و پاك و بەتام، ئەوانەیش بەلێنێکە خوای مەزن داوییە بەوان، خوا پێچەوانەی بەلێنی خۆی ناکا و، بۆیان ساختە ئەهێنێ و ئەیانداتێ.

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە بەڕاستی خوا ناردویەتیە خوارەوە لە هەوری ئاسمانەوە ئاوێ، زەوی ئەو ئاوە ئەمژێ و ئەچێتە ناوی و، دروستی کردوە لەناو زەویدا.

﴿ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾ لە پاشا خوا دەرئەهێنێ بەهۆی ئەو ئاوەوّ ڕووەکێ، ڕەنگەکانیان جیاوازە:

هەیانە سەوزە، هەیانە سورە. هەیانە زەردە، هەیانە سپیە. قەوارە و، بەروبومیشیان جیاوازە. لە پاشا ئەو ڕووەکە ووشك ئەبێ و، دوایی تۆ ئەو ڕووەکە ئەبینی زەرد هەڵئەگەرێ، لە پاشا ئەشکێ بەیەکا و ورد ئەبێ، بەڕاستی لە بارینی باران و دروستبونی ڕووەك، گۆڕانی بەو جۆرە ئامۆژگاری و تەمێ کردن، بۆ ئەو کەسانە خاوەنی ئەقڵن و بیر لە توانای خوا ئەکەنەوە.

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾

﴿ أفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَى نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ﴾ ئایا کەسێ خوا دڵی فراوان کردبێ بۆ وەرگرتنی ئیسلام، دوایی ئەو کەسە لەسەر بڕوایەکی بێگومانبێ لە لایەن پەروەردگاری خۆیەوە و، ڕانومویی وەرگرتبێ بۆلای باوەڕهێنان و، ڕێزداربێ لای ئەو، وەك عەماری کوڕی یاسر، وێنەی کەسێکە دڵی ڕەقبێ و هیچ چاکەیە وەرنەگرێ وەك ئەبوجەهل، بێگومان وێنەی یەك نین.

﴿ فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ ﴾ دوایی سزای زۆر سەخت بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە دڵیان لە ئاستی قورئانی خوادا ڕەق و ووشکە و، ڕێگەی ڕاست وەرناگرن لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگانەدا، ئەو کەسانە لە ناو گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادان، پێویستیان بەبیرکردنەوە نیە، ئەوندە گومڕان.

﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا مَّثَانِيَ ﴾ خوا ناردویەتیەوە خوارەوە شیرینترین گفتوگۆ لەبارەی یاسا و بیروباوەڕەوە، هەمو کارێکی لە جێگەی شیاوی خۆیا داناوە، ئەو گفتوگۆیە نامەیەکە هەموو ناوەرۆکەکەی وێنەی یەکن و دژایەتی لەناو ماناکانیا نییە، هەموویان لەسەر یەك جۆرن لە ماناو پەك خستنی بێباوەڕان، ئامۆژگارییەکانیان و باسەکانی تەمێ‌کردنی ئادەمیزاد هەموو کاتێ دوویات ئەکرێنەوە لەسەر زمان، بەبێ ئەوەی ماندوبوونی تێدابێ، باسی بەهەشتی کرد، باسی دۆزەخیش ئەکا، هەروەها بەوجۆرە.

﴿ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ﴾ پێستی ئەو کەسانە لەپەروەردگاری خۆیان ئەترسن لە کاتی خوێندنی ئایەتەکانی موژدەدان و هەڕەشەکردن و بیستنیانا ئەکەونە لەرزین و لە پەروەردگاری خۆیان ئەترسن و بیر لە توانای خوا ئەکەونەوە.

﴿ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ﴾ لە پاشا دەروونیان ئارام ئەگرێ و، پیس و شاراوەی دڵیان گەش ئەبێتەوە لە کاتی خوێندنی ئایەتەکانی لێ‌خۆشبوونی قورئانی خوادا و لە کاتی بیستنیانا.

﴿ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ ئەو قورئانە سەرچاوەی شارەزاکردنی خوایە. ڕێگەی ڕاست نیشان ئەدا بەهەرکەسێ ئارەزوی بو بەهۆی ئەو قورئانەوە و، هەرکەسێ خوا لای بدا لە ڕێگەی ڕاست، دوایی هیچ کەسێ نیە شارەزایی ئەو کەسە بکا، چونکە خوا ئەقڵی پێداوە بەسەربەستی خۆی ڕێگەی چەوتی بۆ خۆی هەڵبژاردوە.

﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ ئایا دوایی هەرکەسێ خۆی بپارێزێ لەسەختی سزا و لە گەرمای زۆری ئاگری دۆزەخ بەهۆی ڕومەتییەوە لە ڕۆژی دواییدا. نەك بەدەست و قاچی، چونکە ئەوان بەسراونەتەوە بە ملیانا. وێنەی کەسێکە بە ئاسوودەیی دانیشێ و چاکەی کردبێ و، بۆ بێتە هۆی ڕزگاربوونی سزا لە ڕۆژی دواییدا. بێگومان وێنەی یەك نین.

﴿ وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ و بە ستەمکاران ئەبێژرێ لە لایەن فریشتەکانەوە لە ڕۆژی دواییدا: ئێوە بچێژن سزای شتێ ئێوە کردووتانە لە جیهاندا.

كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا

غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾

﴿ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش بتپەرستانی مەکەوە بوون پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ خستوەتەوە، دوایی سزای سەخت چو بۆلای ئەوان لە لایەکەوە ئەوان هەستی پێ نەکەن و، بەبێ ترس دانیشتبوون.

﴿ فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ دوایی کاتێ خوا چێشتی بەوان ڕسوایی لە جیهاندا وەك کوشتن و ڕۆچوونی زەوی و، بەڕاستی سزای ڕۆژی دوایی زۆر گەورەترە ئەگەر بیانزانیایەتوشیان ئەبێ و گەورەترە باوەڕیان ئەهێنا لە جیهاندا.

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە لەو قورئانەدا ڕوونمان کردوەتەوە بۆ ئادەمیزاد هەموو وێنەیە و هەموو شتێ پێویستیان پێی هەبێ لە فەرمانەکانیدا و، لە کاروباری جیهانیان، ئاگاداریشمان کردوون لە بەسەرهاتی گەلانی پێشو کە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆئەخستەوە؛ لەبەر ئەوەی ئامۆژگاری وەربگرن و باوەڕ بهێنن.

﴿ قُرآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ ئەو قورئانە ئێمە ناردوومانە قورئانێکە هەمووی بە زمانی عەرەبی پاراوە قورئانێکە مرۆڤایەتی و ئایینیشە، بۆ کات و جێگەیە نیە، بۆ هەمو کات و جێگەیەکە، دوورە لە ڕەگەزپەرستی و چینایەتی و، خوار و پەنهانی تێدا نیە و، ماناکانی دژی یەکتری نین: لەبەر ئەوەی لە خوابترسن و لە بێ فەرمانی خوا خۆیان بپارێزن.

بۆ ئاگاداری: ئایا دروستە قورئان بگۆڕێ بۆلای زمانێ جگەی عەرەبی، ئایا دوای گۆڕینی وەك قورئان تەماشای ئەو گۆڕراوە ئەکرێ و نابێ بەبێ دەست نوێژەوە دەستی لێ بدرێ پانە؟

بێگومان قورئان هەرچەندە بە زمانی عەرەبی هاتوەتە خوارەوە. بەڵام بۆ سوودی مرۆڤایەتی هاتوەتە خوارەوە، لەبارەی ئایین یاسا و بیروباوەڕ ژیانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد، بۆ تەنها نەتەوەیە نەهاتوەتە خوارەوە، دورە لە ڕەگەزایەتی، چونکە قورئان پەیامی خوایە بۆلای هەموو ئادەمیزاد و، گۆڕانیشی کارێکی سەرەکی‌یە بۆ بلاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام. زۆر کەس بەبۆنەی گۆڕینی قورئانەوە موسڵمان بوون، ئەوەی شایانی باسبێ قورئان گۆڕاوە بۆلای (٢٧) زمان. دوای گۆڕینی دروستە بەبێ دەست نوێژەوە دەستی لێ بدرێ، چونکە ئەو گۆڕاوە ڕاستەوخۆ قورئان نیە. بەڵکو مانای قورئانە. ئەو گۆڕراوە بەوێنەی قورئان پەکی زمانی بێباوەڕان ناخا و ئەتوانن وێنەی گۆڕاوەکە دابنێن.

﴿ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَاء مُتَشَاكِسُونَ ﴾ خوا ڕوونی کردوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی بت پەرستبوو باوەڕداران. وێنەی پیاوێ، چەند کەسێ هاوبەشبن لەو پیاوەدا، ئەو پیاوە بەندەی ئەوان بێ، ئەو کەسانە لەناوخۆیانا بێ ئاژاوە و ناکۆکیان: هەر یەکەیان داوای ئەوە بکا ئەو پیاوە بەندەی ئەوە و، هەوڵی ئەوە ئەدا بە تایبەتی بۆخۆی بێ، نەك بۆ ئەوانی تر، ئەو ئاژاوەیە ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەو پیاوە لە دەست هەموویان دەربچێ و، ئەوان سوود لە پیاوە وەرنەگرن و، نە ئەویش سود لەوانیش وەرئەگرێ.

﴿ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ﴾ وە بە پیاوێکی باوەڕدار و بەندەی یەك گەورە بێ و یەك خوای هەبێ و، کەسی تر لەو پیاوەدا هاوبەشی ئەو گەورە نەبێ، خۆی هەر بە بچوکی ئەو کەسە دابنێ، ئایا ئەو دوو پیاوانە وێنەی یەکن لە نموونەدا و لەبەسەرهاتا. بێگومان وێنەی یەك نین.

یانێ بت پەرستان چەند خوایەکیان هەیە و، داوای یارمەتی لەو بتانە ئەکەن، ئەگەر بڕیار بدەین ئەو خوایانە درەخت و بەرد نەبن. بەڵکو خاوەنی هەست و هۆشبن، بێگومان زۆرجاران لەسەر یەك شت پێك نایەن و، هەرەیەکەیان داوای شتێکی جیاواز ئەکا لەوەی تریان ، ئەو دوو شتە جیاوازانە ناگونجێ هەردووکیان جێبەجێبکرێن. کەواتە بەسەرگەردانی ئەسوڕێنەوە و، نازانن کامیان بکەن. بەڵام باوەڕداران یەك خوایان هەیە و، خوایش هەر داوای یەك شتیان لێ ئەکا و، بە ئاسانی و بەبێ سەرگەردانی ئەتوانن فەرمانەکەی جێبەجێ بکەن؛ بۆیە باوەڕدارن ئەڵێن:

﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ هەمو سوپاس و ستایشێ هەر بۆ خوایە و، هاوبەشی نیە، هەر ئەو خاوەنی هەموو چاکەیەکە و، هەموو شتێکی بۆ ئادەمیزاد ڕوون کردوەتەوە. بەڵام زۆرترین لە ئادەمیزاد لەبەر نەزانینی خۆیان نازانن هەر خواشایستەی پەرستنە.

﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ بەڕاستی تۆ ئەمری ئەوانیش ئەمرن، چونکە مردن بەشی هەمو گیاندارانە بەبێجیاوازی لە نێوان پێغەمەران. بەڵام تۆی پێغەمەر کە مردی، بەسەر بەرزی ئەمری و جێگەت بەهەشتە و، ناوت بە چاکە باس ئەکرێ لە هەردوو جیهاندا. بەڵام بت پەرستان لەهەردوو جیهاندا ڕسواو بێنرخن و، جێگەیان دۆزەخە و، ناویان بەستەمکار ئەبرێ لە هەردوو جیهاندا.

﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ لە پاشا بەڕاستی ئێوە لە ڕۆژی دواییدا لە لای پەروەردگاری خۆتانا ئەکەونە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری و، باوەڕدار و بێباوەڕ کۆ ئەبنەوە لە خزمەت خوادا. تۆ شایەتی ئەدەی لەسەر بێباوەڕان کە فەرمانی خوات بەوان ڕاگەیاندووە. چاك و خراپ و باوەڕدار و بێباوەڕ جوێ ئەبنەوە.

**بە یاریدەی خوا کۆتایی بە نووسینی ئەم جزمە هات لە ٢٠٠٠/٧/٤ی زایینی بەرانبەر بە (٣)ی ڕەبیعی دووهەم ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی**

## پێڕست

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هاوێنە | هاو وێنە | ٤ | ٢٦ | ئێو | ئێوە | ١٠٠ | ٢٢ |
| بێگرێ | بگیرێن | ٥ | ١٥ | ڕابیست | ڕاست | ١٠١ | ١٤ |
| باوەشان | باوەڕان | ٧ | ٨ | سوە | سودە | ١٠١ | ١٦ |
| بە کوڕی | زیادەیە | ٩ | ١٢ | دوژمنایەو | دوژمنایەتی و | ١٠٥ | ٩ |
| ئەوتوی بۆ | ئەوتۆ | ٩ | ١٦ | بۆ | بو | ١٢١ | ٢٤ |
| توی | قورئانی | ٩ | ١٧ | کوڕشی | کوڕی | ١٢٢ | ٣ |
| پەروەردگاری | پەروەردگاری تۆ | ٩ | ١٦ | بە ئەوان | ئەوان | ١٢٥ | ١٦ |
| بە فەرمان | فەرمان | ٩ | ١٧ | خەنەتیمان | خەنەقدال | ١٢٦ | ١٣ |
| نایەبێ | نابێ | ٩ | ٢٤ | هاوکاری | زیادەیە | ١٢٦ | ١٣ |
| ئەو ئە | ئە | ٩ | ٢٤ | خەنەتەوە | خەنەقەوە | ١٢٦ | ١٨ |
| باراز | بەڕار | ١٠ | ٢٨ | جوبەی | خوبەی | ١٢٧ | ١١ |
| ئەخوڕی | ئەخوڕری | ١١ | ١٤ | ئەوتالیب | کوڕی ئەبو تالیب | ١٢٧ | ٢٦ |
| ئەوان | ئەوەی | ١٢ | ١٣ | هەچەندە | هەرچەندە | ١٢٩ | ٨ |
| وشزگاریان | ڕزگاریان | ١٧ | ٨ | دوای | دوایی | ١٣٤ | ١٢ |
| ئەدان | ئەوان و | ١٨ | ١٩ | الأخراب | الأحزاب | ١٣٤ | ١٨ |
| فرە | فرەی | ١٩ | ١٣ | لەناودا | لەناودا دانا | ١٣٧ | ١٠ |
| لەبە | لە | ٢٤ | ١٥ | التقفية | النثنية | ١٣٨ | ٢٠ |
| و جولا | جولا | ٢٥ | ٢٣ | ڕێژەی | ژێر | ١٣٨ | ٢٣ |
| مویا | موسا | ٢٧ | ١٩ | خوای | خوا | ١٣٨ | ٢٤ |
| غیرعەون | فیرعەون | ٣٣ | ١٠ | ئەدایە | ئەدایەوە | ١٤٣ | ١٢ |
| خوشی | خۆشبێ | ٣٤ | ١٣ | بێزارو | بێزراو | ١٤٣ | ٢٤ |
| بە ئێمە | بە ئێوە | ٣٨ | ٢٠ | دوای | دوایی | ١٤٤ | ٢١ |
| چاکەیەی | چاکەی | ٣٩ | ٢٤ | بارەی | خوا مارەی | ١٤٤ | ٢٥ |
| بدرێ | دێ | ٤٠ | ٢٣ | نادەی | ئادەی | ١٥٦ | ٩ |
| هاتوە | نەهاتوە | ٤٢ | ٢٠ | سودەکە | سودە | ١٦٢ | ٨ |
| ڕەوانی | ڕەوابێ | ٤٣ | ١٧ | ئازاییان | ئازاریان | ١٦٧ | ١٣ |
| بەر | بە | ٥٠ | ١٧ | لەخۆی | لە خویەو | ١٧١ | ٧ |
| بنەوموێ | بفەرموێ | ٥٠ | ٢٧ | دانەوێڵە دانەوێڵە | لە تۆوی دانەوێڵەو | ١٧٣ | ٨ |
| بەبێ | زیادەیە | ٧٦ | ١٧ | بوخاتە | بوختانە | ١٧٤ | ٢١ |
| هەوڵیان | هەواڵیان | ٧٩ | ٢٧ | پیاوێکی پیاوێکی | پیاوێکی | ١٧٦ | ٦ |
| هەورا | هەور | ٨٥ | ١٥ | دولیی | دوایی | ١٧٧ | ١٧ |
| جا | جار | ٨٦ | ١١ | قەحنات | قەحتان | ١٧٨ | ١٣ |
| ڕاموی | ڕاغویی | ٨٧ | ١٥ | ئێوی | ئێوەی | ١٨٧ | ١١ |
| بی ختیار | بەختیار | ٨٨ | ٨ | (الملائکە) | الملائکة | ١٩٣ | ٧ |
| قەدغە | قەدەغەی | ٩٢ | ١ | تغرنکم | تفرنکم | ١٩٥ | ٧ |
| ڕۆژەی | ڕۆژەکەی | ٩٢ | ١٤ | یغرنکم | یفرنکم | ١٩٥ | |
| نیە | یە | ٩٦ | ١٤ | بزانری | بزانێ | ١٩٥ | ٢٢ |
| پلەیە لە | پلە بە پلە | ٩٦ | ١٤ | فاحینا | فاحیینا | ١٩٦ | ١٣ |
| ئەکرێ | ئەکا | ٩٩ | ١٤ | ویوحی اللیل | ویولج االلیل | ١٩٨ | ٢٣ |
| هەیەر | حیرە | ٩٩ | ٢١ | ویوحی النهار | ویولج النهار | ١٩٨ | ٢٣ |

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| (تذكي) | تزكي | ٢٠٠ | ١٧ |
| الضلمات | الظلمات | ٢٠١ | ١٠ |
| ببیسی | ببیسێنێ | ٢٠١ | ٢١ |
| ئەوتەی | ئەوەی | ٢٠٥ | ٢ |
| ئاازری | ئازاری | ٢٠٥ | ٥ |
| (الأخسارا) | (الأمقتا) | ٢٠٦ | ٢٠ |
| شتی | شتێ | ٢٠٧ | ١٨ |
| (ومكر السيىء) | (ومكر السيء) | ٢٠٨ | ١١ |
| حەبیس | حەبیش | ٢١٢ | ٢٥ |
| بەندکردنیان | بەندیان کردن | ٢١٤ | ١٦ |
| ئەگە | ئەگەر | ٢١٨ | ١٩ |
| داویی | دوای | ٢٢٣ | ١٢ |
| (حقا) | (حیّا) | ٢٢٥ | ٢٧ |
| (أو إذا) | (وإذا) | ٢٣٢ | ١٢ |
| داوایان | دوای | ٢٣٣ | ٦ |
| (ففعل) | (نفعل) | ٢٣٤ | ١٩ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| (ئارا) | ئارام | ٢٤٣ | ٢٣ |
| منا | متعا | ٢٤٦ | ٥ |
| بێ پیاد | بە پیاو | ٢٤٧ | ٦ |
| خواو | خوا | ٢٥٠ | ١٧ |
| ذکریة | ذکرا | ٢٥١ | ١٢ |
| ئایەنتلەو | ئایەت لەو | ٢٥٣ | ١٨ |
| مانی | مانای | ٢٥٣ | ٢١ |
| سەمسور | سەر | ٢٥٤ | ١٤ |
| بەڕەا | بەڕەوا | ٢٥٨ | ٨ |
| بەشی | بە بەشی | ٢٥٩ | ٤ |
| بۆنا | بۆتان | ٢٦٠ | ٣ |
| دامان | دامان نا | ٢٦٣ | ٧ |
| بەهارد | بەهار | ٢٧٥ | ٢٠ |
| خەنۆتان | خۆتان | ٢٧٨ | ١٩ |
| بکەن | بکەم | ٢٧٨ | ٣١ |
| | | | |